5

زنجیره دەرسی

# ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی

## لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا

چاپی دووەم

✸ ئیمان بە: ✸

ڕۆژی دوایی

قەزاو قەدەر



التفسیر

عەلی باپیر

زنجیـــرە دەرسی

# ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی
# لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا

## ( 41 ـ 42 ـ 43 ـ 44 ـ 45 )

بەرگی پێنجەم

**ئیمـــان بە:**

**ڕۆژی دوایـی**

**قـەزاو قـەدەر**

عەلـی باپیـر




بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

ناوی کتێب: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا - بەرگی پێنجەم
نوسەر: عەلی باپیر
بلاوکردەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بلاوکردنەوە و ڕاگەیاندن/ هەولێر
خەت: نەوزاد کۆیی
بەرگ: أمین مخلص
نەخشەسازی ناوەوە: عزالدین محمد
نۆرەو ساڵی چاپ: یەکەم 1429ك – 2008ز
تیراژ: 1500 دانە

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (468) ی ساڵی 2006 دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بلاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر– شەقامی دادگا – ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل: ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

چاپکردنی ئەم شێوەی کتێبە کاتی بە نۆبە بە گوێرەی

توانا و هەلومەرجی ئەو ڕۆژگارە بوو .

وە لەمێژ بوو هیوام وابوو شێوە چاپکردنێکی

وای بۆ بڕەخسێ کە مایەی بەهرە لێوەرگرتنی زیاتری

خوێنەران بێ . جا ئێستا سوپاسی خوای بەخشەر

دەکەم کە نووسینگەی تەفسیر بەو کارە هەڵدەستێ.

خوا بەرەکەتی بخاتە ئیش و کاریانەوە و لە کۆمەکیان

بێت ، منیش سوپاسیان دەکەم .

علی باپیر

بسم الله الرحمن الرحیم

الحمد لله والصلاة والسلام علی رسول الله محمد وصحبه وآله

بەندە ( عەلی باپیر ) ڕێگە بە مامۆستا مخلص و

نووسینگەی تەفسیرم تەخویل کرد بۆ چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانم ، خوا پاداشتیان و خێری زیاتر

بداتە ئیشی و کاریانەوە .

وە جگە لەوان هیچ کەسێکی دیکە مافی چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی بەندەی نیە .

ع

عەلی باپیر

١١ ربیع الثانی ١٤٢٦

٢٠٠٥/٥/١٩

[illegible]

بسم الله الرَّحمن الرَّحيم

❁ ﴿ لَّيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَـكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْمَلآئِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّآئِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُواْ وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاء والضَّرَّاء وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَـئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَـئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ﴾ (البقرة ـ 177).

❁ ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾ (القمر ـ 49).

# پێشکەش بێ:

1) بەوانەی بڕوایەکی پتەویان بە ڕۆژی دوایی هەیەو دەزانن کە ژیانی دنیا تەنیا قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیانی ئینسانو هۆڵی تیدا تاقیکرانەوەو پردی بەسەر ڕەتبوونەو دوارۆژیش شوێنی ئەنجام وەرگرتنەوەو مەنزڵگای کۆتاییو تێدا نیشتەجێ بوونە.

2) بەوانەی بە دڵنیاییەوە دەزانن کە خوای کاربەجێ عزّوجلّ لە ئەزەلەوە نەخشەی تێکڕای دروستکراوەکانی خۆی کێ شاوەو هەموو شتێکی ئەندازەگیریی کردوەو هیچ وردو درشتێکیش لە جوغزی زانیاریو ڕکێفی ویستو توانای بێسنووری بەدەر نیە.

# پێشەكی

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على رسوله الأمين محمد وآله المهتدين بهديه المبين أجمعين.

خوێنەری بەڕێزو سەنگین!

وەك پێیشتریش باسمان كرد ئیمان بە ڕۆژی دوایی (الأيمان باليوم الآخر) یەكێكە لە پێنج پایە گەورەو گرنگەكانی ئیمانو عەقیدەی ئیسلامی، كە: لە ئایەتەكانی ژمارە (177)ی (البقرة)و (136)ی (النساء)دا خراونەڕوو، وە دەشتوانین بڵێین: ئیمان بە ڕۆژی دوایی یەكێكە لە شەش پایەو بنەڕەتەكانی ئیمان وەك لە فەرمایشتەكەی (جبريل)دا خراوەتەڕوو كە پێشتر چەند جارێك ئاماژەمان پێكردو (بخاریو مسلم) گێڕاویانەتەوە.

شایەنی باسیشە كە ئیمان بەڕۆژی دوایی، كە ڕۆژی سزاو پاداشتو نیشتەجێبوونی یەكجارییە لە هەردووك مەنزڵگای هەمیشەیی بەهەشتو دۆزەخدا، لە ڕووی گرنگیو بایەخەوە دووەمین پایەیەو یەك سەر لە دوای ئیمان بە خواوە دێ، بەڵگەش لەوبارەوە زۆرن یەكیان ئەوەیە كە لە قورئانێداو لە سوننەتی پێغەمبەری خواشدا ﷺ دەیان جار ئیمان بەخوا عزّوجلّو ئیمان بە ڕۆژیی دوایی (الأيمان بالله و الأيمان باليوم الآخر) پێكەوە

باسکراون‌و بێجگە لە ئیمان بە ڕۆژی دوایی هیچ کام لەپایەو بنەڕەتەکانی دیکەی ئیمان ئەو حاڵەتەیان نیە! بۆ نموونە:

**1- ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللهِ مَنْ آمَنَ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَأَقَامَ الصَّلاَةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلاَّ اللهَ فَعَسَى أُوْلَئِكَ أَنْ يَكُونُوا مِنْ الْمُهْتَدِينَ﴾(التوبة - 18).**

**2- ﴿وَمَاذَا عَلَيْهِمْ لَوْ آمَنُوا بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَأَنفَقُوا مِمَّا رَزَقَهُمْ اللهُ وَكَانَ اللهُ بِهِمْ عَلِيمًا﴾ (النساء - 38).**

**3- ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمْ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَنْ يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا تَرَاضَوْا بَيْنَهُمْ بِالْمَعْرُوفِ ذَلِكَ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ مِنْكُمْ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكُمْ أَزْكَى لَكُمْ وَأَطْهَرُ وَاللهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ (البقرة - 232).**

**4- ﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَى عَدْلٍ مِنكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ذَلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَمَنْ يَتَّقِ اللهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا﴾(الطلاق - 2).**

**5 - ((من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليكرم ضَيْفَه. . . )) متفق عليه.**

**6- ((من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فَليقلْ خيراً أو لِيَصمُت)) متفق عليه.**

دیارە وشەو ڕستەکانی قورئانیش کە بە پێی زانیاری‌و حیکمەتی بێ‌سنووری خوا عزّوجلّ دانراون بە گۆترەو بێ‌حیکمەت دانەنراون‌و ئەو ڕێژە زۆرەی باسکرانی ڕۆژی دوایی‌و دووبارە کرانەوەی، بەڵگەو نیشانەی گرنگی‌و بایەخیانەو پاش خوێندنەوەی ئەو باس‌و بابەتانەی کە لەم کتێبەشدا لەبارەی ڕۆژی دواییەوە خراونەتەڕوو ئەو ڕاستییە چاکترو زیاتر دەدرەوشێتەوە.

هەروەها ئیمان بە قەدەر (الأيمان بالقدر) (یان قەزاو قەدەر)یش بەهەمان شێوە یەکێکە لە پایەو بنەڕەتە پێکهێنەرەکانی ئیمانو عەقیدەی ئیسلامی وەك لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتوە کە بە (حديث جبريل) ناسراوەو فەرموویەتی: (. . **وأن تؤمن بالقدر خيره و شرّه).**

جا هەرچەندە ئیمان بە قەدەر لەڕیزی پایەکانی ئیماندا لە قورئاندا باسنەکراوە، بەڵام لە فەرمایشەکانی پێغەمبەری خوادا ﷺ باسکراوە، لە زۆر جێگای قورئانیشدا خوای بەرزو مەزن ئەو ڕاستییەی خستۆتە ڕوو کە هەموو شتێکی ئەندازەگیریی کردوەو بەپێی قەدەری خوا بەڕێوە دەچێ. بۆ نموونە:

1- **﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾** (القمر- 49).

2- **﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا﴾** (الفرقان - 2).

3- **﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى ۞ الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى ۞ وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَى﴾** (الأعلى: 1-3).

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی:

4- **((كل شيء بقدر حتى العَجزُ والكَيّسُ))** (رواه مسلم وأحمد عن ابن عمر -رضي الله عنهما-).

شایەنی باسیشە کە ئیمان بە قەدەری خوا سبحانەوتعالی دەکەوێتەوە نێو ئیمان بە خوا چونکە وەك دواتر باسی دەکەین ئیمان بە قەدەر بریتییە لە ئیمان بە زانیاریو ویستو تواناو حیکمەتی بێسنوری خوا -عزّوجلّ-. واتە ئیمان بە قەزاو قەدەر هەر بریتیە لە ئیمان بە سیفەتو ناوەکانی خوا، پێموایە هەر بۆیەش ئیمان بە قەدەر لە قورئانیدا لە ڕیزی پایەکانی دیکەی ئیماندا نەهاتوە.

# ڕێ خۆشــــکردن

خوێنەری بەڕێز!

ئەم بەرگی پێنجەمە لە دوو بەندان پێك هاتوە:

بەندی یەکەم: (ئیمان بە ڕۆژی دوایی) کە لە پێنج دەرسی زنجیرە دەرسی: (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامی)و چەند باسو بابەتێکی کتێبی (مسوڵمانی کامڵ- بیروباوەڕی مسوڵمان) پێك هاتوەو دابەشبووە بۆ حەوت خاڵی سەرەکی.

بەندی دووەم: (ئیمان بە قەزاو قەدەر) کە لە دەرسێکی زنجیرە دەرسی: ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیو چەند کورتە باسێکی کتێبی (مسوڵمانی کامڵ) کە لەبارەی قەزاو قەدەرەوە نووسراون، پێك هاتوە.

شایەنی باسیشە کە بەم بەرگی پێنجەمە کۆتایی بە توێژینەوەمان دەربارەی پایەکانی ئیمان، دێنین، بەڵام وەك لە بەرگەکانی دیکەشدا ئاماژەمان پێدا لێرەشدا بە پێویستی دەزانم دووپاتی بکەمەوە کە ئێمە لە کتێبی (ئیسلام وەك لە کتێبی خوادا دەدرەوشێتەوە)، (الأسلام كما يتجلّى في كتاب الله)دا خەستو خۆڵتر و تێرو تەسەلتر لێرە لەبارەی پایەکانی ئیمانەوە دواوین، بە تایبەتی پایەی: (ئیمان بە ڕۆژی دوایی)و ئەگەر لێرە وەك ئاماژە پێکردن باسی بەهەشتو دۆزەخمان کردوە، لەوێ پانتاییەکی باشمان بۆ ئەو بابەتە تەرخان کردوە.

بۆیە لێرەش بەکورتی باسی نێوەڕۆکی ئەو دوو بەندەم کرد کە ئەم بەرگەیان لێ پێکدێ، چونکە دوایی لە پێشدەستی پێناسەی هەر کامێکیاندا قسەیان لەبارەوە دەکەین.

# ئەم بەنـــدە

ئەم بەندە لە چەند باس‌و بابەتێك پێك هاتوە كە ئەمە ناوونیشانەكانیانە[1]:

یەكەم: چەند كورتە باسێك دەربارەی ڕۆژی دوایی.
دووەم: ئەنجام‌و بەرهەمی بڕوا بوون بە ڕۆژی دوایی.
سـێیەم: بەڵگەو ئیسپاتی هاتنی ڕۆژی دوایی.
چوارەم: پێشەكییە تایبەتییەكانی ڕۆژی دوایی.
پێنجەم: نیشانە نزیكەكانی هاتنی ڕۆژی دوایی.
شەشەم: نیشانە دوورەكانی هاتنی ڕۆژی دوایی.
حەوتەم: كارەسات‌و ڕووداو‌و ئەنجامەكانی ڕۆژی دوایی.

شایەنی گوتنیشەكە هەر كام لەم حەوت خاڵە سەرەكییە لە چەند بڕگەیەك پێكدێن كە لە دەستپێكی خستنەڕووی هەركامێكیاندا بۆ بەرچاو ڕوونی زیاتر ئاماژەیان پێدەكەین.

---

1) شایانی باسە خاڵی یەكەم ( چەند كورتە باسێك... ) بێجگە لە كورتە باسی یەكەم‌و دووەم، سەرجەم باسەكانی دیكەی هی (مسوڵمانی كامڵ)ن، لا پەڕەی (160) تا وەكو (175)و، خاڵی دووەمیش هەمووی لە (مسوڵمانی كامڵ) وەرگیراوە، لا پەڕە (176) تاكو (184)و، خاڵی سێیەمیش كە دوو بڕگەیە یەكەمیان لە (مسوڵمانی كامڵ) وەرگیراوە، لاپەڕەی (196) تاكو (200)، بەڵام جگە لەو باس‌و بڕگانەی ئاماژەم پێدان، سەرجەم باس‌و بابەتەكانی دیكە هی دەرسەكانی ژمارە (42 و43 و44 و45 و46)ی زنجیرە دەرسی: (ئیمان وعەقیدەی ئیسلامیی)ن.

ئێستاش با یەك لە دوای یەك باس لە حەوت خاڵەكانی ئەم بەندی یەكەمە بكەین:

## خاڵی یەكـــەم

## چــەند كورتە بـاســـێك دەربـارەی ڕۆژی دوایی

خوێنەری بەڕێز!

ئەم خاڵی یەكەمە لە پازدە (15) كورتەباس پێكدێ كە ئەمە ناوونیشانەكانیانە:

1ـ ماناو گرنگی ئیمان بە ڕۆژی دواییو حیكمەتی پەنهانبوونی كاتەكەی.

2ـ ناوەكانی ڕۆژی دوایی.

3ـ پێناسە یەكی كورتی ڕۆژی دوایی.

4ـ حیكمەتی هەبوونی ڕۆژی دوایی.

5ـ لە ڕۆژی دواییدا چی دەقەومێ؟!

6ـ دیمەنی گۆڕەپانی كۆكردنەوەو لێپرسینەوە.

7ـ لەو ڕۆژەدا تاوانباران حاڵو باڵیان چۆن دەبێ؟!

8ـ سەرەنجدانێك لە دادگای دوا ڕۆژ.

9ـ سەرەنجامی شوومی تاوانباران لە ڕۆژی دواییدا.

10ـ سەرەنجامی بەختەوەرانەی چاكەكاران.

11ـ لێك هەڵاوێرانی پاكو پیسان.

12ـ تكا (شفاعة)كردنی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام.

13- چۆنیەتی ڕەتبوون بەسەر پردی سەر پشتی دۆزەخدا.
14- تێراوبوونی ئوممەتی (محمد) لە سەرچاوەی کەوسەر.
15- ئەنجامی کۆتایی ڕۆژی دوایی.

پێویستە ئەوەش بڵێین کە لە نێوان هەندێك لە باسەکانی ئەم خاڵی یەکەمەو هەندێك بڕگەو باسی خاڵەکانی دیکەدا لە یەکچوون هەیە، بەڵام بێگومان هەرکامێکیان تامو چێژی تایبەتی خۆی هەیەو هۆکاری لە یەك چوونەکەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە -وەك پێشتر گوتمان- باسو بابەتەکانی ئەم بەندە لە دوو کاتی جیاوازدا نوسراون[1].



1) چونکە هەندێکیان هی (مسوڵمانی کامڵ)و هەندێکیشیان هی زنجیرە دەرسی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی)ین.

## 1- مانا و گرنگی ئیمان بە ڕۆژی دوایی و حیکمەتی پەنهانبوونی کاتەکەی.

خوێنەری بەڕێز!

مانای ئیمان بەڕۆژی دوایی بە کورتی ئەوەیە کە:

ئینسان بە عەقڵ بزانێ‌و بە دڵ بەڕاستی بزانێ‌و دڵنیابێ‌و بە زمان دانی پێدابێنێ‌و بە کردەوەو هەڵوێستیش دەری بخات‌و بیسەلمێنێ، کە دوای ئەم ژیانە خاکییە دونیایی‌یە زیندوکرانەوەو لێپرسرانەوەو سزاو پاداشت هەیە لە قۆناغێکی دیکەی ژیاندا کە پێشەکییەکەی ڕاستەوخۆ پاش مردن دەستپێدەکات‌و پاشان لە قیامەت‌و ڕۆژی دواییدا بە تەواوی بەرجەستە دەبێ‌و بە نیشتەجێبوونی ئیماندارانی چاکەکار لە بەهەشتێداو بێبڕوایانی خراپەکار لە دۆزەخێدا کۆتایی پێدێ.

ئنجا وەك پێشتر باسمانکرد بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی یەکێکە لە پێنج پایەکانی ئیمان، وە لە ڕووی گرنگی‌و بایەخەوە دووەمین پایەیە، جا یەکێك بوونی ئیمان بە ڕۆژی دوایی لە پێنج پایەکانی ئیمان، لە هەرکام لە ئایەتی (177)ی (البقرة)و ئایەتی (136)ی (النساء)و فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺدا کە بە (حدیث جبریل) ناسراوە، دەدرەوشێتەوە، وەك خوای - عزّوجلّ - فەرموویەتی: ﴿لَّيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ

**الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَـكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْمَلآئِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ﴾**(البقرة 177)و، فەرموویەتی: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ آمِنُواْ بِاللّهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَى رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِيَ أَنزَلَ مِن قَبْلُ وَمَن يَكْفُرْ بِاللّهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلاَلاً بَعِيدًا﴾**(النساء- 136). پێغەمبەری خواش ﷺ لەوەڵامی (جبریل)دا کە لێی پرسی: هەواڵم بدەیە ئایا ئیمان چییە؟! فەرمووی: (أن تؤمن بالله وملائكته وكتبه و رسله واليوم الآخر...) رواه البخاري ومسلم عن عمر بن الخطاب ـ رضي الله عنه ـ.

وە دووەمین پایەبوونی ئیمان بە ڕۆژی دوایی لە ڕووی گرنگییەوە لە زۆر شتدا دەدرەوشێتەوەکە یەکیان بریتیە لەوە کە: لە چەندان ئایەتی قورئانو فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ ئیمان بە خواو ئیمان بە ڕۆژی دوایی بە یەکەوە هاتوونو، ئەگەر سەرنجی قورئانو سوننەت بدەین دەبینین کە ئەوەندەی ئیمان بە ڕۆژی دوایی، لەگەڵ ئیمان بە خوا هاتوە، هیچ کام لە پایەکانی دیکەی ئیمان ئەوەندە لەگەڵی نەهاتوون، ئەویش بە چەندان جۆر تەعبیر وەك: **(امنوا بالله واليوم الآخر)** یان **(آمن بالله واليوم الآخر)** یان **(يؤمنون بالله واليوم الآخر)** یان **(يؤمن بالله واليوم الآخر)**. . . هتد[1].

هۆی ئەمەش ئەوەیە کە بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی، یەک سەر ئەنجامو بەرهەمی بڕوابوونە بە خوای پەروەردگار، واتە: مادام خوای پەروەردگار هەیە، دەبێ ڕۆژی دواییش هەبێ! مادام ئەم بوونەوەرە خاوەنو بەدیهێنەرو پەروەردگارو فەرمانڕەواو کارسازێکی هەیەو، مادام ئەو خەڵکە پەرستراو (معبود)ێکی هەیە، دەبێ حەتمەن ڕۆژێکیش هەبێت کە تێیدا زیندوو

1) لە (پێشەکی)دا چەند ئایەتو فەرمایشتێکمان بە نموونە هێنانەوە.

بکرێـنەوەو پاداشتو سزای خۆیان وەربگرنەوەو، داد گەری خوای پەروەردگاری تێدا بچەسپێ.

وەك خوای بەرزو مەزن لەچەندین شوێندا ئەو راستییەی خستۆتەروو، بۆ وێنە: فەرموویەتی: **﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لا تُرْجَعُونَ ۞ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ﴾**[1]، واتە: ئایا پێتانوایە ئێوەمان بە گاڵتەو هەوەنتەو بێ حیکمەت دروستکردووەو بۆ لای ئێمە ناگێڕرێنەوە! بەرزی بۆ خوای پادشای حەق، جگە لەو پەرستراوێکی دیکە نیە، خاوەنی بارەگای بەرێزو حورمەتە.

واتە: بەرزیی بۆ خواو پاکی بۆ خوا، کە دروستتان بکات، بەڵام دوایی زیندووتان نەکاتەوە! کەواتە زیندوو نەکردنەوەی ئینسانەکانو نەبوونی رۆژێك بۆ سزاو پاداشت، لەگەڵ بەرزییو پاکییو حیکمەتی خوادا ناگونجێ، چونکە شتێکی بێحیکمەتو پووچو هەڵەیە، کە ئینسانەکان دروست بکرێنو پێیان بگوترێ بەندایەتی بۆ خوا بکەنو رێی راستو چەوتیان پیشان بدرێو هەندێکیان رێی راست بگرنو هەندێکیشیان رێی چەوت، کە چی دوایی رۆژێك نەبێ کە بە رێی راست گرتووەکان بگوترێ: باشتان کردو پاداشتیان بدرێتەوەو، بە رێی چەپ گرتووەکان بگوترێ: خراپتانکردو سزایان بدرێ!

هەروەها هەر لەوبارەوە خوای کاربەجێو زاناو شارەزا فەرمووییەتی: **﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاء وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَاطِلاً ذَلِكَ ظَنُّ الَّذِينَ كَفَرُوا فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِنَ النَّارِ ۞ أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ﴾**[2]، واتە: ئەوە ئاسمانو

---

1) المؤمنون (110-116).
2) (ص 27-28).

زەوی‌و ئەوەی نێوانیانمان بە ناهەق‌و بێ حیکمەت دروست نەکردوە، ئەوە گومانی ئەوانەیە کە بێ بڕوان، ئایا ئەوانەی ئیمانو کردەوەی باشیان هەیە، دەبێ وەك خراپەکاران لە زەویدا تەماشایان بکەین؟! یان ئەوانەی پارێزکاربوون دەبێ وەك تاوانبارانیان مامەڵە لەگەڵ بکەین؟!

بەڵێ، ئەگەر زیندووکرانەوە نەبێ‌و سزاو پاداشت درانەوە نەبێ، دیارە ئینسانەکان بە چاك‌و خراپەوە هەموویان وەك یەك دەمرن، کەواتە هەروەك یەك تەماشا کراون‌و ئەوەش لە خودا ناوەشێتەوە.

وە بێگومان ڕۆژی دوایش زۆر نزیکە، وەك خوای زاڵ‌و کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُ بَعِيدًا ۞ وَنَرَاهُ قَرِيبًا﴾[1] واتە: بێبڕوایان ڕۆژی دوایی بە دوور دەزانن، بەڵام ئێمە زۆر بە نزیکی دەزانین، واتە: بە پێوەری ئەوان دوورە، بەڵام بە پێوەری ئێمە زۆر نزیکە، یاخود بێبڕوایان بە دووری دەزانن کە بێتەدی، بەڵام نەخێر نزیکەو حەتمەن دێتەدی.

هەر لەوبارەوە خوا فەرمویەتی: ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ﴾[2] واتە: ڕۆژی دوایی نزیك بۆوەو مانگیش لەت بوو، چونکە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ مانگ لەت بووە، وەك کە دوایی لە شوێنی تایبەتی خۆیدا باسی دەکەین‌و (بخاري و مسلم) گێڕاویانەتەوە، هەروەها دەفەرموێ: ﴿اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُّعْرِضُونَ﴾[3]، واتە: نزیك بۆتەوە لێپرسینەوەی خەڵك، بەڵام ئەوان هەر لەبێ ئاگاییدا پشت هەڵدەکەن.

---

1) ( المعارج 6- 7).
2) ( القمر 1-2 ).
3) ( الأنبياء- 1 ).

سەهلی کوڕی سەعد خوای لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوەو دەڵێ: **(سمعت رسول الله ﷺ يُشيرُ بأُصبعهُ التي تلي الأبهام و الوسطى، وهو يقول: بُعِثْتُ أنا والساعة هكذا)**[1]، واتە: لە پێغەمبەری خوا (صەلاتو سەلامی خوای لەسەر بێ) بیستمو بینیم کە بە پەنجەی شایەتمانو پەنجەی نێوەڕاست ئاماژەی دەکردو دەیفەرموو: منو ڕۆژی قیامەت ئاوا بە جووتو لە دوای یەکتر هاتووین وە (لە ڕیوایەتێکی دیکەدا) فەرموویەتی: (قیامەت لەگەڵ هاتنی من بە ئەندازەی زیادەی پەنجەی نێوەڕاستە لە پەنجەی شایەتمان) واتە: ئەگەرپێکەوە جووتیان بکەی چەندەی زیادە، هەر ئەوەندە ماوەش هەیە لە نێوان هاتنی منو هاتنی قیامەتدا! دیارە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە زۆری پێناچێ، بەڵکو کەمێکی پێدەچێ وە لە چاو ئەو تەمەنەی کە مرۆڤایەتی لەسەر زەوی بە ڕێی کردوە، هەر ئەوەندە زیادەیەی ماوە کە ئەویش بەسەر بچێ، بەڵام بێگومان هەر خوا دەزانێ تەمەنی مرۆڤایەتی چەندی بە ڕێکراوەو هەر خواش دەزانێ کە ئەوەندەی ماوە چەندە!.

وە خوای کاربەجێ هاتنی کاتی قیامەتی شاردۆتەوەو پەنهانی کردوەو جگە لەخۆی هیچ کەس نایزانێ، لەسەر ئەوەش بەڵگە زۆرن کە نەك هەر خەڵك بەڵکو پێغەمبەران ـ عليهم السلام ـو فریشتە نزیکەکانی خواش نایزانن، بۆ وێنە خوای پەنهانزان فەرموویەتی: **﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي لاَ يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَا إِلاَّ هُوَ ثَقُلَتْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ لاَ تَأْتِيكُمْ إِلاَّ بَغْتَةً يَسْأَلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنْهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ اللّهِ﴾**[2]، واتە: دەربارەی قیامەت لێت دەپرسن، کەی

1) رواه البخاري ومسلم.
2) ( الأعراف- 187 ).

سەقامگیر دەبێ‌و لەنگەر دەگرێ‌و دێتەدی؟ بڵێ: زانیاری هاتنی قیامەت تەنیا لای پەروەردگارمانە، جگە لەو هیچ کەس ناتوانێ، ئەوەندە کارەساتێکی گەورەیە زۆر قورسە لەسەر ئاسمانەکان‌و زەوی، کتوپڕ نەبێ بەسەرتاندا نایەت!

وە لە فەرموودەکەی (جبريل) دا هاتوە[1]، کە جبریل لە پێغەمبەر ﷺ پرسیار دەکا دەڵێ: (فأخبرني عن الساعة) هەواڵم پێبدە کە قیامەت کەی دێت؟ پێغەمبەریش فەرمووی: منیش لە تۆی زیاتر لێ نازانم.

کەواتە هیچ کەس نایزانێ، نە (جبريل) زانیویەتی کە سەرۆکی فریشتەکانە، وە نە پێغەمبەر ﷺ ـ محمد ـ کە سەروەری پێغەمبەرانە، کە سەرەتای ڕۆژی دوایی کەی دەست پێدەکات!.

حیکمەتی پەنهانی ڕۆژی قیامەتیش ئەوەیە کە، ئینسان هەمیشە چاوەڕێی بکات‌و هەردەم خۆی بۆ ئامادە بکات، وە هەمیشە ترس‌و بیمی ئەوەی هەبێ کە قیامەت دێت.

بەڵام پێویستە بزانین کە وەك چۆن قیامەتی گەورە هەیە بۆ هەموو بونەوەر بە گشتی، بە هەمان شێوەش قیامەتی بچووکیش هەیە بۆ هەر ئینسانێك بەتایبەت وە بۆ هەر کۆمەڵێك‌و بۆ هەر وەچە (جیل) یێك، بە بەڵگەی ئەوەی کە هەندێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ باسی قیامەت دەکەن، بۆ ئینسانێك، یان بۆ کۆمەڵێك‌و بۆ وەچەیەك، جا ئەگەر ئینسان وریا نەبێت‌و باش سەرنج نەدات، وا دەزانێ کە پێغەمبەر ﷺ وای زانیوە کە لەدوای ئەوانە ڕۆژی قیامەت دێت، بەڵام بێگومان وانییەو

1) کە (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوە.

مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لەو جۆرە فەرمایشتانەدا قیامەتی گچکە (القيامة الصغرى)یە.

یەکێك لەو فەرمودانە: (**عن انس رضي الله عنه، انَّ رجلاً سأل رسول الله ﷺ متى تقوم الساعة؟ فسكت رسول الله ﷺ هُنيْهَةً، ثم نَظَر الى غُلامٍ بين يَدَيه مِنْ (أَزْد شنوءة) فقال: إنْ عُمِرٍّ هذا فَلَن يُدْرِكَه الهَرِمُ حتى تقوم الساعة، قال انس و ذالك الغلامُ مِنْ أتْرابي يومئذ)**[1]، واتە: ئەنەس ڕەزای خوای لێبێ دەگێڕێتەوەکە پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر کرد ﷺ ئایا قیامەت کەی دێت؟ پێغەمبەریش ﷺ تۆزێك بێدەنگ بوو، پاشان سەرنجی کوڕێکی تازە پێگەیشتووی دا، کە لەبەردەمی بوو وە لە هۆزی (ئەزدی شەنوئە) بوو، فەرمووی ئەگەر ئەم کوڕە گەنجە، تەمەنی بەجێ و جارێ نەمرێ، پیر نابێ کە قیامەت دێت.

ئەنەس دەڵێ: ئەو کوڕە لەو کاتەدا هاو تەمەنی من بوو، دیارە کاتێك کە ئەنەس فەرموودەکەی گێڕاوەتەوە پیر بووە، واتە: ئێستا کە من پیر بووم، ئەو کوڕە هاوتەمەنەی منیش پیر بووە، بەڵام قیامەتیش نەهاتووە!.

کەواتە مەبەست ئەوەیە کە قیامەتی ئەو خەڵکە دێت کە لەوێ دانیشتوون.

وەك لە فەرموودەیەکی دیکەدا هاتوە کە پێغەمبەر خوا ﷺ ڕوو بە ئەو خەڵکە کە ئەو پرسیارەیان ئاراستەی کردوە فەرموویەتی: **(أتتكم ساعتكم)** (رواه البخاري ومسلم عن عائشه ﵂)، واتە: ئەوکاتە قیامەتی ئێوە دێ!

ئەگەرنا وەك دوایی باسی دەکەین پێغەمبەر خوا ﷺ لە چەندان فەرمایشتدا ڕایگەیاندوە کە پێش هاتنی قیامەت ژمارەیەك ڕووداو هەن کە نیشانەو بەڵگەی نزیکبوونەوەو پێشەکی هاتنی قیامەتن، بۆ وێنە لە

1) رواه مسلم برقم 2953 .

یەکێکیاندا فەرموویەتی: قیامەت نایەت هەتا دە (10) نیشانە نەبینن، وەك (بخاری ومسلم) گێڕاویانەتەوە.

کەواتە فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ پێویستە چاك فام بکرێنو بە دروستی لێیان تێبگەین تاکو گومانی پێنەکەوە دژبوونی فەرمایشتەکانی مان لەلا دروست نەبێ!

دیارە مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو فەرمایشتانەدا کە باس لەکاتی نزیکی ڕوودانی قیامەت دەکەن، قیامەتی گچکەی کەسێك یان کۆمەڵە کەسێکەو ئەو قیامەتەش کە پاش نیشانەکان بەتایبەت دە نیشانە دوورەکان دێ قیامەتی گەورەو هەمە لایەنو گشتگیرە.

## 2- نـاوەکـانی ڕۆژی دو یــی

خوێنەری سەنگین‌و شیرین!

دەتوانین بەکورتی بڵێین: ڕۆژی دوایی بریتیە لە وێران کردن‌و گۆڕینی ئاسمانەکان‌و زەوی پاشان هێنانەدی واقیع‌و جیهانێکی دیکەی جیاواز، وە خوای بەرزو مەزن ڕۆژی دوایی لە دوو قۆناغدا دێنێتە دی: لە قۆناغی یەکەمدا کە لە ئەنجامی فووکردنی ئیسرافیل بە کەڕەنا (صور)دا دێتەدی، ئەم بوونەوەرە (ئاسمانەکان‌و زەوی) هەمووی وێران دەبێ‌و ئەم سیستەم‌و ڕێك‌و پێکییەی ئێستای نامێنێ‌و لەبەریەك هەڵدەوەشێ، وە لە ئەنجامی فووی دووەمدا، خوای بالادەست بە شێوەیەکی دی وەزعێکی دی دەڕەخسێنێ، کە بوون (وجود) لە شێوەی مەیدانی کۆکردنەوەو لێپرسینەوەو پردی سەرپەرشتی دۆزەخ (صراط)و لە بەهەشت‌و دۆزەخ دا خۆی دەنوێنێ.

بەڵێ ڕۆژی دوایی ئەم دوو قۆناغەیە، واتە: قۆناغی وێران بوون‌و تێکچوونی ئاسمانەکان‌و زەوی، وە قۆناغی دووبارە دروستبوونەوەی جیهان‌و زیندووبوونەوەو پاشان لێپرسینەوەو سزاو پاداشت وەرگرتنەوەی ئادەمیزادو جند.

ڕۆژی دوایی کارەساتێکی یەکجار گەورەیەو بوونەوەر کارەساتی ئاوای نە پێشتر بەخۆوە بینیوەو نە دواییش جارێکی دیکە بەخۆیەوە دەبینێ، ئنجا وەك پێشتر باسمان کرد لە کتێبی خوای کاربەجێ‌دا، هیچ ڕستەو وشەو بگرە هیچ پیتێکیش بێ حیکمەت‌و هۆ نیەو کاتێك دەبینین لە قورئاندا ناوو

وەسفی زۆر بۆ ڕۆژی دوایی‌و کارەساتەکانی بەکارهاتوون، دەبێ بزانین ڕۆژی دوایی چەند گەورەو گرنگە، ئەم بیست‌و دوو (22) ناوەش زۆربەی زانایان بۆ ڕۆژی دوایی لەسەریان پێکهاتوون‌و سەرجەمیشیان لە قورئانێدا هاتوون:

1- (الیوم الآخر) یان (الآخرة) یان (الدار الآخرة)، وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ **﴿ذَلِكَ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾**[1]، واتە: ئا ئەوە شتێکە کە ئامۆژگاری هەر کەسێکی لە ئێوە پێدەکرێ، کە بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە.

ئنجا ئایا بۆچی پێی دەگوترێ: ڕۆژی دوایی؟ چونکە لە دوای ئەو ڕۆژە هیچ ڕۆژی دیکە نین‌و لە دوای ئەو قۆناغە هیچ قۆناغی دی نایەن‌و ئەوەی بڕوادارو چاکەکار بووبێ لە بەهەشتدا جێگیر دەبێ‌و ئەوەی بێبڕواو خراپەکاریش بووبێ تووشی دۆزەخ دەبێ‌و تەواو، ئیدی هیچی دیکەی بە دوادا نایەت، بە پێی ئەوەی کە خوای بەدیهێنەر ئێمەی لێ ئاگادار کردۆتەوە، وە خوای کاربەجێ بۆ هەر کام لە ئەهلی بەهەشت‌و دۆزەخ فەرموویەتی: **﴿خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا﴾** بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە! بۆیە ئەو ڕۆژە پێی دەگوترێ: ڕۆژی دوایی‌و کۆتایی.

2- (القیامة) ڕۆژی هەستانەوە، وەك خوای (عزّوجلّ) دەفەرموێ: **﴿يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾**[2]، واتە: ئەو ڕۆژەی کە خەڵك بۆ پەروەردگاری جیهانەکان ڕادەوەستن، وە فەرموویەتی: **﴿اللّهُ لا إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لاَ رَيْبَ فِيهِ﴾**[3]، واتە: خوا، جگە لەو،

---

1) (البقرة  232).
2) (المطففين- 6)
3) (النساء- 87).

پەرستراوی دیکەتان نیە، کۆتان دەکاتەوە بۆ ڕۆژی هەستانەوە، کە هیچ گومانی تێدا نیەو دێتە دی.

3- (الساعة) کاتێکی دیاریکراو، وەك خوا (سبحانەو تعالى) دەفەرموێ: **﴿إِنَّ السَّاعَةَ ءاتِيَةٌ أَكَادُ أُخْفِيهَا﴾**(1)، واتە: ئەو کاتە دیاری کراوەی کە دونیای تێدا کۆتایی دێ و تێکدەچێ، دێت و ئەوەندە پەنهانە خەریکە لە خۆشمی بشارمەوە.

4- (یوم البعث) ڕۆژی زیندووبوونەوە وەك خوا دە فەرموێ **﴿فَ هَٰذَا يَوْمُ الْبَعْثِ﴾**(2)، واتە: ئامە ڕۆژی زیندووبنوونەوەیە، وە فەرموویەتی: **﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ﴾**(2)، واتە: ئەی خەڵکینە! ئەگەر لە گوماندان لە زیندووبوونەوە، ئەوە بزانن کە ئێمە ئێوەمان لە گڵ دروستکردوە.

5- (یوم الخروج) ڕۆژی دەر چوون و چوونەدەر، وەك خوا (عزّو جلّ) دەفەرموێ: **﴿يَوْمَ يَسْمَعُونَ الصَّيْحَةَ بِالْحَقِّ ذَٰلِكَ يَوْمُ الْخُرُوجِ﴾**(3)، واتە: ئەو ڕۆژەی کە چریکەو دەنگی هەرە گەورە بە حەق دەبیستن، ئەو ڕۆژە، ڕۆژی چوونەدەرە (لە گۆڕەکان بەرەو لێپرسینەوە).

6- (یوم الفصل) ڕۆژی لە یەك هەڵاواردن و لە یەك جیاکردنەوە، یاخود ڕۆژی دادگایی کردن، وەك خوا (عزّوجلّ) دەفەرموێ: **﴿إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ**

1) ( طه- 15 ).
2) ( الروم- 56 ).
2) ( الحج- 5 ).
3) ( ق 42 ).

**كَانَ مِيقَاتًا﴾**(4)، واته: بێگومان ڕۆژی لە یەك جیاكردنەوە، یاخود ڕۆژی دادگایی كردن، كاتێكی دیاریكراوی هەیە.

7- (یوم الدین) ڕۆژی سزاو پاداشت، وەك خوای زاڵ و كار بەجێ دەفەرموێ: **﴿وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ ۞ يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ الدِّينِ﴾**(1)، واته: وە خراپەكاران لە دۆزەخ دان، لە ڕۆژی سزاو پاداشت دا دەچنە نێوی.

8- (یوم الحساب) ڕۆژی لێپرسینەوە، وەك خوای دادگەر دەفەرموێ: **(إِنَّ الَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ اللهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا نَسُوا يَوْمَ الْحِسَابِ﴾**(2)، واته: بێگومان ئەوانەی كە لەڕێی خوا ون دەبن و لادەدەن، ئازارێكی بە ئێشیان هەیە لە سۆنگەی ئەوەوە كە ڕۆژی لێپرسینەوەیان فەرامۆش كردبوو.

9- (یوم الجمع) ڕۆژی كۆكردنەوە، وەك خوا (عزّو جلّ) دەفەرموێ: **(وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِّتُنذِرَ أُمَّ الْقُرَى وَمَنْ حَوْلَهَا وَتُنذِرَ يَوْمَ الْجَمْعِ لاَ رَيْبَ فِيهِ)**(3)، واته: ئاوا قورئانمان بۆ تۆ ناردوە بە زمانی عەرەبی، بۆ ئەوەی خەڵكی مەككە (أم القری)و دەوروبەری، پێ بترسێنیو ئاگاداریان بكەیەوە، وە خەڵك بترسێنی لە ڕۆژی كۆكردنەوە كە هیچ گومانی تێدا نیە.

10- (یوم الآزفة) ڕۆژی نزیك، وەك خوا فەرموویەتی: **﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الآزِفَةِ﴾**(4)، واته: وە بیانترسێنە لە ڕۆژی نزیك.

---

4) ( النبـأ- 17 ).
1) ( لأنفطار: 15-14).
2) ( ص- 26 ).
3) ( الشوری- 7 ).
4) ( غافـر- 18 ).

11- (یوم الوعید) ڕۆژی هەڕەشەو ترساندن، وەك خوا (تبارك وتعالى) دەفەرمویٚ: ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ ذَلِكَ يَوْمُ الْوَعِيدِ﴾[1]، واتە: وە فوو بە کەڕەنا (صور)دا کرا، ئەو ڕۆژە ڕۆژی هەڕەشەیە.

12- (یوم الخلود) ڕۆژی هەمیشە مانەوە یە، وەك خوا فەرموو یەتی: ﴿ادْخُلُوهَا بِسَلَامٍ ذَلِكَ يَوْمُ الْخُلُودِ﴾[2]، واتە: (بچنە بەهەشتەوە بە سەلامەتی، ئەو ڕۆژە ڕۆژی هەمیشە مانەوەیە.

13- (یوم الحسرة) ڕۆژی پەشیمانیو داخو خەفەت. وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ﴾[3]، وە بیانترسێنە لە ڕۆژی پەشیمانیو خەمو پەژارە (بۆ کافران).

14- (یوم التلاق) ڕۆژی بە یەك گەیشتن، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿رَفِيعُ الدَّرَجَاتِ ذُو الْعَرْشِ يُلْقِي الرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِ عَلَى مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ لِيُنذِرَ يَوْمَ التَّلَاقِ﴾[4]، واتە: خوا خاوەنی پلە بەرزەکانەو خاوەنی بارەگا (عرش)یە، بە فەرمانی خۆی وەحیو پەیام دەنێرێ بۆ لای هەرکام لە بەندەکانی کە مەبەستی بێت، بۆ ئەوەی خەڵك بترسێ لە ڕۆژی بە یەك گەیشتن، (کە تێیدا ئینسان بە کردەوەکانی خۆی دەگات، چ چاك بنو چ خراپ، وە چاکەکاران بە یەکتر دەگەن، وە خراپەکاران بەیەکتر دەگەن، وە چاکەکاران بە بەهەشت دەگەن وە خراپەکاران بە دۆزەخ دەگەن، وە بەندە چاکەکان بە دیداری خوای خۆیان دەگەن وە بە دیداری پێغەمبەر ﷺ دەگەنو زۆر جۆرە بە یەك گەیشتنی تێدایە).

---

1) ( ق- 20 ).
2) ( ق- 34 ).
3) ( مریم- 39 ).
4) ( غافر- 15 ).

15- (یوم التناد) ڕۆژی یەكتر بانگ كردن. وەك خوا لەسەر زمانی پیاوە ئیماندارەكەی نێو دەستەو دایەرەی فیرعەون دەفەرموێ: ﴿وَيَا قَوْمِ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ يَوْمَ التَّنَادِ﴾(1)، ئەو پیاوە ئیماندارە بۆ دیفاع لە موسا علیه السلام- لەبەردەم بارەگای فیرعەوندا كاتێك هەڕەشەی لێدە كەن دەڵێ: ئەی گەلەكەم من مەترسی ڕۆژی یەكتر بانگكردنم لە ئێوە هەیە، (ئەو ڕۆژەی كە خەڵك بانگی یەكدی دەكات، بابو دایك بانگی ڕۆڵە دەكەنو ڕۆڵە بانگی بابو دایك دەكات، وە خزمو دۆست بانگی یەكدی دەكەن، بەڵام كەس لە فریای كەس نایەتو بەدەنگ یەكدییەوە ناچن).

16- (یوم التغابن) ڕۆژی زەرەر لە یەكدی دان، یاخود میرات لە یەكتری گرتن وەك خوا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ الْجَمْعِ ذَلِكَ يَوْمُ التَّغَابُنِ﴾(2)، واتە: ئەو ڕۆژەی كە لە ڕۆژی كۆكردنەوەدا كۆ دەكرێنەوە، ئەو ڕۆژەی ڕۆژی میرات لە یەكتر گرتنە، (واتە: كافرەكان كە دە چنە دۆزەخ جێگای ئیمانداران بە میرات دەگرنەوە كە لە دۆزە خدا بۆیان دیاری كرابوو، وە ئیماندارانیش لە بەهەشتدا جێگای كافرە كان بە میرات دەگرنەوە كە لە بەهەشتدا بۆیان دیاریكراوە).

17- (الواقعة) ئەو ڕوداوەی كە ڕوو دەدات، وەك خوا (عزّوجلّ) دەفەرموێ: ﴿إِذَا وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ﴾(3)، واتە: كاتێك كە ڕووداوەكە ڕوویدا.

---

1) ( غافر- 32 ).
2) ( التغابن- 9 ).
3) ( الواقعة- 1 ).

18- (القارعة) دەنگێکی داچڵەکێنەرو شڵەژێنەر، وەك خوا دە فەرمویٚ: ﴿الْقَارِعَةُ ۞ مَا الْقَارِعَةُ ۞ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْقَارِعَةُ﴾[1]، واتە: داچڵەکێنەر، داچڵەکێنەر چی یە؟ تۆ چوزانی داچڵەکێنەر چییە؟!

19- (الحاقة) ئەو ڕۆژەی کە حەقی تێدا دەچەسپیٚ، یاخود ئەو ڕۆژە کە حەقەو هەر دێتەدی، وەك خوا (عزّوجلّ) دەفەرمویٚ: ﴿الْحَاقَّةُ ۞ مَا الْحَاقَّةُ ۞ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحَاقَّةُ﴾[2]، واتە: ڕۆژی حەق، ڕۆژی حەق چییە، تۆ چوزانی ئەو ڕۆژەی حەقی تێدا دەچەسپیٚ چییە؟!.

20- (الطامّة الكبرى)[3] کارەساتێکی ئەوەندە گەورە کە هەموو شوێنێك دەگرێتەوە، وەك خوا (عزّوجلّ) دە فەرمویٚ: ﴿فَإِذَا جَاءَتِ الطَّامَّةُ الْكُبْرَى﴾، واتە: کاتێك کە ئەو کارەساتە هەرە گەورەیە هات.

21- (الصاخّة) دەنگێکی بەهێز کە گوێیەکان کەڕ دە کات، وەك خوا دەفەرمویٚ: ﴿فَإِذَا جَاءَتِ الصَّاخَّةُ﴾[4]، واتە: کاتێك کە دەنگە هەرەگەورەکە هات کە گوێی ئینسان کەڕ دەکات.

22- الغاشية: داپۆشەر، وەك خوا سبحانه وتعالى دەفەرمویٚ: ﴿هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ؟!﴾(الغاشية -1)، واتە: ئایا هەواڵی ئەو ڕۆژەت پێگەیشتوە کە هەموو شتێکدا دەپۆشیٚ؟!

---

1) ( القارعة: 1 – 2 ).
2) ( الحاقة: 1 – 2 ).
3) ( النازعات- 34 ).
4) ( عبس- 33 ).

**لە کۆتایی ئەم باسـەشـدا بە پێویستی دەزانم بڵێم:**

**یەکەم:** ڕۆژی دوایی (الیوم الآخر) بێجگە لەم ناوو وەســفانەی ڕابردن ناوو وەسفی دیکەشی هەن لە قورئانو سونەتدا، بەڵام ئەم بیستو دووە لە هەموویان دیارترو سەرەکی ترن.

**دووەم:** هەموو یان زۆربەی ئەو ناوو وەسفانەی باسمانکردن، پێناسەو وەسفی حاڵەتو قۆناغێك، یان ڕووداوو کارەساتێك لە حاڵەتو قۆناغو ڕووداوو کارەساتە زۆرو جۆراو جۆرەکانی ڕۆژی دوایی دەکەن!.

وەك پێشتریش گوتمان زۆریو جۆراو جۆریی ناوو وەسفەکانی هەر شتێك بەڵگەو نیشانەو گەورەییو گرنگی ئەو شتەیە، بەتایبەت لە کتێبی خوای کاربەجێدا، کە خوای بەرزو مەزن بە حەقو ترازو ناردوویەتە خواریو هیچ پیتێکی بێ حیکمەتو نهێنی نیە: **﴿اللَّهُ الَّذِي أَنزَلَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ وَالْمِيزَانَ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ السَّاعَةَ قَرِيبٌ﴾(الشورى ـ17)**.

## 3- پێناسەیەکی کورتی ڕۆژی دو ی:

خوێنەری بەڕێزو سەنگین! ڕۆژی دوایی دواین قۆناغی سەفەری ژ یانی ئینسانە وەك خوا فەرمووویەتی: **﴿يَا أَيُّهَا الإِنسَانُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَى رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَاقِيهِ ۞ فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ ۞ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ۞ وَيَنقَلِبُ إِلَى أَهْلِهِ مَسْرُورًا ۞ وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ وَرَاء ظَهْرِهِ ۞ فَسَوْفَ يَدْعُو ثُبُورًا ۞ وَيَصْلَى سَعِيرًا﴾** (الانشقاق: 6-12)، واتە: ئەی ئینسان تۆ ڕەنج دەدەی هەتا دەگەیە پەروەردگارتو تووشیشی دەبی. جا ئەوەی بە ڕاستەی نامەی کردەوانی درایەوە ئەوە لێپرسینەوەیەکی سووکی لەگەڵ دەکرێو بە دڵخۆشی دەگەڕێتەوە نێو کەس‌وکارەکەی. بەڵام ئەوەی لەلای پشتەوەی ڕا، نامەکەی درایەوە دەستی، ئەوە لەوە پاش مردن بە ئاوات دەخوازێو، دەخرێتە نێو کڵپەی ئاگری (دۆزەخ)ەوە.

وە ڕۆژی دوایی بە تێکچوونی ژیانی دنیاو بوونەوەر دەست پ ێدەکات، وەك خوا فەرمووویەتی: **﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ وَبَرَزُواْ للّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ﴾**(ابراهیم- 48)، واتە: ئەو ڕۆژەی کە زەویو ئاسمانەکان دەگۆڕێن، وە (مرۆڤەکان) بۆ خوای تاکی دەستەڵاتدار دێنە گۆڕێ.

بە جێگیربوونی بێبڕواو تاوانباران -هەرکەس بە پ ێی خۆی- لە دۆزەخی گەرمو بەتینداو، نیشتەجێبوونی بڕوادارانی چاکەکار لە بەهەشتی ڕازاوەو بەریندا کۆتایی پێدێ، وەك خوا فەرمووویەتی: **﴿وَسِيقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى جَهَنَّمَ زُمَرًا....﴾** (الزمر- 72)، واتە: ئەوانەی کە کافر بوون کۆ مەڵ کۆمەڵ بەرەو دۆزەخ بەڕێ کران.

**﴿وَسِيقَ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ إِلَى الْجَنَّةِ زُمَرًا....﴾**، (الزمر: **73**)، واتە: ئەوانەی کە پارێزیان لە پەروەردگاریان کرد بوو دەستە دەستە بەرەو بەهەشتێ بەڕێ کران.

تێبینی:

بێگومان بە ڕێکرانی کافرانی تاوانبارو خواناسانی چاکەکار لە ڕۆژی دواییدا زۆر لێك جیاوازن (هەرچەندە لێرە هەر بە یەك تەعبیر با سکراون) وەك لە سورەتی (مريم)دا فەرموویەتی: **﴿يَوْمَ نَحْشُرُ الْمُتَّقِينَ إِلَى الرَّحْمَنِ وَفْدًا ۞ وَنَسُوقُ الْمُجْرِمِينَ إِلَى جَهَنَّمَ وِرْدًا﴾**(**85- 86**)، واتە: ئەو ڕۆژەی کە پارێزکاران بەرەو لای (خوای) میهرەبان بە سواری بەڕێ دەکەین، وە تاوانباران بە تینوەتی بەرەو دۆزەخ لێدەخورین.

وەك دەبینین کە شێوەی بەڕێکردنی پارێز کاران وەك بەڕێکردنی ئەو نوێنەر (وفد)انە وایە کە بەڕێزو حورمەتەوە دەچنە لای پاد شاو حوکمڕانەکان، بەڵام بەڕێکردنی تاوانباران لە شێوەی لێ خوڕینو ڕەپێچەکدانی مەڕومالاتێك دایە کە بە تینوەتیو زەبونی بەرەو مۆڵگاو شوێنی ئاودران وەپێش خۆ دەدرێن!!.

## 4- حیکمەتی هەبوونی ڕۆژی دوایی:-

بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی ئەنجامی سروشتی بڕوا بە خوا بوون و بڕوا بە پێغەمبەر بوونە، واتە هەروەك چۆن بەهۆی بڕوا بە خوا بوونەوە بڕوا بە پێغەمبەر بوون وەدی دێ، چونکە هەرکەس خوای ناسی، دەزانێ وای لێچاوەڕوان ناکرێ کە بەندەکان وێڵ بکاو هیچ پێغەمبەریان بۆ نەنێرێ و بەرنامەیان بۆ ڕەوان نەکات، وەك خوای بەخشندە فەرموویەتی: **﴿وَمَا قَدَرُواْ اللّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِذْ قَالُواْ مَا أَنزَلَ اللّهُ عَلَى بَشَرٍ مِّن شَيْءٍ ...﴾**(الانعام-91)، واتە: وە وەك بۆ خوا پێویستە ڕێزیان لێنەگرتوە کە دەڵێن خوا هیچی نەناردۆتە سەر هیچ مرۆڤێك.

بە هەمان شێوەش لە ئەنجامی ناسینی پێغەمبەرو ئەو بەرنامەیەش دا کە پێیدا نێرراوە، مرۆڤ دەزانێ کە پێویستە ڕۆژێك هەبێ لێپرسینەوەی لەگەڵ بکرێ، داخۆ تاچ رادەیەك بەو بەرنامەیەوە، پابەند بووە کە خوا بە پێغەمبەردا بۆی ناردوە!

هاتنی ڕۆژی سزاو پاداشت ئەنجامی مسۆگەری دادگەریی و کاربەجێیی خوایە، واتە دادگەریی و کاربەجێیی خوا وای لێ چاوەڕێ دەکرێ کە چاك و خراپ وەکو یەك حیسابیان بۆ نەکرێ و ڕەش و سپی لێك جوێ بکرێنەوەو بە سزاو پاداشتی پڕ بەپێستی خۆیان بگەن، وەك خوای- عزّو جلّ - فەرموویەتی: **﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ۞ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ﴾**(المؤمنون:115- 116)، واتە: ئایا پێتانوایە کە بە گاڵتە دروستمان کردوون و ئێوە ناگەڕێنەوە لامان؟ بەرزیی و پاکیی بۆ خوای فەرمانڕەوای ڕاستەقینە. هەروەها فەرموویەتی: **﴿أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ**

آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ﴾(ص– 28)، واتە: یان ئایا ئەوانەی بڕوادار بوونو چاکەکانیان ئەنجام داوە وەکو ئەوانەیان سەیر دەکەین کە خراپەکار بوون لە زەوی دا، یان ئایا پارێزکاران وەکو بەدکاران دادەنێین؟!

تێبینی:

ئەم شێوە تەعبیرەکە لە قورئانێدا زۆرجاران دوو بارە دەبێتەوە، پێی دەگوترێ (الإستفهام الأنكاري) واتە: پرسیارکردنێکی ڕەخنەگرانە، واتە لێرەدا پرسیارکردنە لەسەر شێوەی ئەسلی خۆی نیە کە چاوەڕێی وەڵامی دوێنراوە (مخاطب) بێ، بەڵکو وەڵامی پرسیارکردنە کە هەر لە خودی خۆیدا شارراوەتەوە، کە بریتیە لە نەفیو ئینکاری کردنی ئەو شتە کە پرسیاری دەربارە دەکرێ، بێ وەڵامی یەکەش ئاماژەیە بۆ ئەوە کە بابەتی پرسیار دەربارەکراو هێندە ڕوونو ئاشکرایە جێی مشتومڕ نیەو حەوجێی بە وەڵام ناکات.

## 5- لـە ڕۆژی دواییـدا چی دەقەومـێ؟!

وەك پێشتر گوتمان: ڕۆژی دوایی لە دوو قۆناغان پێکدێ، لە قۆناغی یەکەمدا بۆ یەکەمین جار فوو بە کەڕەنا (صور)دا دە کرێو لە ئەنجامی ئەوەشدا سەرلەبەری بوونەوەر بەسەریێکدا دەتەپێو هیچی بەسەر هیچەوە نامێنێ، وە هەرچی لە ئاسمانو زەویدا هەیە لە هۆش خۆی دەچێو دەمرێ، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ نەمرێ، وە لە قۆناغی دووەمدا بۆ جاری دووەم فوو بە کەڕەنادا دەکرێ وە سەر لەنوێ هەرچی زیندوو بووە لە زەوی و ئاسمانەکاندا، زیندوو دەکرێتەوەو، لە گۆڕەپانی کۆکردنەوەو لێپرسینەوە (الحشر والحساب)دا ڕادەوەستن، چ فریشتە بووبن، چ مرۆڤ، چ جند، چ ئاژەڵ.

ئێستاش با سەرنجی چەند دیمەنێکی هەرکام لەو دوو قۆناغەی ڕۆژی دوایی بدەین:

### قۆنـاغـی یەکـەم:

لەو دیمەنانەی کە لە قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دواییدا دێنە بەر چاو، ئەمانە زۆربەو سەرەکییەکانیانن:

1- شەقو پەق بوونی ئاسمان: ﴿**إِذَا السَّمَاءُ انفَطَرَتْ**﴾(الانفطار-**1**).
2- کووژانەوەو پێچرانەوەی ڕۆژو
3- هەڵوەرینی ئەستێرەکانو
4- هەڵقەندرانی شاخەکانو
5- ویلْ کردنی ماڵی بەقیمەتو
6- گڕگرتنی دەریاکان: ﴿**إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ** ۞ **وَإِذَا النُّجُومُ انكَدَرَتْ** ۞

وَإِذَا الْجِبَالُ سُيِّرَتْ ۝ وَإِذَا الْعِشَارُ عُطِّلَتْ ۝ وَإِذَا الْوُحُوشُ حُشِرَتْ ۝ وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ﴾ (التكوير: 1ـ 6).

7- بەرزبوونەوەو پێکدادانی زەوی‌و شاخەکان: ﴿وَحُمِلَتِ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَاحِدَةً﴾(الحاقة– 14).

8- قاڵ بوونەوەی ئاسمان‌و

9- شکنرانەوەی شاخەکان وەك خوری پەڕەکراو: ﴿يَوْمَ تَكُونُ السَّمَاء كَالْمُهْلِ ۝ وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ﴾ (المعارج: 8ـ 9).

**قۆنـــاغـــی دووەم:**

**لەو دیمەنانەی کە لە قۆناغی دووەمی ڕۆژی دواییدا دێنە بەرچاو:**

1ـ زیندوو بوونەوەو هەستان‌و ڕاوەستانی مردووان‌و کۆبونەوەیان لە گۆڕەپانی کۆبوونەوەدا: ﴿وَعُرِضُوا عَلَى رَبِّكَ صَفًّا لَّقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ...﴾(الكهف– 48). وە ﴿فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَاحِدَةٌ ۝ فَإِذَا هُم بِالسَّاهِرَةِ﴾ (النازعات: 13ـ 14).

2ـ ڕاوەستانی جوبرائیل‌و فریشتەکانی دیکە بە ڕیزو بە بێدەنگی مەگەر بە فەرمانی خوا: ﴿يَوْمَ يَقُومُ الرُّوحُ وَالْمَلَائِكَةُ صَفًّا لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَنُ وَقَالَ صَوَابًا﴾(النبأ– 38).

3ـ دڵ لەرزین‌و چاو ئەبڵەق بوونی بێبڕواو تاوانباران: ﴿قُلُوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ ۝ أَبْصَارُهَا خَاشِعَةٌ﴾(النازعات: 8ـ 9).

4ـ دانانی ترازووی دادگەری خوا بۆ کێشانی چاکەو خراپان: ﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ﴾(الانبياء– 47).

5ـ وەرگرتنەوەی لیستەی کردەوان لە لایەن بڕوادارانی چاکەکار بەدەستی

ڕاستو بێبڕواو تاوانبارانیش بەدەستی چەپ: ﴿**فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَيَقُولُ هَاؤُمُ اقْرَؤُوا كِتَابِيهْ ۞ إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَاقٍ حِسَابِيهْ ۞ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ**﴾(الحاقة: 19ـ 30).

6ـ ڕازێنرانەوەی بەهەشتو هەڵگیرساندنی ئاگری دۆزەخ: ﴿**وَإِذَا الْجَحِيمُ سُعِّرَتْ ۞ وَإِذَا الْجَنَّةُ أُزْلِفَتْ**﴾(التكوير: 12ـ 13).

7ـ وەڕێکەوتنی بەندەکان بەتێکڕایی بۆ پەڕینەوە لە ( صراط) پردی سەرپەر شتی دۆزەخو کەوتنەخوارەوەی تاوانباران‌و ڕزگار بوونی پارێزکاران: ﴿**وَإِن مِّنكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ۞ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا**﴾(مريم: 71ـ 72).

خوای پەروەردگار ئاوا باسی هەردووك قۆناغەکان دەکات، ﴿**وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلاَّ مَن شَاء اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُم قِيَامٌ يَنظُرُونَ**﴾(الزمر– 68)، واتە: وە فوو بە کەڕەنادا کرا (لەلایەن ئیسرافیلەوە) یەکسەر هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەویدا هەبوو مردن، مەگەر ئەوەی خوا حەز بکات نەمرێ، دوایی جارێکی دی فووی پێدا کرا، یەکسەر ئەو مردووانە ڕاستبوونەوەو چاوەڕێی فەرمانی خودا بوون.

تێبینی: ئەو فریشتەیەی فوو بە کەڕەنادا دەکات ناوی (اسرافیل)ە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووییەتی و (مسلم) لە ( صحیح)ی خۆیدا هێناویەتی‌و دەقی فەرموودەکەش ئەمەیە: ((**إن إسرائيل قَّد إلتقم الصور وحَنَى جبهته يَنْتَظِرُ متى يؤمر فيَنفُخُ**))، واتە: بە تەئکید (اسرافیل) کەڕەنای بەدەمەوە گرتووە‌و نێوچاوانی بە سەردا شۆڕکردۆتەوە، چاوەڕێ دەکات کەنگێ فەرمانی پێدەکرێ تاکو فووی پێدا بکات!.

## 6- دیمەنی گۆڕەپانی کۆکردنەوەو لێپرسینەوە:-

ئینجا گۆڕەپانی (الحشر والحساب) ساز دەکرێو ڕۆژ هێندەی (میل)ێك لە خەڵکی نزیك دەبێتەوەو، خەڵکی بە ئەندازەی زۆریو کەمی خراپە تاوانەکانیان دەکەونە نێو گەرمیو ئارەقەی لەشیانەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لە ڕۆژی دواییدا ڕۆژ لە خەڵکی وەنزیك دەخرێ هەتا هێندەی (میل)ێکی دەمێنێ، -(سلیم ی کوڕی عامر) کە لە میقدادەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: بە خوا نازانم مەبەستی لە میل میلی ڕێ پێوانە کە (1609مەترە) یان کلچێوکی چاو پێڕشتنە! جا ئەوجار خەڵك بە ئەندازەی کردەوە خراپەکانیان- لە ئارەقێدا دەبن، هەیانە تا گوێزینگانی دێو، هەیانە ئارەق جڵەوی دەکات)، (مسلم) گێڕاویەتەوە.

وە خەڵکی تێکڕا بەو شێوەیەی کە هاتونە دونیاوە -واتە بە ڕووتیو پێخواسیو سوننەت نەکراوی- وەك پێغەمبەر فەرموویەتی: (( **یُحشر الناس یوم القیامةِ حفاةً عُراةً غرلاً...**)) (متفق علیه) عن عائشة رضي الله عنها لە گۆڕەپانی ناو براو لەبەردەم دادگای خوادا کۆدەبنەوەو ڕادەوەستن: ﴿ **يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ** ﴾(**المطففين- 6**) ئەو ڕۆژەی خەڵکی بۆ پەروەردگاری جیهانەکان ڕادەوەستنو چاوەڕێی فەرمانی دەکەن، وە لەو ڕۆژەدا خوای بێوێنەو میهرەبان حەوت جۆرە کەسان دەخاتە بن باڵی بەزەیی خۆیەوەو بە لوتفی خۆی سێبەریان لێدەکاتو، لە بەڵاو تەنگانەی ئەو ڕۆژە سەختو دژوارە چەپاڵەیان دەکات، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((**سَبعَةٌ یظلهم الله في ظله یوم لا ظل الا ظله....**)) (**متفق علیه**)، واتە: حەوت کەس هەن کە خوا دەیانخاتە بن سێبەری خۆی لە ڕۆژێکدا کە جگە لە سێبەری وی چ دیکە نین:

1- سەرۆکێکی دادگەر.

2- گەنجێك کە فرچکی بە پەرستنی خوای بەرزەوە گرتوە.

3- پیاوێك کە دڵی بە مزگەوتانەوە بەندە.

4- دوو پیاو کە لە پێناوی خوادا یەکتری یان خۆشویستوە، هەر لەسەر خۆشەویستی خوا کۆدەبنەوە، هەر بەو خۆشەویستی یە شەوە لێك جیا دەبنەوە.

5- پیاوێك کە ئافرەتێکی خاوەن پایەو جوان بانگی دەکات (بۆ داوێن پیسی) ئەویش دەڵێ: من لە خوا دەترسم!.

6- پیاوێك کە خێرێك دەکات هێندە بە پەنهانی دەیکات کە ئەگەر لای ڕاستی بیبەخشێ لای چەپی پێی نازانێ!.

7- پیاوێك کە بەتەنێ یادی خوا دەکاتەوەو چاوی پڕدەبن لە ئاو (مەبەست گریانو فرمێسك ڕشتنە).

تێبینی :

دیارە کۆڕەکی هی پیاوان بووەو پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی بۆ پیاوان کردووە، ئەگەرنا ئافرەتو پیاو لەو مەسەلەیەدا یەکسانن وەك شارەزایانی (أصول الفقه) گوتوویانە.

## 7- لەو ڕۆژەدا تاوانباران حاڵو باڵیـان چۆن دەبێ؟!

لە ڕۆژی دواییدا دادگەریو قەهرو تووڕەیی خوا ( جلّ جلا لە) لە تاوانباران وەخۆ دەکەونو، پاش حاشاکردنو دەستکردن بە درۆو دەلە سەو سوێندی بە درۆ خواردنو بێئەدەبی نواندن، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَى شَيْءٍ أَلا إِنَّهُمْ هُمُ الْكَاذِبُونَ﴾(المجادلة -18)، واتە: ئەو ڕۆژەی کە خوا هەموویان زیندوو دەکاتەوە، جا (بۆ خۆ قوتارکردن) سوێندی بۆ دەخۆن هەروەك چۆن سوێند بۆ ئێوە دەخۆن (بە درۆ تا بڕوایان پێ بکەن) وە پێیانوایە کە لەسەر شتێك بوون (و هەقێکیان بە دەستەوەیە) ئاگاداربە! ئەوانن درۆزنان، بەڵێ دوای ئەوە خوا مۆر بەسەر زاریانەوە دەنێو، ئەندامەکانیان دێنێتە گۆو، بە ئەندامەکانیان شادییان پێ لەسەر خۆیان دەدات، وەك خوا (عزّو جلّ) فەرموویەتی: ﴿الْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَى أَفْوَاهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَا أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُمْ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾(يس- 65)، واتە: ئەمڕۆ مۆریان بەسەر زارەوە دەنێین، وە دەستیان قسەمان لەگەڵ دەکەنو، لاقیان شایەدیی لەسەر کردەوەکانیان دەدەن.

ئەم فەرموودەیەش چەمكو واتای ئایەتەکە ڕوونتر دەکاتەوە: (ڕۆژ ێك پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنیو زەردەخەنەی هاتێ، ئنجا فەرمووی: بۆ لێم ناپرسن لەبەرچی پێکەنیم؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی پێ کەنی؟ فەرمووی گفتوگۆی بەندەم پێ سەیر بوو لە ڕۆژی دوای یدا لە گەڵ پەروەردگاریدا، دەڵێ باشە پەروەردگارم ئەدی بەڵێنت نەداومێ کە ستەمم لێ نەکەی؟ دەفەرمویێ: با، دەڵێ: دەجا من لە نەفسی خۆم بەولاوە بە

هیچ شایەدێك قایل نیم، ئنجا خوای خاوەن پیتو پێزو بەرز دە فەرمویٚ: ئایا من بەس نیم بۆ شایەدی وە فریشتە بەڕێزە نووسەرەکان بەس نین؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەویش واتە بەندە- چەند جار ێك داوایە کەی دووبارە دەکاتەوە، فەرمووی: ئنجا مۆر بە سەر زاری یەوە دە نریٚو، ئەندامەکانی باسی ئەوە دەکەن کە کردوو یەتی، ئەویش پێ یان دە لێ: دووریو نەفرین لە ئێوەبێ خۆ من لەسەر ئێوە مشتومڕم دەکرد! (مسلم)و (بزاز)و (إبن أبی حاتم) ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە.

## 8- سەرنجدانێك لە دادگـای دو :-

خوای باڵادەستو میهرەبان تەرازووی دادگەری خۆی دادەنێو چاکەو خراپەکانی پێ دەکێشرێنو گەردیلەی گچکە چی‌یە لە چاکەو خراپە ون‌نابێو دەخرێتە ڕوو، ئنجا هەرچی لەو گۆڕەپانەدا خڕبۆتەوە ـ لێرەدا مەبەست بەس ئینسانو جندە - بە گوێرەی کردارو ڕەفتاری چاك یان خراپیان پاداشت یان سزایان بۆ دیاری دەکرێو هیچ کەسێك هێندەی نووکی دەرزی‌یە ستەمی لێ ناکرێ، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ﴾(الانبياء- 47)، واتە: وە تەرازووە دادگەر (و ڕاست)ەکان لە ڕۆژی دواییدا (بۆ هەڵسەنگاندنی کردەوەی بەندەکان) دادەنێین، هیچ کەس تۆزە ستەمێکی لێ ناکرێ، وە ئەگەر هێندەی دەنکە خەرتەلەیەك (چاکە یان خراپەی هەبێ) دەیهێنینە گۆڕێ، وە ئێمە بەسین بۆ ژماردنو لێپرسینەوە.

وە فەرموویەتی: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ۞ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾(الزلزال: 7- 8)، واتە: جا هەرکەسێك (هێندەی) قورسایی گەردیلەیەك چاکە بکات دەیبینێتەوە، وە هەر کەسێك (هێندەی) قورسایی گەردیلەیەك خراپە بکات دەیبینێتەوە.

وە فەرموویەتی: ﴿وَأَشْرَقَتِ الأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ الْكِتَابُ وَجِيءَ بِالنَّبِيِّينَ وَالشُّهَدَاء وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِالْحَقِّ وَهُمْ لا يُظْلَمُونَ﴾(الزمر- 69)، واتە: زەوی (گۆڕەپانی حشر) بە ڕوناکی پەروەردگاری درەو شایەوەو لیستە (ی کردەوان) دانراو پێغەمبەرانو شاهێدان هێنرانو بە ڕاستی حوکمیان لە نێواندا کرا، بێ‌ئەوەی ستەمیان لێ بکرێ.

## 9- سەرەنجامی شوومی تاوانباران لە ڕۆژی دواییدا :-

لە ڕۆژی دواییدا ڕازو نهێنی یە پەنهانو شێرراوەکانی نێو دڵان ئا شکرا دەبن‌و مرۆڤ هیچ شتێکی لێ ون نابێ، وەك خوا (عزّوجلّ) فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ﴾(الطارق -9)، واتە: ئەو ڕۆژەی کە نهێنی یەکان ئاشکرا دەبن. ﴿يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لا تَخْفَى مِنكُمْ خَافِيَةٌ﴾(الحاقة- 18)، واتە: لەو ڕۆژەدا ڕادەنوێنرێن، هیچ شتێکی ئێوە لە خوا پەنهان نییە. وە لەو ڕۆژەدا بێبڕواو تاوانباران ڕیسواو ڕوو زەردو شەرمەزار دەبن‌و ڕوویان ڕەش دەبێ‌و دڵیان پڕدەبێ لە خەم‌و پەژارەو سەری دنیایان لێ و یك دێتەوەو مردنێ بە ئاوات دەخوازن، وە بە دادگەری خوا لە ئازارو ئەشکەنجەی بێ ئامانی دۆزەخدا گیرۆدەو گرفتار دەبن، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَاشِعَةٌ﴾(الغاشية-2) واتە: لەو ڕۆژەی دا چەند ڕوویێك کزو داماون، وە فەرموویەتی: ﴿وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ ۞ تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ ۞ أُوْلَئِكَ هُمُ الْكَفَرَةُ الْفَجَرَةُ﴾( عبس: 40-42)، واتە: وە چەند ڕوویێك هەن لەو ڕۆژەی دا تۆزو گەرد (ی خەم‌و پەژارە)یان لێ دەنیشێ‌و، دووکەڵی ڕەشی شەرمەزاری دایان دەگرێ، ئەوانەن کافرانی تاوانبار.

وە فەرموویەتی: ﴿وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ تَرَى الَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَى اللهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ...﴾ (الزمر-60)، واتە: وە ڕۆژی قیامەتێ دەبینی ئەوانی درۆیان دژی خودا کردوە ڕوویان ڕەش بووە.

وە فەرموویەتی: ﴿يُبَصَّرُونَهُمْ يَوَدُّ الْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِي مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍ بِبَنِيهِ ۞ وَصَاحِبَتِهِ وَأَخِيهِ ۞ وَفَصِيلَتِهِ الَّتِي تُؤْوِيهِ ۞ وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنجِيهِ﴾(المعارج: 11-14)، واتە: بابای تاوانبار حەز دەکات لە سزای ئەو

ڕۆژە منداڵەکانی بکاتە بەلاگێڕی خۆی، وە هاوسەرەکەی و براکەی، وە ئەو تیرەیەی کە دەیگرێتە خۆی، وە هەموو ئەوانەی کە لە سەر زەوی هەن تێکرا، بەس ڕزگاری بێ.

وە فەرموویەتی: ﴿وَيَقُولُ الْكَافِرُ يَا لَيْتَنِي كُنتُ تُرَابًا﴾(النبأ-40)، واتە: وە کافر دەڵێ خۆزگە گڵ بوومایە.

وە فەرموویەتی: ﴿هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ فَالَّذِينَ كَفَرُوا قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُؤُوسِهِمُ الْحَمِيمُ ۞ يُصْهَرُ بِهِ مَا فِي بُطُونِهِمْ وَالْجُلُودُ﴾ (الحج: 19- 20)، واتە:- .... جا ئەوانەی بێبڕوابوون لە ئاگر پۆشاکێکی تایبەتییان بۆ دەبڕێ، ئاوی داغیان بە سەردا دەکرێ. پێستیان و هەرچی لەنێو زگیان دایە پێی دەتوێتەوە. وە گورزو قەمچی ئاسنین (بۆ لێدان) یان هەیە. هەرکاتێك ویستیان لەبەرخەم و پەژارە لێی بچنە دەرێ دەگێڕرێنەوە نێوی، وە (پێیان دەگوترێ) بچێژن ئازاری سوتێنەر!، ئنجا ئەو پۆشاکە تایبەتی یە لە سوورەتی (ابراهیم)دا چاکتر ڕوون کراوەتەوە: کە دەفەرموێ: ﴿وَتَرَى الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُّقَرَّنِينَ فِي الأَصْفَادِ ۞ سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ وَتَغْشَى وُجُوهَهُمْ النَّارُ﴾(49-50)، واتە: وە لەو ڕۆژ -ی دوایی-ەدا تاوانباران دەبینی کە دەست و لاقیان یان دەست و گەردنیان- لە کۆت و زنجیردا جووت کراون. پۆشاکیان لە قەتران -یان مسی قاڵکراوە- یە، وە ئاگر دەم و چاویان دادەپۆشێ[1].

دیارە ئەمە بەس دیمەنێکە لە دەیان دیمەنی بێزراو سامناکی ژیان و گوزەرانی بێبڕواو گوناهباران لەنێو دۆزەخ دا!!

---

(1) هەرکام لە وشەی (مقرنین)و (أصفاد)و (قطران) بە پێی تەفسیرو لێکدانەوەی (ابو جعفر الطبري) لێکدراونەوە، (مختصر تفسیر الطبری)، ل(29).

## 10- سەرەنجامی بەختەوەرانەی چاکەکاران :-

لە ڕۆژی دواییدا موسڵمانانی چاکەکار دڵخۆش‌و ڕووگەش دەبن‌و ڕوویان سپی دەبێ‌و لە ڕەنج‌و تێکۆشانی ژیانی دنیایان ڕازی دەبن، وە بە چاکەو لوتفی بێ‌سنووری خوا لە باغ‌و کۆ شکە ڕازاوەو پڕ نازو نیعمەتەکانی بەهەشتدا نیشتەجێ دەبن، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُّسْفِرَةٌ ۞ ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ﴾(عبس: 38- 39)، واتە: لەو ڕۆژەدا چەند ڕوویێك هەن گەش‌و ڕوون، زار بە پێکەنین، دڵخۆش، وە فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ فَأَمَّا الَّذِينَ اسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكْفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ فَذُوقُواْ الْعَذَابَ بِمَا كُنْتُمْ تَكْفُرُونَ ۞ وَأَمَّا الَّذِينَ ابْيَضَّتْ وُجُوهُهُمْ فَفِي رَحْمَةِ اللهِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾(آل عمران: 106-107)، واتە: ئەو ڕۆژەی کە هەندێك ڕوو سپی دەبن‌و هەندێك ڕوو ڕەش دەبن، وە ئەوانەی کە ڕوویان سپی بووە ئەوە لەنێو ڕەحمەت‌و نازو نیعمەتی خوادان، تێیدا دەمێننەوە.

وە فەرموویەتی: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ ۞ لِسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ﴾(الغاشية: 8-9)، واتە: لەو ڕۆژەیدا چەند ڕوویێك هەن گەشن، لە ڕەنج‌و هەوڵدانی خۆیان قایلن. (واتە پێ خۆشحاڵیی خۆیان دەردەبڕن سەبارەن بە ژیانی دنیایان کە بە هۆی شوێنکەوتنی بەرنامەی خواوە بە شێوەیەکی وا گوزەراندویانە لە تاقیکردنەوەی خوا دەربچن‌و پاداشت‌و ڕەزامەندی خوا دەستگیر بکەن، کە لە ژیانی پڕ نازو نیعمەتی هەمە جۆرەو بێ سنوورو نەبڕاوەی بەهەشتی بەرین‌و ڕازاوەدا خۆی دەنوێنێ).

وە فەرموویەتی: ﴿وَمَا تُجْزَوْنَ إِلا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ۞ إِلا عِبَادَ اللهِ الْمُخْلَصِينَ ۞ أُوْلَئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَّعْلُومٌ ۞ فَوَاكِهُ وَهُم مُّكْرَمُونَ ۞ فِي

**جَنَّاتِ النَّعِيمِ ۞ عَلَى سُرُرٍ مُّتَقَابِلِينَ ۞ يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِن مَّعِينٍ ۞ بَيْضَاء لَذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ ۞ لاَ فِيهَا غَوْلٌ وَلا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ ۞ وَعِندَهُمْ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ عِينٌ ۞ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ﴾** (الصافات: 39- 49)، واتە: وە بەس بە پێی ئەوەی کە کردووتانە -ئەی بێبڕوایینە- سزا دەدرێن، بێجگە لە بەندە هەڵبژاردەکانی خوا ئەوانەی ڕۆزی یەکی تەرخان کراویان هەیە، میوەجات -یان بۆ ئامادەکراوە- وە ئەوان ڕێز لێگیراون، لە باغە پڕ نازو نیعمەتەکاندا، لەسەر تەختان ڕوو بەڕووی یەکتر دانیشتوون- پەرداخی پڕکراو لە سەرچاوەیان بەسەرەوە دەگێڕێ، سپیو بە لەزەتە بۆ خۆرەوانی. هیچ زیانێکی -وەك سەر ئێشە پێگرتنی- تێدا نییە. وە بیرو هۆشیان پێی لاناچێ وە چەند ئافرەتێکی چاوگەورەو گەشیان لەلان کە سەرنجو هۆشیان -لەسەر مێردەکانیان- کورت هەڵێناوە. هەر دەڵێی گەوهەری نێو سەدەف -یان هێلکەی شاراوە-ن.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بە چەند خاڵێکی وردی قورئانی بکەم، کە لەم ئایەتە بەپێزانەی سورەتی الصافات-دا دەبینرێن:

1- لە ئایەتی ژمارە (39)دا بە تاوانباران گوتراوە کە (بەس بە پێی کردەوەکانتان سزا دەدرێن) ئەم یاسایە کە لە چەند جێیەکی دیکەشدا ڕاگەیەنراوە، بۆ وێنە: ﴿**وَجَزَاء سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللهِ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الظَّالِمِينَ**﴾(الشورى- 40)، یان ﴿**وَمَن جَاء بِالسَّيِّئَةِ فَلاَ يُجْزَى الَّذِينَ عَمِلُوا السَّيِّئَاتِ إِلاَّ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ**﴾(القصص- 84)، ئەوپەڕی دادگەریو کاربەجێیی خوای دادگەری تێدا دەردە کەوێ، کە بەس بە ئەندازەی تاوان سزای بەندەکانی دەدات.

2ـ ئایەتی ژمارە (40) کە لە حوکمی ئا یەتی پێ شەوە هەڵاوێرراو (مستثنی)ە، ئەوە دەگەیەنێ کە خوای خاوەن لوتف و بەزەیی لە بەرامبەر چاکەی چاکەکاراندا یاسایەکی دیکە بەکاردێنێ، کە بریتیە لە پاداشت و چاکەدانەوە بە زیاتر و چاکتر لە کرێ و پاداشتی چاکەکان، لەوبارە شەوە ئایەت زۆرن، بۆ وێنە: ﴿مَن جَاء بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ خَيْرٌ مِّنْهَا..﴾ (القصص-84).

دیسان هەر لەم ئایە تە دەفامرێ تەوە کە ئەوا نەی لە ئەنجامی خواناسیی و چاکەکاریی دا بە بەهەشتی بەرین شاد دەبن، کەسانێکن خوا هەڵی بژاردوون، بە واتایەکی دیکە ئەوانە کەسانێکن کە بەرلەوەی ئەوان هیچ چاکەیەکیان لێ هەڵبوەرێ، خوا چاکەی لە گەڵ کردوون و هەڵی بژاردوون، وە لە ڕاستیدا چاکە پێکرانەکەشیان هەر بەر هەم و ئەنجامی چاکە و لوتفی خودایە.

3ـ لە ئایەتی ژ مارە (41)ی شدا کە فەرموو یەتی: ﴿رِزْقٌ مَّعْلُومٌ﴾ مەبەست ڕۆزی یەکی سنوردارو کەم نیە، بەڵکو مەبە ست ڕۆزی یەکی تەرخان و دیاریکراوە کە تایبەتە بەو بەندە هەڵبژاردانە و کە سی دی کە بەشی پێوە نیە.

4ـ لە ئایەتی ژمارە (42)شدا کە وێڕای (**فواكه**) باسی (**إكرام**)یش کراوە، نازو نیعمەتی مادیی و مەعنەویی ڕەچاو کراون.

5ـ لە ئایەتی ژمارە (44)یش وەردەگیرێ کە ئەوەی لەنێو خەڵکی سادە و عەوامدا باوە، کە گوایە لە بەهەشتێ کەس جێ گاو ڕێ گای کەس نابینێ و، ئەگەر بیانەوێ یەکتر ببینن لە نیوەی ڕێیە دەگەنە یەک و هەر کەسەیان دەگەڕێتەوە شوێنی خۆی! ئەف سانەیەکی پوو چە و بەهە شتی

یەکان پێکەوە کۆدەبنەوەو لە سەر کورسی‌و تەختی بەرزو ڕازاوە: ﴿وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ﴾(الواقعة– 34)، ڕووبەڕووی یەکتر دادەنیشن!

6- لە ئایەتی ژمارە (46)یشدا دەفامرێتەوە کە خۆراکی بەهەشتیی هەم دیمەنی‌و هەم ماهیەتی لەوپەڕی تەواویی دایە، چونکە لە ڕووی ڕەنگ‌و دیمەنەوە بە (سپی)یەتی وەسف کراوە، کە پاکترین‌و بێگەردترین ڕەنگە، وە لە ڕووی ماهیەتەوە بەتام‌و چێژ (لەززەت)ی ڕووت وەسف کراوە!

7- لە ئایەتی ژمارە (47)یشدا بە شێوەیەك وەسفی ئەو خۆراك‌و شەڕابە کراوە، کە بە پێچەوانەی هی دنیاوە دوورە لەوەی کە ببێتە مایەی نەخۆشیی یان بێهۆشی!

8- وە لە ئایەتی (48)یشدا کە ئافرەتە بەهەشتی‌یەکان بە ﴿قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ﴾ وەسف کراون مەسەلەیەکی دەروونی یەکجار گرنگ لە پیاودا ڕەچاو کراوە، ئەویش ئەوەیە کە پیاو -بە مەرجێك سروشتی دوو چاری لادان (انحراف) نەبووبێ- حەز ناکات کە هاوسەرەکەی جگە لەخۆی هیچ کەسی دیکەی هەر بە خەیاڵیشی دا بێت، چ جای سەرنجی ڕابکێشێ! جا لەم ئایەتەدا ڕاگەیەنراوە کە ئەو ئافرەتانە خاوەنی ئەو ڕەوشت‌و خووە بەرزەن کە مایەی ئاسوودەیی خەیاڵی پیاوو بەختەوەری خێزانیشە!!

9- دیسان لە ئایەتی ژمارە (49)شدا کە ئافرەتە مێرد پەروەرەکانی بەهەشت وە گەوهەری نێو سەدەف یان هێلکەی شاراوەی نێو هێلانە چوێنراون، ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە ئەو ئافرەتە دڵ گیرو چاوگە شانە وێڕای ئەوەی کە بۆ خۆیان جگە لە مێردەکانیان بیر لە کەسی دی ناکەنەوە، سەرنجی هیچ کەس نادەن، هێندەش بە شەرم‌و شکۆو خۆ

پارێزو بەڕێزن، ڕێگا بە هیچ کەسیش نادەن کە بیانبینێو سەرنجیان بداتێ، چونکە جگە لە مێردەکانیان خۆیان بە حەلاڵی کەسی دی نازانن، ئینجا شایەنی باسە کە ئەم جۆرە وەسفانە و بڕوای ئەوەی کە وەزعو چۆنیەتی ژیانی بەهەشت دەخەنە ڕوو، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆش هانی پیاو ئافرەتانی مسوڵمان دەدەن کە خۆیان بەو ڕەوشتو ئاکارە بەرزو پەسەندو بەهەشتی‌یانە بڕازێننەوە.

## 11- لێك هەڵاوێررانی پاك‌و پیسان :-

پاش کێشران‌و هەڵ سەنگێنرانی چاکەو خراپەیان‌و، وەرگرتنەوەی لیستەی کردەوان، خوای بەخشندە بە گوێرەی ئەندازەی بڕواو کرداری چاك ڕووناکی بە موسڵمانان دەبەخشێ‌و، لەبەر تیشکی ئەو ڕوناکی یەدا بەرەو بەهەشت دەڕۆن، بێ‌بڕواو مونافیق‌و تاوانبارانیش کە دەیانەوێ بەرەو بەهەشت بکەونە ڕێ، دەکەونە نێو تاریکی یەکی ئەنگوستە چاوەوەو سەرگەردان دەبن، چونکە لە ژیانی دنیایاندا هێندە بڕواو کردەوەی چاکیان نەبووە، کە لە دوارۆژدا بۆیان ببێتە ڕوناکی‌و پێیی بگەنە ئامانج، وەك خوای بە بەزەیی (عزّوجلّ) فەرموویەتی: ﴿**يَوْمَ تَرَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ يَسْعَى نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِم بُشْرَاكُمُ الْيَوْمَ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ۞ يَوْمَ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ لِلَّذِينَ آمَنُوا انظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ارْجِعُوا وَرَاءكُمْ فَالْتَمِسُوا نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُ بَابٌ بَاطِنُهُ فِيهِ الرَّحْمَةُ وَظَاهِرُهُ مِن قِبَلِهِ الْعَذَابُ ۞ يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ قَالُوا بَلَى وَلَكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَارْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ الأَمَانِيُّ حَتَّى جَاء أَمْرُ اللَّهِ وَغَرَّكُم بِاللَّهِ الْغَرُورُ ۞ فَالْيَوْمَ لا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلا مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مَأْوَاكُمُ النَّارُ هِيَ مَوْلاكُمْ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ**﴾(الحديد: 12- 15)، واتە: ئەو ڕۆژەی کە پیاوان‌و ئافرەتانی بڕوادار دەبینی ڕووناکی (بڕوا)یەکەیان لە پێشیانەوە دەڕوات‌و بە دەستی ڕاستیانەوەیە (پێیان دەگوترێ) ئەمڕۆ موژدەتان لێ‌بێ بە چەند باغێك کە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن بە هەمیشەیی تێیادا دەمێننەوە، هەر ئەوە بردنەوەی مەزنە. ئەو ڕۆژەی کە پیاوان‌و ئافرەتانی دەغەڵ بە وانە دەڵێن

کە بڕوایان هێناوە: چاوەڕێمان بکەن بۆ ئەوەی لە ڕووناکی ئێوە وەربگرین! (پێیان) گوترا: بگەڕێنەوە دواوە (ژیانی دنیا یان مەیدانی لێپرسینەوە) لەوێ ڕووناکی پەیدا بکەن. ئنجا شورەیەکیان لە نێوان‌دا دانرا، دیوی ژووروی خێرو خۆشی یەو لەلای دیوی دەرەوەشی یەوە ئازار هەیە. بانگیان دەکەن (ئەی موسڵمانینە!) مەگەر ئێمەش لە گەڵ ئێوە نەبووین (لە دنیادا)؟! گوتیان: با، بەڵام ئێوە (بەهۆی نیفاقەوە) خۆتان فەوتاند. وە (بۆ بڕواداران) لە کەمین دابوون. وە هەر دوودڵ بوون، وە خولیاو ئاوات(ە پووچ)ەکان فریویان دان. هەتا فەرمانی خوا هات وە لەبارەی خواوە (شەیتانی) فریوەدەر فریوی دان، ئنجا ئەمڕۆش بەلاگێڕەوە نەلە ئێوەو نە لەوانەی بێبڕوان وەرناگیرێ، جێگاو پەناتان ئاگرە، هەر ئەو پشتیوانتانەو خراپترین سەرەنجامیش ئاگر(ی دۆزەخ)ە.

## 12- تکا(شفاعة)کردنی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام):-

لە ڕۆژی دواییدا لە گۆڕەپانی کۆکردنەوەو لێپرسینەوەدا پێغەمبەرانو زانایان-ی ڕاستو ساغ-و شەهیدان، تکای لێبوردنو بەخشین بۆ تاوانباران لە خوا دەکەن، هەر کەس بەپێی توانای خۆی وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**یشفع یوم القیامة ثلاثة، الأنبیاء ثم العلماء ثم الشهداء**)) (رواه إبن ماجة)، وە پێغەمبەرمان محمد ﷺ ئەو داوا تایبەتی یەی خۆی، کە خوا پێی بەخشیوە وەك چۆن داوایەکی تایبەتی بە هەرکام لە پێغەمبەرانی دیکە -علیهم الصلاة والسلام- بەخشیوە، هەڵی گرتوە بۆ ڕۆژی دوایی، تاکو تکاو ڕجای پێ لە خوا بکات بۆ تاوانبارانی ئوممەتی، وەك خۆی فەرموویەتی: ((**لکل نبّي دعوة قد دعاها لأمته و إني إختبأت دعوتي شفاعة لأمتيّ یوم القیامة**)) (رواه الشیخان)، وە پێغەمبەری ئێمە -علیه الصلاة والسلام- یەکەم کەس دەبێ کە تکا دەکاتو تکاکەشی وەردەگیرێ، وەك لەم فەرمایشتەدا دەردەکەوێ: (**...ولکن انطلقوا الی عیسی بن مریم فأنه کان یُبرِيءُ الأکمه والأبرص ویحیي الموتی فیقول عیسی لیس ذاکم عندي ولکن انطلقوا إلي سید ولد آدم، فأنه أول من تنشق عنه الأرض یوم القیامة، إنطلقوا الی محمد ﷺ فلیشفع لکم الی ربّکم، قال فینطلقون فیأتي جبریل ربّه فیقول ائذن له وبشره بالجنة. . .) رواه احمد وابو یعلی والبزار وابن حبان.** هەروەها ئەسڵی ئەم فەرموودەیە (بخاری ومسلم)یش گێڕاویانەتەوە.

## 13- چۆنیەتی ڕەت بوون بە سەر پردی سەرپشتی دۆزەخدا:-

هەموو ئینسانێك چاك بێ یان خراپ حەتمەن دەبێ بە سەر پردی سەرپشتی دۆزەخدا ڕەت بێ، جا ئەوانەی بڕوادارو پارێزکار بووبن، هەر کەسە بە ئەندازەی بڕواو کردەوەی چاکی خۆی بەسەریدا ڕەت دەبێ، واتە: مرۆڤی موسڵمانو خواناس خێرایی تێپەڕبوونی بەسەر پردی دۆزەخدا بە پێی پتەوی بڕواو زۆری کردەوە چاکەکانییەتی، وە ئەوانەی بێبڕواو لاڕێو یاخیبوو بووبن، ناتوانن بەسەر پردی گۆڕیندا وەپەڕن وە لەسەری سەرەنگرێ دەبنو، سەرەوبن دەکەونە نێوئاگری دۆزەخەوە، وەك خوای زانا لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلا وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ۞ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا﴾(مريم: 71-72)، واتە: وە هیچ کام لە ئێوە نیە کە نەچێتە دۆزەخەوە (مەبەست پەڕینەوەیە لە پردی دۆزەخ) پەروەردگارت بڕیاری کۆتایی لە سەرداوە. دوایی ئەوانەی کە پارێزکار بوون ڕزگاریان دەکەینو ستەمکاران لەسەر چۆکان لەوێدا بەجێ دێلین(1).

پێغەمبەریش -عليه الصلاة والسلام- ئاوا باسی چۆنیەتی پەڕینەوەی لە پردی دۆزەخ دەکات: ((پرد بەسەر نێوەڕاستی دۆزەخدا ڕادەهێشترێ، وەکو دەمی شمشێری تیژ وایە، لووسەو لەسەری هەڵدەخلیسکێی، قولابی

1) ئەم دوو ئایەتە خاوەنی (جامع البيان)یش وەك ئێمەی لێکداونەوە. بڕوانە ( جامع البيان)ی طبري، ب 16، ل81ـ 82 .

ئاگرینی لەسەرن، خەڵكیان پێ دەگیرێ، جا هەر چی بیـ ـگرێ دەكەوێـ ـتە خوارو لەخۆدەچێ، وە هەیانە وەكو تیشك ڕادەبرێ، ئەوە ـتێ نائا ـڵقێو قوتاری دەبێ دوایی هەیە وەك ـغاردانی ئە ـسپ، دوا ـیی وەك ـغاردانی ئینسان، دوایی وەك نەرمەغاری ئینسان، دوایی وەك ڕۆیشتنی ئیـ ـسان)) (رواه الطبراني عن ابن مسعود).

## 14- تێراو بوونی ئو ممەتی (مد مد) لەسەر چاوە کەوسەر:-

پاش ئەوەی موسڵمانان بەسەر پردی سەرپەرشتی دۆزەخدا ڕەت دە بن و لەترسی ئاگری دۆزەخ قو تار دە بن، لەسەر چاوەی ( کوثر) دەخۆ نەوە، (کوثر)یش ناوی ئەو کانیاوو سەرچاوەیەیە کە خوا بە پێغەمبەری ئێ مەی بەخشیوە لە بەهەشتی بەریندا، ئەو سەرچاوەیەش لەپێش هەموو کە سدا موسڵمانە کۆچەرە نەدارەکان (ف قراء الم هاجرین) لـ ێی دەخۆ نەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی[1]: وە ئەو سەرچاوەیە وەك پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی داوە (ئاوەکەی لە زیو سپی ترەو[2] لە هەنگوین شیرین ترەو، لە عەتریش بۆن خۆشترەو[3] ئەو پەرداخانەی کە لەسەر قەراغەکانی دانراون بۆ ئاو خواردنەوە هێندەی ئەستێرەکانی ئاسمانن دەبن[4].

وە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی داوە کە: سەر چاوەی ناوبراو گۆشەکانی وەك یەکن و هەتا چاو بڕبکات پان و بەرینە! [5] وە هەرکە سێك جارێك لە حەوزی کەوسەر بخواتەوە قەت تینووی نابێتەوە.

کردنەوەی گرێ کوێرەیەك:

1) وەك (أحمد) گێڕاویەتەوە.
2) (بخاري و مسلم) گێڕاویانەتەوە.
3) (أحمد) گێڕاویەتەوە.
4) ( أحمد) گێڕاویەتەوە.
5) (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوە.

ڕەنگە یەکێك بپرسێ: باشە مادام پاش ئاو خواردنەوە لە حەوزی پێغەمبەر ﷺ موسڵمانان تینوویان نەبێتەوە، ئەدی ئەو هەموو ڕوبارانەی شیرو هەنگوینو شەڕابو چیو چییە سودیان چییە؟

لەوەڵامدا دەڵێین: خواردنو خواردنەوەکانی بەهەشت هیچیان بۆ بابای برسییو تینووو حاڵ شەپرێو نین، بەڵکو بەس بۆ خۆشیو لەززەتن، وەك چۆن تۆ پەرداخێك (شەربەت) یان کەو چکێك (دۆ) دەخۆیەوە بێ ئەوەی هەست بە تینووایەتی بکەی!! یاخود قاپێك (محەلەبی) یان (پاقلاوەو شیرینی) دەخۆی بێئەوەی هەست بە برسیەتی بکەی!

## 15- ئەنجامی کۆتـایی ڕۆژی دو یی:-

وە لە کۆتایی دا ئەنجاموکۆتایی ڕۆژی دوایی بریتیە لە نیشتەجێ بوونو سەقامگیربوونی بڕواداڕانی پەسەند ئاکارو چاك ڕەفـتار لەنێو بەهە شتە ڕازاوەو سەر سووڕهێنەرەکانی خوادا، کە هەرچی دڵیان بیخوازێ لە نازو نیعمەتی ماددیو مەعنەوی تێیاندا هە یە وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿**إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلاً ۞ خَالِدِينَ فِيهَا لاَ يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلاً**﴾(الكهف: 107-108)، واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کرداری چاکیان کردوە لەنێو باغەکانی فردەوس دا -کە بەرزترین جێی بەهە شتە- نیشتەجێ دە بن، تێیاندا دەمێننەوە، نایانەوێ لێیان بچنەدەرێ.

وە فەرموویەتی: ﴿**.....وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الْأَنفُسُ وَتَلَذُّ الْأَعْيُنُ وَأَنتُمْ فِيهَا خَالِدُونَ**﴾(الزخرف- 71)، واتە: وە هەرچی نەفس ئارەزووی بکاو چاو چێژی لـێ وەربگرێ تێیدایە، وەئێوە تێیدا دەمێننەوە.

وە جێگیـربوونی بێبڕواو مونافیقو تاوانبار لەنێو ئاگری بەگڕو کڵپەی دۆزەخی بێ ئاماندا کە هەمـوو جۆرە ئازارو ئە شکەنجەیەکی ماددیو مەعنەوی لێیە وەك خوا فەرموویەتی: ﴿**إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي عَذَابِ جَهَنَّمَ خَالِدُونَ ۞ لا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ**﴾(الزخرف: 74-75)، واتە: بەڕاستی تاوانباران لە سزای دۆزەخدا دەمێننەوە، لەسەریان سووك نابێو تێیدا بێهیواو تەمابڕاو دەبن.

ئینجا دوای نیشتەجێبوونی موسڵمان وخوانا سانی ڕاستەقینە لە بەهەشتی بەرین داو، بێ بڕوایانی بەدڕەفتار لە دۆزەخی بەتین دا، بڕواداران دەست دەکەن بە ستایشکردنی خودا وسەلام لە یەکدی کردنی پەیتا پەیتا، وەك خوا فەرموویەتی: **﴿وَقَالُواْ الْحَمْدُ لِلّهِ الَّذِي هَدَانَا لِهَـذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلا أَنْ هَدَانَا اللّهُ لَقَدْ جَاءتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ وَنُودُواْ أَن تِلْكُمُ الْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾**(الأعراف-43)، واتە: وە -بەهەشتییەکان- گوتیان: ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ڕێنمایی کردووین بۆ گرتنی ڕێیەك کە بمان گەیەنێ بەم بەهەشت-ە، وە ئەگەر خوا ڕێڕوونی نەکردباین نەمان دەتوانی ڕێی ڕاست بگرین، بەڕاستی پێغەمبەرانی پەروەردگارمان هەقیان هێنابوو، وەبانگ کران کە ئەم بەهەشتەتان بەهۆی کردەوەکانتا نەوە دەستتان کەوتوە.

وە فەرموویەتی: **﴿وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلاَمٌ وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنِ الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾**(یونس- 10)، واتە: دووعایان لەوێدا بریتیە لە (ئەی خودایە پاکیی بۆ تۆ) وە سڵاوکردنیان بریتیە لە (سەلام کردن)، وە دواین دووعایان ئەوەیە کە ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان.

بێ بڕوایانی نەگبەت وبێ خێریش دە ست دە کەن بە چەقە چەقو دم بەدمەو هەرکامێکیان ئەوی دیکە تاوانبار دەکاتو، دەیەوێ پاکانە بۆ خۆی بکاتو خۆی لەلۆمەو سەرکۆنەی خوا ڕزگار بکات، وە ئەوانەی کە لە دنیا ڕابەرو سەرکردەی بێبڕوایی و خراپەکاری بوون لەو ڕۆژەدا بەری بوونی خۆیان لە شوێنکەوتوانیان دەردەبڕن ویە خەیان لە بەر دادەڕن، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: **﴿وَإِذْ يَتَحَاجُّونَ فِي النَّارِ فَيَقُولُ الضُّعَفَاءُ**

لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ النَّارِ، قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا كُلٌّ فِيهَا إِنَّ اللهَ قَدْ حَكَمَ بَيْنَ الْعِبَادِ﴾ (غافر: **47-48**)، واتە: وە کاتێك کە لەنێو ئاگرێدا دم بەدم دەکەن، بۆ دەسەڵاتەکان بە خۆ بەزلزانەکان دەڵێن: ئێمە شوێن کەوتووی ئێوە بووین، ئایا ئێوە تۆزێك لە سزای ئاگرمان لێ ناگێڕنەوە؟ خۆ بەزلزانەکان دەڵێن: ئێمە هەموومان لە دۆزەخ داین، خوا حوکمی لە نێوان بەندەکاندا کردوە.

وە فەرموویەتی: ﴿**إِذْ تَبَرَّأَ الَّذِينَ اتُّبِعُوا مِنَ الَّذِينَ اتَّبَعُوا وَرَأَوُا الْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ الأَسْبَابُ**﴾ (البقرة-**166**)، واتە: کاتێك کە سەرکردەو پێشەواکان یەخەیان لەبەر شوێن کەوتووەکانیان دادڕی، وە ئازاری دۆزەخیان دیو دەستیان لە هەموو پچکان بڕان. وە فەرموویەتی: ﴿**وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا رَبَّنَا أَرِنَا الَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ الْجِنِّ وَالإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ الأَسْفَلِينَ**﴾ (فصلت- **29**)، واتە: وە ئەوانەی کە کافرن گوتیان: پەروەردگارمان! ئەوانەمان پێشان بدە لە جندو ئینسان کە گومڕایان کردین تاکو بیانخەینە ژێر پێمانەوە بۆ ئەوەی زەبوون بن.

تەنانەت شەیتانیش کە گەورەترین پێشەواو سەرکردەی بێبڕواو تاوانبارو یاخیبووانە، لەوێدا لۆمەو سەرکۆنەی شوێنکەوتووانی دەکات و پێیان دەڵێ سووچی خۆتانە واتان بەسەرهاتوەو دادگەری خوا ڕادەگەیەنێ! وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿**وَقَالَ الشَّيْطَانُ لَمَّا قُضِيَ الأَمْرُ إِنَّ اللهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ الْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَانٍ إِلاَّ أَن دَعَوْتُكُمْ فَاسْتَجَبْتُمْ لِي فَلاَ تَلُومُونِي وَلُومُواْ أَنفُسَكُم مَّا أَنَاْ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَا أَنتُمْ بِمُصْرِخِيَّ إِنِّي كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ إِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ**﴾ (ابراهيم-22)، واتە: وە دوای ئەوەی هەموو شتێك بڕایەوە -

بەهەشتی یان لە بەهەشتیداو دۆزەخی یان لە دۆزەخ دا جێگیر بوون- شەیتان گوتی: خوا بەڵێنی ڕاستی پێ دابوون و منیش گفتم پێ دا بوون، بەڵام گفتم نەبردە سەر، وە من هیچ دەسەڵاتم بەسەرتاندا نەبوو، ئەوەندە نەبێ کە بانگم کردن ئێوەش بەدەنگمەوە هاتن، کەوا تە گلەیی لەمن مەکەن و لۆمەی خۆتان بکەن، نەمن دەفریای ئێوە دێم، نەئێوە دەفریام دێن، من نارازیم بەوەی کە لەمەوبەر منتان کردبوو بە هاوبەش بۆ خوا، بەڕاستی ستەمکاران ئەشکەنجەی بە ئازاریان هەیە.

دیارە دەگونجێ ئەم ڕستەیەی دوایی (**إِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ**) هەرقسەی شەیتان بێت و لەڕۆژەدا بەڕاشکاویی دانی بەوەدا بنێ، کە هەرچی غەیری خوا بپەرستێ و لە فەرمانی خوا دەربچێ ستەمکارو خراپەکارە، وە ڕیشی تێدەچێ کە فەرموودەی خوا بێت و بیەوێ لە کۆتاییدا مۆری ستەم (ظلم) بە پێڕی شەیتانەوە بنێ، دیارە وشەی (ظلم)یش هەرچەندە بە عورف زیاتر دەست درێژی بۆ سەر غەیر دەگەیەنێ، بەڵام لە زاراوی قورئاندا هەموو جۆرە تاوان و خراپەیەك دەگرێتەوە چ پەیوەندی بەخواوە بێت وەك هاوبەش پەرستی: ﴿**وَإِذْ قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ يَابُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ**﴾(لقمان-13)، وە چ پەیوەندی بە خەڵکەوە هەبێ: ﴿**إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى الَّذِينَ يَظْلِمُونَ النَّاسَ وَيَبْغُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ أُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ**﴾(الشورى- 42)، وە چ بەزاتی ئینسان خۆیەوە: ﴿**إِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ عِنْدَ اللَّهِ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِي كِتَابِ اللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ فَلَا تَظْلِمُوا فِيهِنَّ أَنْفُسَكُمْ وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ**﴾(التوبة- 36).

وشەی (ظلم)یش لە ئەسڵی زمانی عارەبیدا بریتیە لە دانانی شتێك لە غەیری شوێنی خۆیدا (وضع الشيء في غير موضعه).

## خـــاڵی دووەم:

## ئەنجـامو بەرهـەمی بڕوا بوون بە ڕۆژی دوایـی

ئەم خاڵی دووەمە لە حەوت کورتە باس پێك هاتوە کە ئەمە ناوو نیشانەکانیانە:

1ـ خۆ ساز کردن بۆ بەر دادگای خوا -عزّوجلّ-.

2ـ جڵەو توندکردنی ئەسپی نەفس.

3ـ دنیا بە کەم گرتن (الزهد)، لە ڕووە ماددی یەکەیەوە.

4ـ گرنگی دان بە ژیانی دنیا، لە ڕووە مەعنەوی یەکەیەوە.

5ـ خۆ پاراستن لە ئازاردانی خەڵك.

6ـ جەرگداریی و فیداکاری لە ڕێی خوادا.

7ـ کات بە فیڕۆ نەدانی بە بەلاش.

خوێنەری بەڕێز!

گوتراوە مرۆڤ چۆن بیر دەکاتەوە ئاواش دەژی، بەڵێ لە ڕاستیدا ئەوەی کە جۆرو چۆنیەتی هەڵسوکەوتو ژیانو گوزەرانی مرۆڤ دیاری دەکات، ئەو تێڕوانینو بیروباوەڕەیە کە لە دڵو دەروونیدا پنجی داکوتاوەو

دامەزراوە، جا بێگومان (بڕوا بە دوارِۆژ بوون)یش یەکێکە لە پێنج بنچینە گرنگ و مەزن و بنەڕەتی یەکانی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی و دیارە بە ئەندازەی گرنگی و مەزنی شی کاریگەریی هەیە لە هەڵسوڕاندن و ئاڕاستەکردنی کاروبارو ڕەفتارو ئاکارەکانیدا.

جا ئێمە بەتەما نین کە لەم چەند لاپەڕەیەدا هەموو ئەنجام و بەرهەمە گرنگ و مەزنەکانی بڕوا بە دوارِۆژ بوون بخەینە ڕوو، بەڵکو وەك چەپکێك لە باغێك هەندێکیان لێ بە نموونە دەخەینە بەرچاوان:

## 1- خۆ سازکردن بۆ بەر دادگای خوا (عزّوجلّ) :

یەکەمین ئەنجام و بەرهەمی بڕوابوون بە هاتنی (دوارِۆژ) بریتیە لە خۆ ئامادەکردن بۆ لێپرسینەوەی بەر دادگای خوا، چونکە تەنانەت (قوتابی)یەکی منداڵ کە دەزانێ سەری مانگ یان سەری ساڵ نیزیك بۆتەوە و کاتی تاقیکردنەوەی هاتوە، خۆی گورج دەکاتەوە و شەونخونی دەکێشێ و بەیانیان زوو لە خەوێ هەڵدەستێ، بۆ ئەوەی بتوانێ وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە کە لە دەمی تاقیکردنەوەی دا ئاڕاستەی دەکرێن.

خوای بێهاوتاش لە وەسفی کۆمەڵێك لە بەندە ڕاستەقینەکانیدا فەرموویەتی: **﴿وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ۞ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللهِ لا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاء وَلا شُكُورًا ۞ إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا﴾** (الانسان: 8-10)، واتە: خواردنێك کە خۆشیان دەوێ (لەبەر برسیەتی و پێویستی پێبوونیان) دەیدەن بە هەژارو هەتیوو دیل، (دەڵێن): ئێمە بەس لەبەر ڕەزامەندیی خودا خواردنتان دەدەینێ،

هیچ جۆرە پادا شتو سوپا سێکمان لێ تان ناوێ، ئێ مە لە لا یەن پەروەردگارمانەوە لە ڕۆژێکی زۆر ڕووگرژو تاڵ دەترسین!

وەك دەبینین ئەو کۆمەڵە خواناسە لە سۆنگەی ئەوەوە کە تر سی دوا ڕۆژیان هەیە کە ڕۆژێکی یەکجار سەختو دژوارە، تێرکرد نی ئارەزووی خۆیان (لەگەڵ برسیەتیشدا) وەلا دەنێنو پاروو لە زاری خۆیان دەگر نەوەو لەڕێی خوادا دەیبەخشن!

بەڵێ لە ڕاستیدا گەورەترین ئەنجامو بەرهەمی بڕوا بە خوا بوونو بڕوا بوون بە ڕۆژی دوایی‌و لێپرسینەوە بریتی یە لە خۆ گورج کردنو خۆ ئامادەکردن بۆ دیداری ئەو ڕۆژە، پێغەمبەری بەرێزمان -علیه الصلاة والسلام- لەوبارەوە تەفسیری ﴿**فَمَن يُرِدِ اللَّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلإِسْلاَمِ...**﴾ (**الأنعام- 125**)، دا فەرموویەتی: (إنّ النور إذا دخل في القلب انشرح له الصدر وانفسح) واتە: بێگومان ڕووناکی (بڕوا) کە چۆ نێو دڵەوە، سینە خۆی بۆ لێك دەکێشێتەوەو فراوان دەبێ. (قيل وهل لذلك علامة يا رسول الله؟!) گوترا: جا ئایا ئەو سینە فراوان بوونو دڵ ڕووناك بوونەوە یە هیچ نیشانەی هەن ئەی پێغەمبەری خوا؟! (قال نعم: التجافي عن دار الغرور، والأنابة إلى دار الخلود، والإستعداد للموت قبل نزوله) أخرجه الحاكم، فەرمووی بەڵێ، خۆ کێشانەوە لە مەنزڵگای فریو خواردن، وە گەڕانەوە بەرەو مەنزڵگای هەمیشەیی، وە خۆ ئامادەکردن بۆ مردن بەر لە هاتنی.

ئینجا با بچینە خزمەت یەكی دیكە لە فەرموودەكانی پێغەمبەرو بە ئەدەبو شەرمەوە گوێی دڵی بۆ بگرین داخۆ سەبارەت بە مەسەلەی خۆ سازكردن بۆ ڕۆژی دوایی چۆنمان ئامۆژگاری دەكات!

پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەكیدا فەرموویەتی: **(لا تزول قدما عبد حتى يسأل عن أربع: عن عمره فيما أفناه، وعن علمه ما فعل فيه، وعن ماله من أين اكتسبه وفيما أنفقه، وعن جِسْمِهِ فيما أبلاه)** رواه الترمذي، واتە: دووپێی هیچ بەندەیەك لە (بەر دادگای خوا) لاناچن هەتا لە چوار (شت)ان پرسیاری لێ نەكرێ: لە تەمەنی، داخۆ لە چیدا بەڕێی كردوە، وە لە زانیاریی داخۆ چیی پێكردوە، وەلە سامانی داخۆ لە كوێی وەدەست هێناوەو لە چیدا خەرجی كردوە، وە لە جەستەی داخۆ لە چیدا تواڵندوویەتەوە!

كەواتە: خۆ ئامادەكردن بۆ ڕۆژی دوایی بەوە دەبێ كە مرۆڤی موسڵمان:

1- ئاگای لە چركەو دەقیقەو سەعاتەكانی تەمەنی بێ بەخۆڕایی لەدەستی نەچن، چونكە تەمەن دەستمایەی دەستی مرۆڤە!

2- ئاگای لەو زانیاریو شارەزایی یەی بێت كە خوا پێی بەخشیوە، كە لە ڕۆژی دواییدا زیانی لە قازانجی پتر نەبێو، لێی نەبێتە مەڵۆزم و ڕێی بەهانانی ببڕێو، لەسەری بێتە شایەد!

3- وە ئاگای لەو ماڵو سامانەی بێ كە وەدەستی دێنێو، زۆر چاك بزانێ هەر درەمێك دوو پرسیاری لە سەر دە كرێن یەكیان لە چۆنیەتی پەیداكردنی، ئەوی دیكە لە چۆنیەتی سەرف كرانی!

4- وە ئاگای لە ئەندامەكانی بێو زۆرباش بزانێ سپاردە (أمانة)ی خوانو پێی سپاردوون داخۆ لەچی دا بەكاریان دێنێو چیان پێدەكات!

**ئێستاش دەچینە سەر دووەمین ئەنجامو بەرهەمی بڕوا بە دوارۆژ بوون:**

## 2- جڵەو توندکردنی ئەسپی نەفس[1]:

یەکی دیکە لە ئەنجامو بەرهەمەکانی بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی، ئەوە یە کە مرۆڤ لە سۆنگەی ئەوەوە کە چاوەڕێی لێپرسینەوە (حساب) دە کات، بێدار دەبێتەوەو خۆی گورج دەکاتو بەخۆدا دێتەوە، نەوەك لە دوای یدا ڕووڕەشو شەرمەزار بێو، چاوی لە ئەقار خوادا هەڵنە یەن، خوای زا نا لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿...وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى ۞ فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى﴾ (النازعات: 40-41)، واتە: ....وە بەڵام کەسێك لە ڕاوەستانی پێش (دادگای) پەروەردگاری بترسێو نەفسی لە ئارەزووەکان بگێڕێتەوە، ئەوە بێگومان بەهەشت مەنزڵگایەتی.

وەك دەبینین، خوای مەزن (ترسانی لە ڕۆژی لێپرسینەوە)و (نەفس گێڕانەوە لە ئارەزووان)ی تێك بەستوونو، جڵەو گرتنی نەفسی کردۆتە ئەنجامو بەرهەمی ترسان لە دوارۆژ.

بەڵێ! بەڕاستی هەست کردنی نەفس بەوەی کە ڕۆژێك دێ هەقو حیسابی لەگەڵ بکرێنو بە چوونە بن گڵ هەموو شتێك کۆتایی پێ نایەتو

1- کتێبی (ڕێگای صالح بوون بەرەو خواچوون) تەرخان کراوە بۆ توێژینەوەی مە سەلەی خۆچاککردنو پاککردنەوەی نەفس و صالح بوونو بەرەو خواچوون، بڕوانە چاپی چوارەمی لە نووسینگەی تەفسیر.

(ڕۆژان ڕۆژ یان لە دوان)، چاکترین هۆیە بۆ سەر شکاندنەوەی‌و پرینگاندنەوەی لەو شتانەی ئارەزوویان دەکات‌و لێی قەدەغەکراون، هەر بۆیەش پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **(الدنيا سجن المؤمن وجنّة الكافر)** (رواه مسلم والترمذي ومالك)، واتە: دنیا زیندانی بڕوادارەو بەهەشتی کافرە.

چونکە بابای بڕوادار وەك کەسێك کە لە نێو چوار دیواری حەپسخانەیەکدا حەپس دەکرێ، هەر لای رووی تێدەکات، هەر پەرژین‌و دیوارو سنووری قەدەغەکراوەکانەو، تا ئەندازەیەکی زۆر ئازادیی لێ دەگیرێتەوەو سنووردار دەکرێ، بەڵام بابای بێبڕوا وەك وڵاخێکی بەرهەڵداو بێخاوەن بۆ هەر جێیەك بیەوێ‌و ئارەزووی بکات‌و نەفسی بخوازێ دەچێ، بێئەوەی هیچ کۆسپ‌و لەمپەروتانەو چەپەرو پەرژینی بێنەبەرێ!!

کەواتە لەو ڕووەوە کە بابای گیراو (مسجون) ئازاد نییەو ناتوانێ بە ویستی خۆی ڕەفتار بکات‌و هەرچی پێی خۆش بوو بیکات‌و هەر چی ئارەزووی کرد بیخوات، کراوە بە وێچوێنراو (مشبّه)ی مرۆڤی موسڵمانی بەستراوە بە بەرنامەی خواوەو پابەند بەرێ‌و شوێنی پێغەمبەری پێشەواوە، -عليه الصلاة والسلام- وە لەو ڕووەوە کە بابای بەهەشتی لە هەموو لایەنێکەوە ئازادەو هیچ شتێکی لێ قەدەغە نیەو، هەرچی کەیفی لێ بێ دەیکات‌و، چی ئارەزووی بکات دەیخوات، کراوەتە وێچوێنراوی بابای کافری بێ بەندوبارو بەرهەڵداو هەست بەبەرپرسیاری نەکەر!!

## 3- دنیــا بە کەمگرتن (الزهـد) لە ڕووە ماددی یەکەیـەوە -:

یەکی دیکە لە ئەنجامو بەرهەمە گرنگەکانی بڕوا بە دوارِۆژ بوون بریتیە لە: ژیانی دنیا نەکردنە ئامانجو مەبەستو بەکەم گرتنی، چونکە دنیا بەس پردی بەسەردا ڕەت بوونو، سێبەری لەژێردا حەسانەوەو پ شوودانو، کێڵگەی تۆو تێدا وەشاندنو، ژووری تێدا تاقیکرانەوەیەو هیچ چی دی، وە ژیانی دنیا لەچاو ژیانی دوارِۆژ شتێکی گچکەو نابووتە، خوای بێوێنە لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿... **وَإِنَّ الدَّارَ الآخِرَةَ لَهِيَ الْحَيَوَانُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ**﴾(العنكبوت-62)، واتە: ... وە مەنزڵگای دوارِۆژ ژیانی ڕاستەقینەی تێدایە ئەگەر بزانن، هەروەها فەرموویەتی: ﴿....**فَمَا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ قَلِيلٌ**﴾ (التوبة- 38)، واتە:.... جا ڕابواردنی ژیانی دنیا لە چاو دوارِۆژ بەس شتێکی کەمە.

پێغەمبەریش -علیه الصلاة والسلام- لەوبارەوە فەرموودەی زۆرن، بۆ وێنە (الدنيا لاتعدل عند الله جناح بعوضة) (رواه الديلمي)، واتە: دنیا لەلای خوا باڵە مێشولەیەك ناهێنێ. وە فەرموویەتی: (ما الدنيا في الآخرة إلاّ مثلما يجعل أحدكم أصبعه في اليم فلينظر بم يرجع) (رواه مسلم)، واتە: دنیا

لەچاو دوارِۆژ هەروەك ئەو ئەندازە ئاوە وایەكە بە قامكی كە سێكەوە دێ كە دەیخاتە دەریاوە (لە چاو ئاوی دەریا).

هەڵبەتە هەتا بڕوا بە دوارِۆژ وپادا شتی نەبڕاوەی دوارِۆژ، لە دڵو دەروونی ئینساندا بەهێزتربێ، دیارە ئەندازەی قەنا عەتو بەدنیاو ڕابواردنی دنیاوە ماندوو نەبوونو، دنیا بەكەم گرتن (زهد) زیاتر دەبێ، وە بە پێچەوانەوە هەتا بڕوا بە ڕۆژی دوایی كزتر بێ مرۆڤ بە تەماع ترو ئارەزوو خوازترو بە دنیاوە ماندووتر دەبێ، پێغەمبەریش ﷺ دەربارەی كەسانێك كە زیادەڕۆیی دەكەن لە ڕابواردنی دنیاداو دەیكەنە ئامانجو مەبەستیان، فەرموودەیەكی ترسناكی هەیە: **(إنّ من شرار أمتي الذين غُذّوا بالنعيم يطلبون ألوان الطعام و ألوان الثياب و يَتَشَدَّقونَ في الكلام)** (رواه الطبراني)، واتە: بەڕاستی لە خراپترین ئوممەتم ئەوانەن كە بەنازو نیعمەت پەروەردە كراون، بەدوای خواردنی جۆراو جۆرو جلو بەرگی ڕەنگاوڕەنگدا وێڵن، وە لە قسەكردنێدا فیزو دەمار دەنوێنن (و قسەی قەبەو قەڵەو دەكەن).

بەڵام نابێ لەوە بێئاگابین، كە دنیا بەكەم گرتن[1] (زهد) بەو ئیعتبارە كە ژیانی دنیا پردی بەسەدا ڕەت بوونو جێی تاقیكرانەوەیەو شتێكی كەمە لەچاو بەهەشت، لەگەڵ گرنگی دان بە ژیانی دنیادا، بەو ئیعتبارە

---

1) تا ئێستا وەك دیتوومە وشەی (زهد) بە دنیا نەویستی مانا كراوە، بەڵام هەم لە ڕووی زمانەوە هەڵەیە، وە هەم لە ڕووی ئیسلامەوە، چونكە (زهد) لە ئەسڵی زماندا بە مانای بە كەمگرتن دێ، دیسان ئیسلامیش ڕازی نیە كەس واز لە ژیانی دنیا بێنێ، بەڵكو دەیەوێ مسوڵمان پیاوی هەردووك لایان بێت، بەڵام ژیانی بە كەم بگرێ و نەیكاتە ئامانج.

کە دەرفەتێکە خوای تێدا ڕازی دەکرێو، دە ستمایەیەکە بەهە شتی پێ وەدەست دێ، دژی یەکدی نین، وەك تۆزێکی دیکە باسی دەکەین.

## 4- گرنگیدان بە ژیـانی دنیـا لە ڕووە مەعنەویی یەکەیـەوە:-

وەك لە خاڵی پێشوودا گوتمان ژیانی دنیا نەکردنە ئامانجو مەبە ستو بەکەمگرتنی لەوڕووەوە کە جێی تێدا تاقیکردنەوەیە نەك مانەوە، وە لەو ڕووەوە کە لەچاو ژیانی بەهەشت چاو تروکانێ کەو هیچ چی دی، لە گەڵ گرنگی دان بە ژیانی دنیا لە ڕوویێکی دیکەوەو بە ئیعتبارێکی دیکە تێك ناگیرێن، وەك ئەوەی بڵێین: ئەحمەد پزیشکەو، مەحمود دارتاشە، ئەحمەد لە مەحمود شارەزاترە لە پزیشکیدا، وە مەحمودیش لە ئەحمەد شارەزاترە لە دارتاشیدا.

وەك دەبینین: (شارەزایی)و (نەشارەزایی) لە هەرکام لە ئەحمەدو مەحموددا کۆبوونەوە، بەڵام لە دوو ڕووی جیاو بە دوو ئیعتباری جیا، یان وەك ئەم وێنەیە: دەڵێین ئیسلام فەرمانمان پێدەکات کە لە ئا قار خرا پەدا چاکە بکەین، وەك قورئان فەرموویەتی: **﴿ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾(فصلت -34)**،

وە ئیسلام فەرمانمان پێدەکات کە لە ئاقار مستێدا درێشەی ڕابگرین، وەك قورئان فەرموویەتی: **﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾**(البقرة- 194)، دیارە ئەم دووقسانە بە ڕواڵەت دژی یەکدین، بەڵام کە زانیمان فەرمانی یەکەم بۆ شێوەی ڕەفتاری مسوڵمانانە لە بواری هەڵس‌وکەوتداو، دووەم بۆ شێوەی ڕەفتاریانە لە بواری ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ دوژمناندا، دەزانین کە هیچ جۆرە دژایەتییەك لە گۆڕێدا نیە.

بەڵێ! جا یەکی دیکە لە ئەنجام و بەرهەمە مەزنەکانی بڕوا بوون بە دوارۆژ، بریتیە لەوەی بابای موسڵمان گرنگیی‌و بایەخێکی زۆر بە ژیانی دنیای‌و چرکەو دەقیقەو سەعاتەکانی دەدات، چونکە وەك پێشتریش گوتمان ئەوەندە تەمەنە دیاریکراوەی کە بۆ هەر ئینسانێك دیاریکراوە، سەرمایەو دەستمایەیەتی‌و ئەگەر بازرگانی‌یەکی چاکی پێوە بکات، دەتوانێ بەو تەمەنەی (جا کەم بێ یان زۆر بێ) بەهەشتی بەرین‌و ڕازیکردنی خوا دابین بکات، وە ئەگەر گوێی پێ نەداتو کەمتەرخەمی تێدا بکات، دوو چاری ماڵ کاولی‌و چارەڕەشی دەبێت، خوای بێ پەڵە لەوبارەوە فەرموویەتی: **﴿وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَا أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَالِحًا غَيْرَ الَّذِي كُنَّا نَعْمَلُ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَاءكُمُ .....﴾** (فاطر- 37)، واتە: وە ئەوان (کافرەکان) لەوێدا هاوار دەکەن: پەروەردگارمان دەرمان بێنە، کردەوەی چاك دەکەین نەك ئەوەی کە دەمانکرد (خوا پێیان دەفەرموێ:) ئەدی بە ئەندازەیەکی وا نەم ژیاندن کە هەرکەسێك ویستبای پەند وەربگرێ پەندی تێدا وەردەگرت؟! وە ئەگادارکەرەوەشتان بۆ نەهات؟! دە بیچێژن! ستەمکاران هیچ یاریدەدەرێکیان نیە.

بەڵێ ژیانی دنیا لەو ڕووەوە کە کێڵگەی دوارۆژەو وەرزی تێدا چاندنە، پێویستە مسوڵمان زۆر زۆر بە گرنگ و بایەخ داری تەماشای بکات، بۆیە پێغەمبەر -علیه الصلاة والسلام- فەرموویەتی: **((لاتسبوا الدنیا فنعم مطیة المؤمن))** (رواه الدیلمي)[1]، واتە: جنێو بە دنیا مەدەن، چونکە چاکترین وڵاخی سواری (بە ئامانج گەیەنەری) بڕوادارە.

بەڵێ مرۆڤی مسوڵمان ژیانی دنیا لەو ڕووەوە کە تێیدا تاقی دەکرێتەوەو دەتوانێ بەهەشتی پێ وەدەست بێنێ، زۆر بە گرنگ تەماشای دەکات، بەڵام ئەوەی لەلای مسوڵمان شتێکی هەڵەو ناپەسەندە ئەوەیە کە ژیانی دنیا بکرێتە لووتکەی هەرەبەرزی ئاوات و ئامانج و، بەسەر دوارۆژدا هەڵبژێری، هەڵبەتە ئەوەش خەسڵەتی کافرانە، وەك خوا فەرموویەتی: **﴿وَوَيْلٌ لِّلْكَافِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ۞ الَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا عَلَى الآخِرَةِ....﴾ (إبراهیم: 2-3)**، واتە: وە هاوار بۆ کافران لە ئازارێکی توند، ئەوانەی ژیانی دنیا بەسەر دوارۆژدا هەڵدەبژێرن.



1) بڕوانە (کشف الخفا ومزیل الالباس...) ب2، ل478.

## 5- خۆپاراستن لە ئازاردانی خەڵکی :-

بەرهەمێکی دیکەی بڕوابوون بە دوارۆژ ئەوەیە کە مرۆڤی موسوڵمان چاودێری (مراقبة)یەکی وردو چڕ داوێتە سەر دڵو زمانو چاوو گوێو دەستو لاقیو، ئاگاداریان دەکات کە (خەیاڵێك، وشەیەك، سیلە چاوێك، گوێ هەڵخستنێك، دەستوەشاندنێك، هەنگاوێك)یان[1]، لێنەپشکوێتەوە کە ئازارو زیانی مسوڵمانێکی تێدابێ، چونکە دەزانێ لە دادگای پڕ لە دادی خوادا هەموو شتێك چ گچکە بێ چ گەورە لێپرسینەوەی لە سەرەو، لەم ژیانەدا هەموو وردو درشتی مرۆڤ لە چاکەو خراپە تۆمار دە کرێو، بۆ رۆژی خۆی هەڵدەگیرێ، وەك خودا فەرموویەتی: ﴿**وَوُضِعَ الْكِتَابُ فَتَرَى**

---

1) لە کتێبی (ڕێگای صالح بوون وبەرەو خواچوون)دا چۆنیەتی خۆپاراستن لە خراپەو تاوانو بۆ خوا بەکارهێنانی ئەندامە پەنهانو ڕواڵەتییەکانی ئینسان ڕوونکراوەتەوە، بە تایبەتی لە قۆناغی چوارەم (پارێزکاریی و وردبوونەوە)دا، بڕوانە چاپی چوارەمی لە نووسینگەی تەفسیر.

**الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَا وَيْلَتَنَا مَالِ هَذَا الْكِتَابِ لا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلا كَبِيرَةً إِلاَّ أَحْصَاهَا وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِرًا وَلا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا...﴾**(الانبياء–49)، واتە: وە لیستەی (ی سەرژمێری تاوانان) ڕۆنرا، جا تاوانباران دەبینی لەوەی تێیدایە ترسیان ڕێنیشتوە: ئەی هاوار بۆ ئێمە! ئەو لیستەیە چیە (تاوانی) گچکەو گەورەی نەبواردوەو، تێ کراو سەرژمێر کردوە، وە ئەوەی کردبوویان بە ئامادەیی دیتیان، وە پەروەردگارت ستەم لە کەس ناکات.

دیسان خوای دادگەر فەرموویەتی: **﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ﴾**(الانبياء–47)، واتە: وە تەرازووە (ڕاست و) دادگەرەکان لە ڕۆژی قیامەتیدا ڕۆدەنێین، وە ئێمە بەسین بۆ لێپرسینەوە. هەڵبەتە ئەو تاوانو خراپانەش کە پەیوەندییان بە خەڵکەوە هەیە کە لە زاراوەی شەرعدا پێیان دەگوترێ: (حق الناس) ئەوە لەلای بەشێك لە زانایان تەنانەت بە تەوبەیەکی ساغ (توبة نصوح)یش لاناچنو هەتا ڕۆژی لێپرسینەوە هەر دەمێنن، مەگەر ئەو کەسەی کە خراپەکەی دەربارە کراوە با بەهای تاوانبار ببەخشێو گەردنی ئازاد بکات.

ئینجا سەرباری سزای دواڕۆژ، ئازاردانی خەڵکی دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەو لەنێوبردنی کردەوە چاکەکانیش، بۆ ئەم مەبەستەش ئایەتێكو فەرمودەیەك دەهێنینەوە:

* خوای بە بەزەییو چاکەکار فەرموویەتی: **﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُبْطِلُواْ صَدَقَاتِكُم بِالْمَنِّ وَالأذَى....﴾**(البقرة– 264)، واتە: ئەی ئەوانەی

بڕواتان هێناوه خێرەکانتان بە منەت کردنو ئازاردان (ی دڵی بابای نەدار) بەتاڵ مەکەنەوه.

* پێغەمبەریش -علیه الصلاة والسلام- فەرموویەتی: **((أتدرون مَن المفلس؟ قالوا المفلس فينا من لادرهمَ له وَلا متاع، فقال إنّ المفلِسَ مِن أمتي مَن يأتي يوم القيامةِ بِصلاة وصيام و زكاة، و يأتي وقد شتم هذا، وقذف هذا، وأكل مال هذا، وسفك دم هذا وضرب هذا، فَيُعْطى هذا مِن حَسَناته وهذا من حَسَناته ...))** (رواه مسلم)[1]، واته: دەزانن مایەپووچ[2] کێیە؟ گوتیان: مایەپووچ لەنێو ئێمەدا کەسێکە نە پارەی هەیە نە ماڵ، فەرمووی: مایەپووچ لە ئۆممەتی من کەسێکە ڕۆژی قیامەتێ نوێژو ڕۆژووو زەکات دێنێ (بۆ بەردادگا) بەوانەوە دێ بەڵام لەولا شەوە جنێوی بەم داوەو، بوختانی بۆ ئەم هەڵبەستوەو، ماڵی ئەمی خواردوەو، خوێنی ئەوی ڕشتوەو، لەمی داوە، جا لە چاکەکانی دەدرێ بەمو بەو، ئنجا کە چاکەکانی بڕان پێش ئەوەی قەرزەکانی بداتەوە، لە تاوانەکانی وان (خاوەن قەرزەکان) هەڵدەگیرێو بەسەر وی دادەدرێ، دوایی فڕێ دەدرێتە نێو ئاگر (ی دۆزەخ)ەوه.

---

1) بڕوانە (رياض الصالحين) ی ئیمام نووی، ل 104.

2) مایە پووچ: قەلۆش، هیچ پێنەماو.



## 6- جەرگداریی وفیداکاریی لە ڕێی خوادا:

ئەنجامو بەرهەمێکی دیکەی گرنگو مەزنی بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی، ئەوەیە کە بابای مسوڵمان لە سۆنگەی ئەوەوە کە دەزانێ ئەم ژیانە بەس پردی بەسەردا ڕەت بوونو[1]، نیسێی لەبندا حەسانەوەیەو، مەنزڵگای تێدا مانەوەو نیشتەجێبوون، بەس بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوەو پانو بەرینە، دڵ بەم ژیانە دنیایی‌یە نابەستێو، وەك شتێکی کاتیی تەماشای دەکات، چا

1) لە عیساوە -سەلامی خوای لێ بێ- گێڕراوەتەوە کە فەرموویەتی: (الدنیا قنطرة فاعبروها ولا تعمروها) پێغەمبەرمان -علیه الصلاة والسلام- فەرموویەتی: (... ما أنا في الدنیا الا كراب استظل تحت شجرة ثم راح وتركها) رواه الترمذي، واتە: من لە دنیادا ڕاست وەك سوارێك وام کە لەبن سێبەری درەختێکدا دەسرەوێ، پاشان دەڕواو بەجێی دێڵێ.

بێگومان کەسێکیش ئاوا لەژیانی دنیاوە ڕامێنێ، ترس و خۆ حە شاردان و ڕاکردن لە مردن پەی بە فەرهەنگی مێشکی نابەن!

چونکە لە ڕاستیدا هۆی بنەڕەتی و سەرەکی ترس و ڕاچڵەکین و دڵ لەرزین (لە مردن ترسانە) و ئەمیش ئەنجام و بەرهەمی مسۆگەرو چاوەڕوان کراوی دنیا خۆشویستن و دڵ بە دنیاوە بەندبوونە، وەك ڕابەرمان -علیه الصلاة والسلام- لە فەرموودەیەکیدا دەفەرموێ: **((کیف أنت یا ثوبان إذا تداعت عَلیکم الأمم، کتداعیکم علی قصعة الطعام تصیُبوُن مِنْهُ؟ قال أَ مِن قـلَّةٍ؟ قال لا، أنتم یومئذ کثیر، ولکن یُلقی في قلوبکم الوَهنُ، قالوا وما الوَهنُ یا رسول الله؟ قال حُبُّکُم الدُّنیا وکراهیتکم القِتال)** (اخرجة البیهقي)[1]، واتە: دەڵێی چی ئەی (ثوبان) کە گەلان -ی کافر- داتان هاتنێ و دەورەیان دان، وەك چۆن ئێوە دەوری قاپە خواردنێك دەدەن و دایدێنێ؟ گوتی: ئایا لەبەر کەمییان -مان وامان لێ بە سەردێ-؟ فەرمووی نەخێر، ئێوە لەودەمیدا زۆر دەبن، بەڵام بێهێزیتان داویشتـرێتە نێو دڵی، گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا (بێهێزیی) چیە؟ فەرمووی ئەوەیە کە دنیاتان خۆش دەوێ و جەنگتان -لە پێناو خوادا- پێ ناخۆشـە.

جا ئەوەی ڕاستی بێ بابایەك بڵێ بڕوام وایە کە ژیان بەس ئەم تاقە دەرفەتی ژیانی دنیایە نیەو، ژیانی ڕاستەقینەو تێرو تەواو لەدوا ڕۆژدایە، ئەگەر ڕاست بکات بڕوای وا بێ، نابێ بەهیچ جۆرێك لە مردنێ بسڵەمێتەوە، چونکە ئەو لە ڕێی مردنەوە بەرەو ئەو مەنزڵگایە دەچێ کە ژیانی ڕاستەقینەی لـێیە.

1) بڕوانە (منتخب کنز العمال) ب1، ل189، علی حاشیة مسند الامام أحمد.

بەڵام دوو کەس جێی خۆیەتی لە مردنێ بترسن، یەکەم: بابا یەك کە پێی وایە ژیان بەس ئەم پێنج و دوو ڕۆژەی دنیایەو، بە چوونە بن گڵ هەموو شتێك دەبڕێتەوەو دەبێتە بەردی بن گۆمێ، عارەب گوتەنی (أرحام تدفع وقبور تبلع)!.

دووەم: کەسێك کە تێلەکەی گوناحو تاوان ملی گران کردوەو، دڵنیا یە کە بە ڕووی ڕەش و سەری بەهەشەوە دەچێتە بەردادگای خوا!

کەوا تە: ئەم ئەنجام و بەر هەمی شە شەمە - هەروەها زۆر لە بەرهەمەکانی دیکەش- تایبەتە بە کەسێکەوە کە وێڕای بڕوا هەبوونی بە ڕۆژی دوایی، خۆشی بۆ ئامادە کردبێ، ڕاستتر بڵێم: کە وێڕای دە عوای بڕوا بە دوارۆژ بوون، شایەدی خۆ بۆ ئامادەکردنیشی پێ بێ!

## 7- کات بەفیرۆ نەدانی بە بەلاش:

یەکی دیکە لەو میوەو بەرهەمانەی کە لە درەختی (بڕوا بە دوارۆژ بوون) دەچنرێن بریتیە لەوەی کە بابای بڕوادار دایم ودەرەم لەبیری خۆ ئامادەکردن و کۆکردنەوەی ڕەفتارو کرداری چاکەدا دەبێ، گومانیشی تێدا نیە کە بابایەکی وا هەموو چرکەو دەققەکانی تەمەنی بەکردەوەو جموجۆڵی چاك و پەسەندو خواییانە پڕدەکاتەوەو، بۆشایی و کەلێن و کونی تێدا نامێنن کە بە قسەی پووچ و گاڵتەو جەفەنگ و ڕەفتاری نارێك پڕیان بکاتەوە.

خوای قسە لەجێو میهرەبانیش فەرموویەتی: (﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ﴿ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ ﴿ وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ..﴾ (المؤمنون:1-3)، واتە: بەڕاستی ئەو بڕوادارانە سەرفرازن کە لەنوێژەکەیاندا گەردن کەچ (و دڵ بێدار)نو، ئەوانەی کە لە پووچیی خۆ لادەدەن.

وەك دەبینین خوای زانا دووەمین خەسڵەت کە دەبێتە هۆی بەختەوەری و بەمراد گەیشتنی ئینسانی بڕوادار، بە خۆپاراستن لەو شتانە دادەنێ کە پووچو بێ کەڵکن.

(لغو)ش وەك (راغب الاصفهاني) دەڵێ: (اللغو من الكلام مالا يعتد به وهو الذي يورد لاعن رَوِيَّةٍ وفكر في جري مَجْرى اللّغا و هو صوت العصافير ونحوها من الطيور)[1]، واتە: لەغوو لەقساندا بەو جۆرە دەڵێن کە گوێی پێی نادرێ، ئەویش ئەوەیە کە لە ئەنجامی وردبوونەوەو بیرکردنەوەدا ناگوترێو هەر پێدا دەدرێ، ئەوەش دەچێتە ڕیزی (لغا) وە کە بە دەنگی چوێلەکە پاسارییو ئەو باڵندانەی وەك وین دەگوترێ.

جـا خوێنەری بەڕێز!

(لغو) جۆرو چۆنیەتی زۆری هەن تەنیا شتێكو دووشت نیە، وەتەنیا لە جوغزی قسە (کلام)یشدا کورت هەڵنەهاتوە، بەڵکو بواری کردەوەو هەڵس وکەوتەکانیش دەگرێتەوە، وەك ئەسڵی مانا زمانەوانی یەکەیو ئایەتەکانی قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خواش ﷺ دەلالەتی لەسەر دەکەن، بۆ وێنە خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ الزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَامًا﴾ (الفرقان- 72)، واتە: وە

1) بڕوانە: (مفردات ألفاظ القرآن) ل 451.

ئەوانەی ئامادەی (کۆڕی) درۆو گوناه نابن وه کاتێك بەلای (( پووچ))دا ڕەت بوون بە ڕێزەوه تێدەپەڕن.

لێرەدا وشەی (لغو) زیاتر ڕفتارو کردار دەگرێتەوه هەتا قسەو باس.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: **((كل شي لَيس مِن ذكر الله فهو لَغو أو سَهو الاّ أربع خصال: مَشيُ الرجل بين الغرضين، وتأديبُهُ فَرَسَهُ، ومُلاعِبتُه أهلَهُ، وتَعليُمه السّباحة))** (رواه الطبري بأسناد جيد)، واتە: هەرشتێك پەیوەندی بە یادی خواوه نەبێ ئەوه پووچە یان بێئاگاییە، بێجگە لە چوار شتان:

1- هاتن و چوونی پیاو لە نێوان دوو نیشانەدا - کە بۆ تیرئەندازیی دانراون-.

2- وه ڕاهێنانی ئەسپەکەی بۆ سوار چاك بوون.

3- وه یاری و دەستبازی کردن لەگەڵ هاوسەرەکەی، یان یاری و گەمەکردن لەگەڵ هاوسەرو مندالەکانی دا.

4- وه خەڵك فێری مەلەوانی کردن.

جا لەبەر تیشکی ئەوەدا کە ڕابرد دەتوانین لە پێناسەی (لغو)دا بڵێین: لەغوو بریتیە لە هەر قسەو باس و هەڵس و کەوت و ڕەفتارێك کە هیچ سوودو کەڵکێکی دنیایی و دواڕۆژیی نەبێ و بێجگە لە کات بە سەربردن و تەمەن کوشتن هیچی تێدا بەستە نەبێ.

کەواتە: هەرشتێك لە قسەو کردەوه سوودو کەڵکێکی بۆ دین و ژین نەبێ، لە بوارەکانی ڕووحی و فیکریی و جەستەیی و، تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵییدا، وه لە خودی خۆشیدا حەڕام نەبێ ئەوه بە (لغو) دادەنرێ، یان چاکتر بڵێین: بە (لغو)ێکی خراپ و نەهی لێکراو دادەنرێ.

هەربۆیەش زۆرێك لە زانایان بۆ نموونە (شافعي) یاری شەترەنجیان بە شتێكی موباح داناوە، لە حاڵێكدا كە هاوڕێكانی یان بە حەڕام یان لا نی كەم ناپەسەند (مكروە) زانیوە، چونكە گوتوو یەتی: شەترەنج بەرنا مەو تاكتیكی جەنگو بەرەنگاری تێدایەو جۆرێكە لە پڕاوەو مە شق ( تمرین) پێكردنی بیرو زەین.

هەروەها وەرزش بە هەموو جۆرو شێوەكانی یەوە -مە گەر شتێكی ناشەرعی یان تێدابێ- لە سۆنگەی ئەوەوە كە دەبێتە مایەی بەهێزبوونی ئینسانو دووركەوتنەوەی لە نەخۆشییو لاوازییو سستییو خاویی، بە شتێكی ڕەواو موباحو جاری واش هەیە سوننەتو بگرە فەڕزیش دادە نرێ بەگوێرەی ئەو ئامانجو مەبەستەی كە بۆی ئەنجام دەدرێ.

چونكە خوای كاربەجێ فەرموویەتی: ﴿**وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدْوَّ اللهِ وَعَدُوَّكُمْ ....**﴾(الانفال-60)، واتە: وە هەرچی لە تواناتاندا هەیە هێزیان بۆ ئامادەبكەن وە ئە سپی سازو ئامادە تاكو دوژمنی خواو دوژمنی خۆتانی پێ بترسێنن.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: ((**المؤمن القويّ خيرٌ وأحبُّ الى الله من المؤمن الضّعيف**)) (رواه مسلم)، واتە: بڕواداری بەهێز چاك ترەو لەلای خوا خۆشەویستترە لە بڕواداری بێهێز.

گومانیشی تێدا نیە كە مەبەست لە هێز لێرەدا هێزی جە ستەیە یان هێزی عەقڵو ئیرادەیە نەك هێزی ئیمان.

ئاشكراشە گرنگترین هۆكاری پەیداكردنی هـێز بریتـیە لە مە شقو وەرزشو ڕاهێنان.

مەبەستیشم لەم بڕە ڕوونکردنەوە ئەوەبوو کە هیچکەس بە بیانووی خۆپاراستن لە (لغو) شتی موباحو پەسەند لە خۆیو خەڵکی قەدەغە نەکات.

## خاڵی سێیەم:

## بەڵگەو ئیسپاتی هاتنی ڕۆژی دوایی

خوێنەری سەنگین!

ئەم خاڵی سێیەمە لە دوو کورتە باس پێک هاتوە هەرکامێکیان لە بڕگەیەکی سەربەخۆدا.

یەکەم: سەلماندنی هاتنی ڕۆژی دوایی.

دووەم: بەڵگەی ڕاستی هاتنی ڕۆژی دوایی.

شایانی باسیشە بڕگەی یەکەمیان پێنج بەڵگەو هی دووەم یان حەوت بەڵگەی گرتوونە خۆ وە لەنێوان ئەو پێنج‌و حەوتەشدا لە یەك چوون‌و هەندێك جار وەك یەکبوونیش هەیە، چونکە هەرکامێکیان لە بارودۆخێکی تایبەت‌و جیاوازدا نووسراون، وەك پێشتریش ئاماژەیان پێداوە.

## یەکەم: سەلماندنی هاتنی ڕۆژی دوایی و چەند بەڵگەیەك:

**بەڵگەی یەکەم: هاتنی ڕۆژی دوایی گفت‌و بەڵێنی خوایە:-**

خوای مهرەبان فەرموویەتی: ﴿**وَأَقْسَمُواْ بِاللهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لاَ يَبْعَثُ اللهُ مَن يَمُوتُ بَلَى وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا وَلَـكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ**﴾(النحل– 38)، واتە: وە سوێندێکی پتەویان بە خوا خوارد کە خوا ئەوا نەی دە مرن زیندوویان ناکاتەوە، با! بەڵێنی داوەو ڕاستە، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

بەڵێ مادام خوا گفتو بەڵێنی داوە کە ڕۆژی دوایی دێ و مردوان زیندوو دەکرێنەوە، حەتمەن دەبێ ئەو گفتو بەڵێنە ڕاست بێ، چونکە ئەگەر وانەبێ، ئەوە پەنا بەخوا هەم بەڵێن شکاندنو هەم درۆ، کە دوو سیفەتی خراپو دزێون لە خوادا دێنەدی، بێگومان خوای بەرزو مەزنیش خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو پەسەندەو لە هەموو سیفەتێکی نزمو دزێو بەری یە.

دیسان خوای پەسەند ئاکار چەندان جار لە قورئانی بەڕێزدا ئامۆژگاری کردووین کە لە درۆکردنو بەڵێنو پەیمان شکاندن دوور بین، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَوْفُواْ بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْؤُولاً﴾(الاسراء– 34)، واتە: وە بەڵێنتان بەرنەسەرێ، بەڵێن پرسینەوەی لەسەرە.

**بەڵگەی دووەم: خوا هیچ شتێکی لەبەر عاسێ نابێ:-**

خوای دەسەڵاتدار فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَا أَرَدْنَاهُ أَن نَّقُولَ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾(النحل– 40)، واتە: بێگومان فەرمانی ئێمە کە شتێکمان ویست بەس ئەوەیە کە پێی بڵێین ببە! یەکسەر دەبێ.

وەك لە خاڵی یەکەمدا باسمان کرد زیندوو کرانەوەی مرۆڤانو هاتنی ڕۆژی دوایی شتێکە خوای بەرزو مەزن گفتو بەڵێنی لەسەر داوەو، خواش مەحاڵە گفتو بەڵێنی نەباتە سەر، بەڵام یەکێك بۆی هەیە بپرسێ، با شە ئەوە سەلماندمان کە خوا گفتی داوەو گفتیشی دەباتەسەر، بەڵام کێ دەڵێ خوا توانای بەجێهێنانی هەموو گفتو بەڵێنێکی هەیە؟!

جا لەوەڵامدا دەڵێین:

أ- خوا زانیاری تەواوی بە هەموو شتێك هە یەو د یارە زانیو یەتی کە دەتوانێ ڕۆژی دوایی بێنێتەدی، بۆیە گفتی لەسەر داوەو ئەگەر زانیبای پێی ناکرێ گفتی لەسەر نەدەدا.

ب- بوونەوەرو ئینسان دروستکراوی خوانو، وەك چۆن لە سەرەتاوە توانای بەسەر دروست کردنیاندا شکاوە، دواجاریش دوای تێکچوونو مردن یان توانای بەسەر چاك کردنەوەو ژیاندنەوەیان دا دەشکێ.

کەسێکیش گومانی وابێ خوای بێوێنە ناتوانێ مرۆ ڤـ پاش مرد نی زیندوو بکاتەوەو، بوونەوەر دوای تێکچوونی چاك بکا تەوە، گو مانێکی یەکجار بەدو ناماقووڵی بە خوای بەدیهێنەر بردوە کە تەنانەت لە بابایەکی گۆزەکەریش ناوەشێتەوە چ جای خوای پەروەردگار! چونکە ئێ مە دەب ینین گۆزەکەر ئەگەر بێتو گۆزەکەی لـێ بشکێ لە ئاقار درو ست کردنەوە یدا دەستەوستان نابێو، دەتوانێ لەتکەکانی بهاڕێتو بیانکا تەوە بە قوڕو گۆزەیەکی چاکتریش لەهی پێشوویان لـێ دروست بکاتەوە؟!

خوای زاناش لەوبارەوە فەرموویەتی: **﴿أَوَلَمْ يَرَ الإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ۞ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلاً وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ۞ قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ﴾** (يس: 77ـ 79)، واتە: ئایا مرۆڤـ-لێرەدا مەبەست مرۆڤی بێبڕوایە- نازانێ کە ئێمە لە تۆوێك درو ستمان کردوە، کە چی ئێ ستا بۆ تە دم بەدمەکەرێکی ئاشکرا؟ وە وێنەیەکی بۆ ئێمە هێنا یەوەو، درو ستبوونی خۆی لەبیرچۆوە، گوتی: کێ ئێسقانان دەژیەنێتەوە لە حاڵێکدا کە ڕز یون؟

بڵێ ئەو کەسەی یەکەم جار هێناوینەدی زیندوویان دەکاتەوەو، بە هەموو دروست کردنێکیش زانایە.

**بەڵگەی سێ یەم: تینوو بوونی مرۆ ڤ بۆ داد گەری، بەڵگەی بوونییەتی:-**

خوای زاناو توانا مرۆڤی واهەڵخستوە کە تینووو عەودالّی ئەو شتانەبێ کە حەوجێ یانەو، حەتمەن هەر شتێکیش مرۆڤ پێویستی پێیی هەبێو سروشتی بۆی گرگرتووو تینوو بێ دەبێ هەبێ، چونکە خوا فێڵ لە سروشتی ئینسان ناکات، وای لێ بکات تینووی شتێکی نەبووبێ، بۆ وێنە مرۆڤ تینوو دەبێو جەستەی داخوازی ئاوی لێ دە کات، خواش ئاوی لەدنیای واقیع داخولقاندوە، بۆ وەڵامدانەوەی ئەو داخوازی یە سرو شتی یەی مرۆڤ، کەواتە: تینووبوونی ئینسان بەڵگەی هەبوونی ئاوە، با ئەو ئاوە لە هەموو کاتو جێیەکیش دا بەرچاو نەکەوێ، دەجا هەروەك چۆن جەستەی مرۆڤ تینووو عەودالّی ئاوە، بە هەمان شێوەش و یژدانو سروشتیشی تیـنووو گرگرتووی چە سپاندنی داد گەری یەو، هەموو ئینسانێکی سروشت ساغ هەتا دەمرێ هەر بە هیوای ڕۆژێکە کە تەرازووی دادگەری تێدا دادەنرێوملی ستەمکاران بادەدرێو مافی مافخوراوان دەستێنرێو، پاكو پیس لێك هەڵداوێردرێنو بەرەو جێگاو ڕێگای پڕ بە پێستیان بەڕێ دەکرێن.

جا بێگومان ئەو دادگەرییەی کە ویژدانو سروشتی هەموو مرۆڤێك داخوازی دەکات لەم ژیانە دنیایی یەدا نابینرێ، کەواتە حەتمەن دەبێ

ڕۆژێك هەبێ كەئەو داخوازی یە سروشتی یەی مرۆ ڤی تێیدا جێ بەجێ بكرێو، ئەو تینووایەتی یەی بشكێنرێ، ئەو ڕۆژەش ڕۆژی دوایی یە.

**بەلگەی چوارەم : ژیانی دنیا بێ دواڕۆژ ڕۆمانێكی بێ ئاكامو چیرۆكێكی بێ تامە:-**

بێگومان لەژیانی دنیادا سەدان هەزاران دیمەنو بە سەرهاتی وا دێنە بەرچاو كە وەك ڕۆمانێكی بێئەنجامو چیرۆكێكی بێتامن، بۆ وێنە (كێ)مان لە ژیانیدا چەندان كەسی چاكەكارو خێرخوازی نەدیوە كە هەموو ژیانی تەرخانكردوە بۆ چاكەكاریو خزمەتی خەڵكو وەك مۆمێك خۆی تواندۆتەوە لە پێناوی بەهرەمەندكردنی خەڵكیدا، بەلام لەباتی پاداشت دانەوەو ئافەرین بۆ كردن هەردەم ئامانجو نیشانەی تیرو توانجی ملهوڕو دڕندەخووان بووەو ماڵ ئاواییشی لەژیان كردوە بێ ئەوەی هیچ كەس پێی بڵێ چاكت كرد؟!

دیسان (كێ)مان چەندان كەسی بەدكارو شەڕخوازی نەدیوە كە شەوو ڕۆژی لێك گرێ داون بۆ خراپەكاریو ئازاردانی خەڵكی؟!

دەیان كەسیش هەبوون كە لەسەر ئەو تاوانبارىو بەدكاری یەی چەپلەیان بۆ لێداوەو بارەكەلایان بۆ كێشاوەو دەستیان بۆ لەملی داوە، بەو شێوەیە ژیانی بەڕێ كردوە بێ ئەوەی لە گوڵێ كاڵتری پێ گوترابێ و مافی هیچ ستەم دیدەیەكی لێ ئەستێنرابێ و، دواییش بەمردنی خۆی مردوەو وەك بەرزەكی بانان بۆی دەرچووە؟!

دەباشە ئایا ژیانی هەركام لەو چاكەكارو بەدكارانە ئەگەر ڕۆژی دوایی نەبێ، ڕۆمانێكی بێ تام وچیرۆكێكی بێ ئەنجام نی یە؟! دەی چۆن خوای كاربەجێ ولێزان ڕۆمانێكی بێئاكام و چیرۆكێكی بێ تامی لێ

دەپشکوێتەوە، واتە: چۆن شتێك لە خوا دەپشکوێتەوە کە مرۆڤی گچکەو نابووت پێی ڕازی نیەو بە هەڵەی دەزانێ؟!

کەواتە حەتمەن دەبێ ڕۆژێك هەبێ تەرازووی داد گەری خوای تێدا دابنرێ‌و چاکان‌و خراپان بە پادا شت‌و سزای خۆیان بگەن‌و ویژدانی مرۆڤایەتیش ئاسودەبێ‌و دڵی دابمرکێ‌و، ڕۆمانە بێئاکامەکانیش چاکترین ئاکامیان پەیدابێ، ئەو ڕۆژەش ڕۆژی سزاو پاداشت (یوم الدین)ە.

**بەڵگەی پێنجەم: لە دواڕۆژدا نەبێ چەسپاندنی داد گەری مەحاڵــە:-**

خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿**وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَىٰ بِنَا حَاسِبِينَ**﴾**(الانبياء- 47)**، واتە: وە ترازووە دادگەرەکان لە ڕۆژی دوایدا دادەنێیــن، جاهیچ کەسێك تۆزێك ستەمی لــێ ناکرێ، وە -هەر کردارێك- ئەگەر سەنگی دەنکە خەرتەلەیەکیشی هەبێ دەیهێنینە گۆڕێ، وە ئێمە بەسین بۆ ژماردن‌و پاراستــن-ی کردەوان-.

بەڵێ لە ڕاستیدا داد گەری تەواو کە لە سزادانی تاوانباران‌و چاکەدانەوەی چاکەکاراندا خۆی دەنوێنێ لە دادگای خوای پەروەردگاردا نەبێ نایەتەدی.

با بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست وێنەیەك بێنینەوە: گریمان لە سەر زەوی توانرا دادگایەك پێك بێ کە ئامانجی هەرە بەرزی لە سەر کردنەوەی چەوساوەو بەشخوراوان‌و جەزرەبەدانی طاغووت‌و ستەمکارانە، جا ئێستا با هەندێك لەو ستەمکارو طاغوتانەی دەستیان بە خوێنی خەڵکی چەوساوە سووربووە بیان هێنینە ئەو دادگایەو بزانین چ حوکمێکیان بەبالآ

دەبڕێ کە پڕ بە پێستیان بێ، بۆ وێنە: فیرعەونی میسرو حەججاجی کوڕی یوسفو جەنگیزخانی مەغۆلو هیتلەری ئەڵمانیو ستالینی روو سیاو کەمال ئەتاتۆرکی تورکو جەمال عبدولناصری میسرو سەدامی تکریتیو موحەمەد ڕەزای شای ئێران، دیارە هەرکام لەم ستەمکارە نەگریسانە بوونە هۆی کوشتنی سەدان کەسی بێتاوانو جەرگ سووتانی سەدان دایكو بابو بێوەژن بوونی سەدان ئافرەتو هەتیو بوونی هەزاران منداڵ!!

بێگومان توندترین حوکم کە دادگای گۆرین بە باڵای ئەو طاغووتانەی ببڕێ ئەوەیە کە حوکمی لەسێدارەدانیان دەربکات. بەڵام ئایا بە کو شتنی نەفسێك دەگونجی تۆڵەی سەدانو هەزاران نەفس، لە کوژراوو جەرگ سوتاوو بێوەژن ماوو هەتیو کەوتوو بکرێتەوە؟!!!

بێگومان نەخێر، بەڵام دەزانی دادگای دواڕۆژی خوا چ جۆرە سزایەکی پڕ بەپێست بۆ ئەو جۆرە کەسانە دادەنێ؟! یەکی ملیۆنەها ساڵیان بەباڵا دەبڕێ! واتە بارتەقای تەمەنی ئەو کەسانەی جوانەمەرگیان کردوونو بە ژمارەی هەناسەی ساردی ئەو منداڵانەی هەتیویان کردوونو هێندەی ئەو ئێشو ژانەی بە جەرگو هەناوی ئافرەتانی بێوەژن ماوو دایكو بابانی جەرگ سووتاویان گەیاندوە، سزایان دەدات!

کەواتە: بەڵێ هاتنی ڕۆژی دوایی گفتو بەڵێنی خوای لەسەرەو، خواش هیچ شتێکی پێ زەحمەت نیەو، مرۆیش تینووی داد گەری یەو، ژیانی دنیاش بێ دواڕۆژ وەك ڕۆمانێکی بێ ئەنجامو چیرۆکێکی بێ تام وایەو، لە دواڕۆژیشدا نەبێ دادگەریی تەواو نایەتەدی، کەواتە: حەتمەن دە بێ ڕۆژی

دوایی هەبێ، بۆ ئەوەی دادگەریی بچەسپێ‌و، ژیانی دنیا مانای هەبێ‌و، مرۆڤ تینووایەتی بشکێ‌و گفت‌و بەڵێنی خوداش ڕاست دەربچێ.



## دووەم: حەوت بەڵگە لەسەر ڕاستی هاتنی ڕۆژی دوایی:

خوێنەری بەڕێز!

بەڵگە لەسەر ئەوە کە ڕۆژی دوایی هەقەو دێتو دەچە سپێ زۆرن، جا من لێرەدا ئاماژە بە حەوت لەو بەڵگانە دەکەم، بەڵام بە کورتیو پوختی:

1- خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: کە ڕۆژی دوایی هەیەو دێ، بێگومان خواش بەڵێنی خۆی دێنێتەدیو گفتی خۆی دەبا تەسەر وەك لە سەر زمانی بەندە چاکەکانی فەرموویەتی: ﴿**رَبَّنَا إِنَّكَ جَامِعُ النَّاسِ لِيَوْمٍ لاَّ رَيْبَ فِيهِ إِنَّ اللّهَ لاَ يُخْلِفُ الْمِيعَادَ**﴾[1]، واتە: پەروەردگارمان تۆ خەڵك کۆ دەکەیەوە، بۆ ڕۆژێك کە هیچ گومانی تێدا نیە، بێگومان بەڵێنی خۆی جێبەجێ دەکاتو پێچەوانەی بەڵێنی خۆی ناوەستێتەوە. هەروەها فەرموویەتی: ﴿**إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَاقِعٌ**﴾[2]، واتە: بێگومان ئەوەی بەڵێنتان پێدراوە واقیعەو دێتەدی.

2- دەبێ هەقو ناهەق لەیەك جیا بکرێنەوەو سەرڕاستو لادەران لەیەك جیا بکرێنەوەو هەڵباوێررێن، چونکە لەدنیادا ئەهلی (حەق)و ئەهلی (باطل) تێکەڵنو بە بەڵگە لەیەکدی جیا دەکرێنەوە، بەڵام لە واقیعدا هەر تێکەڵنو زۆرکەس دووچاری چەواشەبوون دەبێو بۆی لەیەك جیا ناکرێنەوە، بۆیە پێویستە ڕۆژێك هەبێ (کا)و (دان)ی تێدا لەیەك هەڵباوێررێن. هەر بۆیەش خوای کاربەجێ ئەو مەسەلەیەی کردۆتە بەڵگەو پاساوی هاتنی ڕۆژی دواییو فەرموویەتی: ﴿**لِيُبَيِّنَ لَهُمُ الَّذِي يَخْتَلِفُونَ فِيهِ**﴾[3]، واتە:

1) (ال عمران- 9).
2) (المرسلات- 4).
3) (النحل- 39).

تاکو بۆیان ڕوون بکاتەوە ئەوەی کە تێیدا کەوتبوونە ڕاجیایی یەوە. (کە ئایا کێ لەسەر هەق‌وکێش لەسەر بەتاڵ بووە!).

ئایا لەم ڕۆژگارەماندا عەلمانییەکان لەسەر هەقن یان ئیسلامییەکان؟! وە ئایا کاتی خۆی: فرعەون لەسەر هەق بوو یان مووسا -علیه السلام-؟ وە ئایا ئیبراهیم لەسەر هەق بوو یان نەمروود؟ وە ئایا بەدرێژایی مێژوو: طاغووتەکان لەسەر هەق بوون یان پێغەمبەرەکان (علیهم الصلاة والسلام)؟! لە ڕۆژی دواییدا دەبێ ئەو هەق‌و ناهەقانە بە تەواوی بۆ تێکڕای خەڵك ساغ‌و ڕوون ببنەوە.

3- بۆ ئەوەی بێ بڕوایان‌و ئەهلی کوفر بۆیان دەربکەوێ کە بەهەڵەدا چوون، وەك خوا -عزّوجلّ- دەفەرموێ: ﴿وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ كَفَرُواْ أَنَّهُمْ كَانُواْ كَاذِبِينَ﴾(1) واتە: وە بۆ ئەوەی کافرەکان بۆیان دەربکەوێ کە درۆیان دەکرد، (لە کاتێکدا دەیانگوت: زیندوو نابینەوە).

4- بەبێ ڕۆژی سزاو پاداشت، بوونەوەرو ژیان هەمووی هۆری پووچی‌و بێحیکمەتیی‌و گاڵتەجاڕیی پێوە دەنرێ، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ﴾(2) واتە: ئایا پێتان وایە بە گاڵتەو بە پووچی ئێوەمان خوڵقاندوەو بۆ لای ئێمە ناگێڕڕێنەوە؟!

ئەم ئایەتە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە ئەگەر ئینسان نەگێڕڕێتەوە بۆ لای خواو زیندوو نەکرێتەوەو لێی نەپرسرێتەوەو سزاو پاداشتی نەدرێتەوە،

---

1) (النحل- 39).
2) (المؤمنون- 115).

مانای وایە ژیانەکەی پووچ و بێماناو گاڵتە جاڕیی بووە، دیارە خوای بەرزو مەزنیش شتی بێحیکمەت و شتی گاڵتەجاڕیی لێ ناوەشێتەوە!

5- یەکسان کردنی بڕوادارو بێ بڕوایان و چاکەکاران و خراپەکاران، زوڵم و ستەم و هەڵەیەو پێچەوانەی دادگەری (عدل)ی خوایەو هەرگیز لە خوا ناوەشێتەوەو شایستەی وی نیە، وەك فەرموویەتی: **﴿أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ﴾**[1]، واتە: ئایا ئەوانەی بڕوادارن و کردەوەی باشیان ئەنجام داوە، وەك ئەوانەیان تەماشا دەکەین کە خراپەکاریی لەسەر زەوی ئەنجام دەدەن؟! یاخود ئایا پارێزکاران وەك تاوانباران لێ دەکەین؟! (بێگومان نەخێرو ناکرێ بخرێنە یەك تەرازووەوە).

6- ئەگەر سەرنج بدەینە ئینسان و ژیان، خوای کاربەجێ هیچ دا خوازی یەکی سروشتیی لە ئینساندا نەخولْقاندووە، لە دنیای واقیعدا هۆ کاری وەڵامدانەوەی ئەو داخوازی یە سروشتی یەی دروست نەکردبێ، بۆ نموونە: ئینسان تینووی دەبێ و خواش ئاوی دروست کردوە، وە ئینسان برسی دەبێ و خواش نان و خۆراکی دروست کردوە، وە پیاو حەزی لە ئافرەتە و خواش ئافرەتی دروست کردوە، وە ئافرەت حەزی لە پیاوە و خواش پیاوی دروست کردوە، وە ئینسان حەزی لە جوانیی دێت، خواش شتی جوانی دروست کردوە، و. . . هتد.

دەجا مرۆڤ حەزیشی بە هەمیشە مانەوە (خلود) دێت، بە بەڵگەی ئەوەی کە (ئیبلیس) وەختێك ویستی (ئادەم)و (حەووا) -علیهما السلام- فریو بدات، لەو ڕێگایەوە بۆیان چوو گوتی: **﴿يَا آدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ**

---

1) (ص- 28).

**عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ وَمُلْكٍ لا يَبْلَى**﴾؟![1]، واتە: ئەی (ئادەم) ئایا درەختێکت پێ نیشان بدەم کە ئەگەر لێی بخۆی هەمیشە هەر بمێنی یەوەو مولکێکت دەست بکەوێ هەرگیز لەنێو نەچێ؟!

کەواتە دیارە هەرمانەوە (خلود) شتێکی خوارسك‌و دا خوازی یەکی سروشتیی‌و قووڵە لە دەروونی ئینساندا‌و پێی خۆشەو حەز دە کات کە لەنێو نەچێ‌و هەمیشە هەر بمێنێتەوە.

ئینجا مادام ئینسان لە دونیادا نامێنێتەوە، دەبێ شوێنێکی دی کە هەبێ کە ئینسان تێیدا بمێنێتەوە، ئەویش بەهەشتە بۆ بڕواداران کە بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە (**خالدين فيها أبداً**)، وەك خوای بێهاو تا لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿**ادْخُلُوهَا بِسَلَامٍ ذَلِكَ يَوْمُ الْخُلُودِ**﴾[2]، واتە: بچنە بەهەشتەوە بە سەلامەتی، ئا ئەوە ڕۆژی مانەوە یەو قۆناغی کۆتایی یە، (کە هەرگیزاو هەرگیز کۆتایی پێ نا یەت‌و نابڕێتەوە بۆ هەرکام لە بڕوادارانی چاکەکارو بێبڕوایانی بەدڕەفتار).

7- ئەگەر سەرنجی بوونەوەر بدەین، دەبینین کە هەموو شتێك لە شوێنی خۆیدا دانراوەو هیچ جۆرە نارێکی یەك لە هیچ دروستکراوێکی خوادا نیەو ئەمە ڕاستی‌یەکە هیچ کەس توانای نکوڵیی لێکردنی نیە، بەڵکو سەرجەم شارەزاو پسپۆڕانی سروشتناس هەرچەندە بێبڕواش بن نکوڵیی لەو ڕاستییە ناکەن، بەڵکو هەموویان بەڕاشکاویی دەڵێن: هەر شتێك کە خوا لەم بوونەوەرەدا دروستی کردوە، یان ئەگەر بڕوایان بە خوا نەبێ دەڵێن: هەرشتێك کە لەم بوونەوەرەدا دروست کراوە هەر هەمووی

---

1) (طه- 120).
2) (ق- 34).

لەجێگای خۆی دایەو ئەگەر بەم شێوەیە نەبووایە کە هە یە بە کەڵك نەدەهات.

جامادام ئەم بوون (وجود)ە هەموو شتێکی لە جێگای خۆ یدا ب یێت، ژیانی ئینسانیش هەر دەبێ وابێ، چونکە ئینسان شاگوڵو هەڵ بژاردەی باغی بوونەوەرە، کەچی ئێمە ژیانی دنیا دەبینین کەوەك شانۆگەری یەك وایە، چەند پەردەیەکی دیارن، بەڵام پەردەو قۆنا غەکانی دی کەی کە بەبێ وان مانای پەیدا نابێ، دیارنین، بۆیە ئەگەر ڕۆژی دوا یی نەبێ، ژیانی دنیاوەك ڕۆمانێکی بێتامو شانۆگەرییەکی بێئەنجام دەردەچێ کە چەند ئالقەیەکی دەبینرێن، بەڵام ئالقەکانی دیکەی ونن!!

بۆ نموونە: ئێمە دەبینین، کە کەسی واهەیە لە ژیانیدا لە خرا پەکاریی ڕاناوەستێ، کە ڕەنگە دەسەڵاتدارێکیش بێ گەلێك کەس پێی هەڵبڵێو دەستی بۆ لە سینگ بداتو چەپڵەی بۆ لێبداتو پشتگیری ناهەق یەکانی بکات، دواییش دەمرێ بێئەوەی هیچ کەس پێی بڵێ پشتی چاوت برۆیە!.

بەڵکو وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچێو بگرە ڕەنگە پاش مردنی شی مەدحو پێهەڵاگوتنی هەر بەردەوام بێو گۆڕەکەشی بکەنە مەزار گە بۆ وێنە: ئەتاتورك! کەچی کەسی واش هەیە کە هەموو ژیانی تەرخان کردوە بۆ چاکەکاریی لەگەڵ خەڵکدا وە هەمیشە لە ژیانیدا لە مەی نەتیو گرفتاریی و چەوسێنرانەوە دایەو کە دەشمرێ، ڕەنگە ڕێ گا نەدەن هەر گۆڕەکەشی دیار بێ، وەك مامۆستا (سەعیدی نورسی)ی -ڕەحمەتی خوای لێ بێ-، کە لە سەردەمی ڕژێمی کەمالی عەلمانیدا، وە فاتی کردو ڕێگایان بە خزمو کەسەکەی نەدا کە لە شوێنێکی دیاریکراویش بینێژن،

بەڵکو ئێستاش نەزانرا کە عەلمانییەکان چیان لە لاشەکەی کردو لە کوێیان ناشت!!

جا مادام ئەوە سەرەنجامی خراپەکاران و چاکەکاران بێت لە دونیادا مانای وایە ژیانی دونیا ناتەواوەو کەم و کوڕی تێدایە، بەڵام وەك گوتمان بوونەوەر هەمووی ڕێك و پێك تەواوە، ئەدی بۆ چی و چۆن دەبێ ژیانی ئینسانەکان ئاوا نارێك بێ و لە سیستەمی بوون (وجود) ڕیز پەڕ بێ؟! کەواتە حەتمەن دەبێ ژیانی ئینسان قۆناغێکی دیکەی بەدوادا بێت، تاکو ماناو نێوەڕۆکی بۆ ئەم قۆناغەی ژیانی دونیای پەیدا بکات!

ئێستاش با سەرنجی ئەم چەند ئایەتانەی خوارەوە بدەین تاکو ببینین چۆن خوای بەدیهێنەر ڕێك و پێکی سیستەمی بوونەوەر دەکاتە بەڵگە لەسەر هاتنی ڕۆژی دوایی. وەك فەرموویەتی: ﴿**أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا ۞ وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا ۞ وَخَلَقْنَاكُمْ أَزْوَاجًا ۞ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ۞ وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاسًا ۞ وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشًا ۞ وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا ۞ وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ۞ وَأَنزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاء ثَجَّاجًا ۞ لِنُخْرِجَ بِهِ حَبًّا وَنَبَاتًا ۞ وَجَنَّاتٍ أَلْفَافًا ۞ إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ كَانَ مِيقَاتًا**﴾[1]، واتە: ئایا زەویمان بۆتان ڕانەخستوە؟! وە چیاکانمان نەکردوون بۆ گوڵمیخ و زەویمان پێ ڕاگیر نەکردوون؟! وە ئێوەمان لە نێرو مێ دروست نەکردوە؟! وە نووستنی ئێوەمان نەکردوە بە مایەی ئاسودەیی تان؟! وە شەوگارمان نەکردوە بە پۆشاکێك و داتان ناپۆشێ؟! وە ڕۆژگارمان نەکردوە بە مایەی زیندەگی و گوزەران؟! وە حەوت ئاسمانی پتەومان لە سەرووتان بنیات

1) (النبأ: 6-17).

نەناوە؟! وە ڕۆژ (خۆر)ێکمان بۆتان دروست نەکردوە کە وەك چرایەکی تیشکدەرە؟! وە لە هەورە گوشراوەکان ئاومان نەناردۆتە خوارێ؟! بۆ ئەوەی کە دانەوێڵەو ڕووەکی پێ بڕوێنین، وەچەندان باغی چڕوپڕی پێ بڕوێنین، (واتە: بێگومان هەموو شتەکان لە شوێنی خۆیان دان) کەوا تە: (**إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ كَانَ مِيقَاتًا**) بێگومان ڕۆژی لەیەك هەڵاواردنو دادگایی کردنیش کاتێکی دیاریکراوی هەیەو حەتمەن دەبێ بێت!

کەواتە: مادام دروستکراوەکانی خوا -عزّوجلّ- هەموویان لەو پەڕی ڕێکوپێکی دان، دەبێ ئەو ڕێكوپێکی (نظام)یە لە ژیانی ئینسانیشدا -کە سەرتۆپی کائیناتە- هەبێو بێجگە لەم ژیانە دنیایی‌یە کاتییو زوو تێپەڕە ژیانێکی دیکەش هەبێ، کە ماناو ئامانجو حیکمەتی بەم ژیانە دنیایی‌یە ببەخشێو نەبێتە چیرۆکێکی بێ مانا!

# خـــاڵی چوارەم:

# پێشـــەکی یە تایبەتی یەکانی ڕۆژی دوایی

# مەرگ و گـۆڕو ژیانی بەرزەخ

خوێنەری بەڕێز!

ئەم خاڵی چوارەمە لە حەوت کورتە باس پێکدێ کە هەر کامێکیان لە بڕگەیەکی سەربەخۆدا دەخەینەڕووو ئەمەش ناوو نیشانەکانیانە:

1ـ ژیانی دنیا ژیانێکی کاتی یەو جێی تێدا تاقیکرانەوەیە.

2ـ مەرگ قیامەتی گچکەیە.

3ـ سەرەمەرگ‌و چۆنیەتی گیان کێشران.

4ـ لە سەرەمەرگدا چی ڕوو دەدات؟!

5ـ چۆنیەتی بەرزکرانەوەی ڕووحی چاکەکاران‌و خراپەکاران.

6ـ گۆڕ (قبر) یەکەمین مەنزڵگای ڕۆژی دوایی یە.

7ـ پرسیارو وەڵام‌و خۆشی‌و ناخۆشی نێو گۆڕ.

دیاره ئەم باسانە هەموویان تێك هەڵكێش‌و پێكەوە پەیوەستن‌و هەندێك جار لەیەك چوونیشیان لەنێواندا هەیە، بەڵام سەرجەمیان وەك ڕێخۆشكەرو پێشەكی وان بۆ ڕۆژی دوایی. بۆیەش سیفەتی (تایبەتی)مان پێوە لكاندوون چونكە هەموو ئینسانێك بەتایبەتی بەشی پێیانەوە هەیەو هیچكەس لێیان هەڵنەوێرراوەو بۆ هیچ كەس هەڵاواردن (استثناء)یان تێدا نیە.

## 1- ژیانی دنیا ژیانێكی كاتی یەوجێی تێپەڕینو تاقیكرانەوەیە:

خوێنەری سەنگین!

ژیانی ئینسان بە چەند قۆناغێكدا تێدەپەڕێ‌و، ئەم ژیانە دونیاییەی كە ئێستا ئێمە تێیداین، یەكێكە لە قۆناغەكانی ژیانی ئینسان‌و، لە پێش ئەم ژیانە دونیایی یەدا، قۆناغی دیكە هەبوون، لە دواشیەوە قۆناغی دی دێن. بەڵێ ئەم ژیانە دونیای یەمان نە یەكەمین قۆناغەو نە دوایین قۆناغیشە، چونكە ئێمە كاتێك بووە كە بە دەقی قورئان، لە شێوەی تۆویلكە (نطفة)دا بووین، لە پشتی بابمان‌و لە سنگی دایكماندا، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ﴾[1] ئەمەیان قۆناغێك، واتە: قۆناغی یەكەمی بوون (وجود)ی ئێمە، ژیانی ئێمە، بە شێوەیەكی زۆر سەرەتایی، ئەوەیە كە ئێمە لە شێوەی تۆویلكە (نطفة)دا لە پشتی بابمان‌و لە سنگی دایكماندا دروست بووین.

1) (الطارق- 7).

قۆناغی دووەمیش ئەوەیە کە لەنێو منداڵدانی دایکماندا، کۆرپە(جنین) بووین، کەواتە ئەم ژیانە دونیایی‌یەی ئێستامان قۆناغی سێیەمە، قۆناغی چوارەمیش قۆناغی مردن‌و خرانە نێو گۆڕو ژیانی بەرزەخە، وە پاشان قۆناغی قیامەت‌و ڕۆژی دوایی دێ، ئنجا قۆناغی کۆتایی دێت، کە بریتیە لە نیشتەجێبوون لە بەهەشتی بەریندا، یاخود لە دۆزەخی بەتیندا، خوا بەهەشتمان پێ ببەخشێ‌و لە دۆزەخیش قوتارمان بکات.

دەربارەی ئەم حەقیقەتەش کە ئەم ژیانە دونیاییە، ژیانێکی کاتی‌یەو بۆ تاقیکردنەوە ڕەخسێنراوە، خوای پەروەردگار لە گەلێك ئایەتی قورئاندا ڕوونی کردۆتەوە. بەڵام من سێ ئایەتم بە نموونە هێناوەتەوە، ئایەتی یەکەم: ئەوە دەگەیەنێ ئەم بوون (وجود)ە هەمووی بۆ تاقیکردنەوەی ئینسان ساز کراوەو ئاسمانەکان‌و زەوی هەموویان شانۆیەکن کە ئینسانیان تێدا تاقی دەکرێتەوە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿**وَهُوَ الَّذِي خَلَق السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاء لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِن بَعْدِ الْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ إِنْ هَـذَا إِلاَّ سِحْرٌ مُّبِينٌ**﴾[1] واتە: خوا ئەو کەسەیە کە ئاسمانەکان‌و زەوی لە شەش ڕۆژاندا خولقاندوون، (واتە بە شەش قۆناغ)، وە ئەو کاتە عەرشی خوا لەسەر ئاو بووە بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە داخۆ کامەتان کردەوەی باشترە، وە ئەگەر پێیان بڵێی: ئێوە دوای مردن زیندوو دەکرێنەوە، ئەوانەی بێبڕوان دەڵێن: ئەوە تەنیا جادوویەکی ئاشکرایە.

ئایەتی دووەم: باسی ئەوە دەکات کە ئەم ژیانی سەر زەوی‌یە شانۆیەکە بۆ ئینسان ڕەخسێنراوە تاکو تێیدا تاقی بکرێتەوە، وەك فەرموویەتی: ﴿**إِنَّا**

1) ( هود 7 ).

**جَعَلْنَا مَا عَلَى الأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلا﴾**(1) واتە: ئێمە هەرچی لەسەر زەوی‌یە کردوومانە بە مایەی جوانیی‌و ڕازاوەیی (زەوی)، تاکو تاقییان بکەینەوە داخۆ کامەیان کردەوەی باشترە، وە هەرچی لەسەر زەوی‌یە، ئێمە دوایی دەیکەین بە پەریزێکی ڕووت.

ئایەتی سێیەم: باسی ئەوەیە کە ژیانی تایبەتی هەر کامێك لە ئێمە بۆ تاقیکردنەوەیە، وەك فەرموویەتی: **﴿تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ۞ الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ﴾**(2)، واتە پایە بەرزیی‌و بەرقەراریی بۆ ئەو پەروەردگارەی کە موڵکی بە دەستەو بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە، ئەو کەسەی کە مردن و ژیانی هێناونەدی بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە کامەتان کردەوەی باشترە، وە هەر ئەو بالاّ دەست‌و لێبوردەیە.

دەربارەی مانای: (**أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً**) زانایان گوتوویانە: (أي أخلَصُهُ وأصَوَبُهُ) واتە: کامتان کردەوەکەی ساغترەو باشترە، کردەوەی ساغ ئەوەیە تەنیا بۆ خوا بێت، ڕاست‌و باشیش ئەوەیە کە بە پێی شەرع‌و ڕێ‌و شوێنی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بێ، کەواتە: کێ بۆ خوا بەندەی چاکتر بێت بەشێوەیەك کە ساغتر بێ‌و چاکترو زیاتر هەوڵی شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ بدات، واتە: هەم ساغکەرەوە (مُخْلِص) بێ بۆ خواو، هەم شوێنکەوتوو (مُتَّبِعْ) بێ بۆ پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام)، ئەوە بێگومان کردەوەکانی ساغترو ڕاستتر دەبن، وە ئینسان هەتا کردەوەی

1) (الكهف: 7 – 8).
2) (الملك: 1 – 2).

ساغترو ڕاستتری هەبێ، بێگومان لە تاقیکردنەوەی ژیانی دونیا، با شتر دەردەچێت، وە ئەنجامو بەرهەمی باشترو چاکتریش بە دەست دێنێت.

## 2- مەرگ قیامەتی گچکەیە:

زانایانو پێشینان گوتوویانە: (من مات فقد قامَت قیامَتُهُ) واتە: هەرکەسێك مرد، بێگومان قیامەتی ئەو هاتووەو ڕۆژی دوایی ئەو ئامادە بووە. بێگومان ئەو قسەیە ڕاستەو ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیە لە سەری: **((كان رجال من الاعراب يأتون النبّي ﷺ فيسألونه عن الساعة، فكان ينظر الى أصغرهم فيقول: إن يَعِشْ هذا لايدرِكهُ الهَرِمُ حتى تَقُومَ عليكم ساعَتُكم))**[1]، واتە: زۆرجار عارەبی خێڵەکی دەهاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ پرسیاریان لێدەکرد دەربارەی ڕۆژی دوایی، ئەویش سەرنجی دەدان، کامەیان لە هەموویان بچووکتر بووایە، دەیفەرموو: ئائەمە، واتە: (بچوکەکەیان) ئەگەر بژیەت، پیر نابێت کە قیامەتی ئێوەدێت.

هەڵبەتە فەرموودەکانی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) تەنیا زانایانی ڕۆچوو وەك پێویست تێیان دەگەن، هەندێ کەس کە لەم فەرموودەیە حاڵی نەبوون، گوتوویانە: پێغەمبەر وای زانیوە کە هەر زوو دونیا تێك دەچێ!! بەڵام نەخێر وا نیە، چونکە ئەو فەرموویەتی: **((إِن يَعِشْ هذا لايدرِكهُ الهَرِمُ حتى تَقُومَ عليكم ساعَتُكم))** واتە: ئەم گەنجەتان ئەگەر بژیەت، پێ ڕاناگات پیر بێت، کە ئێوە هەمووتان دەمرن وە کە مردیشن، قیامەتی ئێوە دێت، چونکە هەرکەسێك مرد ئەوە لەگەڵ وەزعو

1) رواه البخاري ومسلم عن عائشة (رضي الله تعالى عنها).

حاڵو حیسابی خۆیدا ڕوو بەڕوو دەبێتەوەو دە چێتە یەکەمین مەنزڵی قیامەتەوە کە گۆڕەو ژیانی بەرزەخە.

بێگومان هەر ئەوە مەبەستی فەرموودەکەی پێغەمبەری خوایە (علیە الصلاة والسلام) وەك ڕواڵەتەکەیشی بە ڕوونی دەیگەیەنێ.

ئنجا با بزانین مردن (الموت) یانی چی؟! وە (بەرزەخ) چییە؟!

**أ- پێنـاسـەی مەرگ و مـردن:-**

مانای وشەی مردن (الموت) لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا ئاوایە، گوتراوە: (المَوتُ، السكون وكل ما سكن فَقَد مات، ماتت النارُ موتاً أي: بَرَدَ رِمادُها، فلم يبق من الجمر شَيءٌ وماتت الرِّيح أي رَكَدَت وسكنت، والمَيِّت ما لا روح فيه[1])، واتە: مردن بریتییە لە جموجۆڵ نەمان (عەرەب دەڵێن) ئاگرەکە مرد، واتە خۆڵەمێشەکەی ساردبۆتەوەو دەڵێن: (با)یەکە مرد، واتە: ڕاوەستاوەو جووڵەی نایەت، وە مردوو ئەوەیە کە ژیانی تێدا نەبێ.

لە زاراوە (اصطلاح)ی شەرعیشدا زانایان ئاوا پێناسەی مەرگیان کردوە: (انقطاع تعلق الروح بالبدن ومفارقته والحَيلولة بينهما، وتبدّل حالٍ وانتقال من دار الى دار[2])، واتە: مردن بریتییە لە پچڕانی پەیوەندی گیان (روح) لەگەڵ جەستە (هەرکاتێك ڕووح پەیوەندی بەجەستەوە نەما، ئەوە پێی دەگوترێ مردن) وە هەرکاتێك لێك جیابوونەوە، وەشتێك کەوتە نێوانیان، وە حاڵ گۆڕا، وە لەم خانووی دونیاوە گواسترایەوە بۆ خانووی قیامەت ((کە گۆڕ (قبر) یەکەمین مەنزڵو یەکەمین قۆناغی قیامەتە)) ئا ئەوە مردنە.

1) لسان العرب، بەرگی 3، لاپەڕە 547
2) التذكرة بأحوال الموت والآخرة، القرطبي، لاپەڕە 4 .

جا لەبەرئەوە کە مردن بریتیە لە لە یەك جیابونەوەی ڕووح و جەستە بەیەکجاریی و نووستنیش بریتیە لە لە یەك جیابوونەوە یەکی کاتیی و جوزئیی نێوان ڕووح و جەستە، خوای پەروەردگار نووستنیشی هەر بە مردن ناو هێناوەو فەرموویەتی: ﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾[1]، واتە: خوا گیان (روح)ەکان دەکێشێ و وەریان دەگرێ لە کاتی مردندا، ئەوانەش کە نە مردوون لە کاتی نووستندا (ڕووحەکانیان وەردەگرێ و ئەو کەسەی کە دە خەوێ، ڕووحەکەی لە لایەن خوای بەرزو مەزنەوە وەردەگیرێتەوە)، جا ئەگەر (ئەو کەسە) ئەجەل و مۆڵەتی دیاریکراوی هاتبێ، ئەوە بە یەکجاریی ڕووحەکەی وەردەگیرێت (و ناگەڕێتەوە بۆ نێو جەستە، زۆر کەس هەبووە خەوتووەو دوایی یەکجاریی خەبەری نەبۆتەوەو مردووە) وە ئەوەی ئە جەل و مەرگی دیاریکراوی تەواو نەبووبێ (و وەختی نەهاتبێ، خوا) ڕووحەکەی دەنێرێتەوە بۆ نێوجەستەی تا کاتی دیاریکراو، بەڕاستی لەوەدا کۆمەڵێك نیشانە هەن بۆ کەسانێك کە بیر بکەنەوە.

هەر بۆیەش پێشینان گوتوویانە: (المَوتُ نومٌ طويل، والنَّومُ موتٌ قَصيرٌ)، واتە: مردن خەوێکی درێژەو خەوتنیش مردنێکی کورتە. بەڵام بێگومان لەکاتی خەوتندا ڕووح پەیوەندی یەکجاریی ناپچڕێ لەگەڵ جەستەدا بەڵکو تەنیا عەقڵ و هۆشی لا نامێنێ و پێنج هەستەکانی ئیش ناکەن و کۆمەڵێك لە دەزگاکانی لەکار دەکەون، وە ڕووحیش لەکاتی خەوتندا بۆ خۆی دەگەڕێ، ئینسان خەو دەبینێ و هەندێ زانیاری دەست دەکەوێ، بەڵام یەکجاریی

1) (الزمر- 42).

پەیوەندی لەگەڵ جەستەدا هەر ناپچڕێ، بەڵام ئەگەر خوا عزّو جلّ- فەرمانی لەسەر بوو کە ڕووحەکە نەچێتەوە نێو لاشەکەی ئەو پەیوەندی یە جوزئی یەش کە ماویشیەتی (کە هەندێ لە دەزگاکان ئیش دەکەن، وەك دڵو هەناسەدانو باقی کۆئەندامەکانی دیکە) یەکجاریی ئەو پەیوەندی یەش دەپچڕێو سەرجەم کۆئەندامەکان لەکار دەکەونو مردن ڕوودەدات.

**ب ـ پێناسەی ژیانی بەرزەخ:**

وشەی (برزخ) واتە: (حاجِز، حاجِب) نێوانو پەردە لە نێوان دوو شتدا، وەك خوای زاناو شارەزا لەبارەی پەردەو دیواری نێوان ئاوی سوێرو شیرین فەرموویەتی: ﴿**وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَّحْجُورًا**﴾(1)، واتە: لە نێوانی دوو ئاوەکان (شیرین وسوێر)دا پەردەیەکی داناوە، وە نێوانێکی داناوە کە پارێزراوە.

لە زاراوی شەرعیشدا لە پێناسەی ژیانی بەرزەخدا گوتراوە: (البرزخ، الدار تعقب الموت الى البعث)(2)، واتە: بەرزەخ بریتیە لەو قۆناغەو لەو ژیانەی کە بە دوای مردندا دێت، تاکو ڕۆژی قیامەت پێی دەگوترێ بەرزەخ، بۆیەش وای پێ دەگوترێ، چونکە ژیانی دوای مردن ژیانێکەو قۆناغێکە لە نێوان دونیاو قیامەت دایەو پەردەیە کە لە نێوانی هەردووکیان دایە.

خوای پەروەردگاریش لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿**وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ**﴾(3)، واتە: لە دوای ئەم ژیانە دونیایی یەیانەوە کە دەمرن،

1) (الفرقان- 52).
2) التذكرة/ للقرطبي، لاپەڕە 177 .
3) (المؤمنون- 100).

پەردەو نێوان (برزخ) ێك هەیە، تاكو ڕۆژی دوایی كە زیندوو دەكرێنەوە. (واتە: لەو نێوانەدا دەمێننەوە كە نە دونیایەو نە دوارۆژیشە).

(ابن القیم الجوزی) لەوبارەوە كە مەبەست لە ژیانی بەرزەخ ژیانی دوای مردنە گوتوویەتی: (عذاب القبر ونعیمه اسمٌ لعذاب البرزخ ونعیمه، و هو مابین الدنیا والآخرة، قال تعالی: (**وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ**) وهذا البرزخ يُشرِفُ أَهلُهُ فيه على الدُّنيا والآخرة)[1]، واتە: ئازارو ئەشكەنجە یان خۆشی و نیعمەتی گۆڕ ناوە بۆ ئازارو نارەحەتی یان خۆشی و نیعمەتی قۆناغی بەرزەخ كە دەكەوێتەوە نێوان ژیانی دونیاو دوارۆژەوە وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: (**وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ**)، پاشان (إبن القیم) دەڵێ: وە خەڵكی قۆناغی بەرزەخ هەم سۆراغی دونیاو قیامەتیش دەكەن.

ئنجا بێگومان مەرگ و مردن شتێكی حەتمی‌یەو هیچ كەس لێی قوتار نابێ، وەك خوای بێوێنە فەرموویەتی: ﴿**قُلْ إِنَّ الْمَوْتَ الَّذِي تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُ مُلَاقِيكُمْ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ**﴾[2]، واتە: پێیان بڵێ: ئەو مردنەی كە لێی ڕادەكەن، حەتمەن دەتانگرێ، پاشان دەگێڕرێنەوە بۆ لای (خوای) زانای پەنهان و ئاشكرا، وە هەواڵتان پێ دەدات بەوەی كە دەتانكرد.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿**كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ الْمَوْتِ**﴾[3] هەموو نەفسێك دەبێ مردن بچێژێ، هەروەها بە پێغەمبەری ﷺ فەرمووە: ﴿**إِنَّكَ مَيِّتٌ**

1) الروح، لابن القیم.
2) ( الجمعة- 8 ).
3) ( آل عمران- 180 ).

﴿وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ﴾[1]، واتە بێگومان تۆش دە مری و ئەوانیش دە مرن. وە بێگومان مردن کاتێکی دیاری کراوی هەیە، مردنی هەموو کەس، نە چرکەیەك پێش دە کەوێ و نە چرکەیەکیش دوا دە کەوێ وەك خوا فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا جَاء أَجَلُهُمْ لاَ يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلاَ يَسْتَقْدِمُونَ﴾[2]، واتە: ئەگەر کاتی خۆیان هات تەنانە کاتێکی کەمیش نە پێش دە کەون و نە دوا دەکەون. وە فەرموویەتی: ﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَنْ تَمُوتَ إِلاَّ بِإِذْنِ اللهِ...﴾[3]، واتە: هیچ نەفسێك بۆی نیە بمرێ مەگەر بە فەرمانی خوا، لە کاتی دیاری کراوی خۆیدا.

بەڵام دیارە ئەو کاتە دیاری کراوە، شێرراوەو پەنهانەو خوا نەبێ کەس نایزانێ و یەکێ کە لە پێنج شتە پەنهانەکان وەك خوای عزّو جلّ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾[4]، واتە: خوا زانیاری ڕۆژی قیامەتی لایەو باران (کە خەڵك زۆر چاوەڕوانی دەکات و لە خوا داوای دەکەن و زەوی و زاریان تێر ئاو دەکات و کانی و کانیاویان بۆ زیندوو دەکاتەوە) دەنێرێتە خوارێ، وە ئەوەی کە لە منداڵدان (رَحِم)ەکان دایە دەیزانێ (کە ئایا چۆن دەبێ! کافر، یان بڕوادار، چاکەکار، یان بەدکار، تەمەنی چۆن دەبێ، ڕەوشت و ئاکاری چۆن دەبێ، ڕزق و ڕۆزیی چۆن دەبێ) وە هیچ کەسێك نازانێ کە بەیانی چی

1) ( الزمر- 30 ).
2) ( النحل- 61 2 ).
3) ( آل عمران- 145 ).
4) ( لقمان- 3 ).

دەكات، وە هیچ كەس نازانێ لە چ زەوی‌یەكدا دەمرێ (و مەرگی دەگاتە سەر) بێگومان هەر خوا بە هەموو شتێك زاناو شارەزایە.

## 3- سەرەمەرگ‌و چۆنیەتی گیان كێشران:

خوای پەروەردگار لە زۆر شوێنی قورئاندا باسی حاڵەتی سەرەمەرگ‌و چۆنیەتی گیان كێشرانی كردوە، بۆ وێنە فەرمووویەتی: **﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ﴾**(1) واتە: خوا گیانەكان دەكێشی، وە فەرموویەتی: **﴿قُلْ يَتَوَفَّاكُم مَّلَكُ الْمَوْتِ الَّذِي وُكِّلَ بِكُمْ ثُمَّ إِلَى رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ﴾**(2) واتە بڵێ: فریشتەی مردن كە پێتان سپێرراوە گیانتان دەكێشێ، دوایی بۆ لای پەروەردگارتان دەگێڕرێنەوە.

وە فەرموویەتی: **﴿وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ وَيُرْسِلُ عَلَيْكُم حَفَظَةً حَتَّىَ إِذَا جَاء أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لاَ يُفَرِّطُونَ﴾**(3)، واتە: خوا باڵادەستە بەسەر بەندەكانی‌یەوە وە فریشتەكان دەنێرێتە سەرتان‌و دەتانپارێزن، هەتا ئەگەر یەكێكتان مردنی گەیشتە سەر، فریشتە نێردراوەكانمان گیانی دەكێشن بێ‌ئەوەی كە كەمتەرخەمی تێدا بكەن. بۆیە ئەم سێ ئایەتەم پێكەوە هێنان چونكە ڕەنگە یەكێك بپرسێ: بۆچی لە ئایەتی یەكەمدا

1) ( الزمر- 42 ).
2) ( السجدة- 11 ).
3) ( الانعام- 61 ).

دەفەرموێ خوا گیانەکان دەکێشێ‌و لە ئایەتی دووەمدا دەفەرموێ فریشتەی مەرگ (ملك الموت) دەیانکێشێ‌و لە ئایەتی سێیەمدا دەفەرموێ: فریشتەکان؟!

دیارە ئەگەر ئینسان بە سادەیی تەماشای ئەو ئایەتانە بکات، دەڵێ: باشە ئایا ئەم ئایەتانە دژی یەکتری نین؟! بەڵام ئەگەر قووڵ سەرنج بدەین دەڵێین: نەخێر، چونکە لە لایەکەوە خوا  عزّوجلّ- گیانەکان دەکێشێ‌و بەبێ فەرمانی خوا (ملك الموت) جووڵە ناکات وخوا عزّوجلّ- فەرمانی پێدەکات کە فلان کەس کاتی گیان کێشرانی هاتوە، ئنجا فریشتەی مەرگ دەجووڵێ‌و فەرمان دەکات بەو فریشتانەی کە لەبەر دەستنی‌و ئەوان دەچن راستەوخۆ گیانی ئەو کەسە دەکێشن.

واتە: بەفەرمانی خوایەو لەژێر چاودێری فریشتەی مەرگدا یەو فریشتەکانیش جێبەجێی دەکەن وئایەتەکان هەریەکەیان باس لە لایەنێکی گیان کێشان دەکەن.

دەربارەی چۆنیەتی رووح کێشرانیش، خوای باڵادەست لە چەند شوێنێکدا روونی کردۆتەوەو کە چۆنە؟ بۆ وێنە فەرموویەتی: **﴿فَلَوْلَا إِذَا بَلَغَتِ الْحُلْقُومَ ۞ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ۞ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَكِن لَا تُبْصِرُونَ ۞ فَلَوْلَا إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ۞ تَرْجِعُونَهَا إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾**[1]، واتە: (ئەگەر راست دەکەن، ئێوە لەبەردەستی خوادا نین) ئەدی بۆچی کاتێك کە (رووح) دەگاتە گەروو، وە ئێوە تەماشا دەکەن، ئێمەش لە ئێوە لێی نزیکترین، بەڵام ئێوە نابینن، (واتە: فریشتەکان، ئەو

1) ( الواقعة: 83  87 ).

فریشتانەی کە گیانی ئەو کەسە دەکێشن)، ئەگەر ئێوە لەبەردەستی خوادا نین، دەبووایە ئەو گیانە بگێڕنەوە بۆ نێو جەستەکەی.

کەواتە خوا -سبحانه وتعالى- خۆی ئەو گیانەی بەبەر جەستەدا کردوەو هەرکاتێك خواش فەرمانی کرد کە دەربێت، یەکسەر دێتەدەر، بەڵام ئەگەر خوا فەرمان نەکا، بە هیچ نایەتە دەرێ، وە ئەگەر فەرمانی خواش لە سەر هاتنە دەری بێت، بێگومان بە هیچ کەسێك ناچێتەوە ژوورێ!

وە لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرمویێ: ﴿كَلا إِذَا بَلَغَتِ التَّرَاقِيَ ۞ وَقِيلَ مَنْ رَاقٍ ۞ وَظَنَّ أَنَّهُ الْفِرَاقُ ۞ وَالْتَفَّتِ السَّاقُ بِالسَّاقِ ۞ إِلَى رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ الْمَسَاقُ﴾[1]، واتە: نەخێر، ڕاست ناکەن، با واز بێنن، کاتێك (ڕووح) گەیشتە ئێسقانەکانی دەوری گەردن وە گوترا: کێ هەیە لە فریای بێتو چارە سەرێکی پێ بێت؟! ئەو کەسە بۆ خۆشی دەزانێ کە تازە کۆتایی بە ژیانی دونیای هاتوەو جیا دەبێتەوە (لە دۆستو خزمو کەسو کاری کە دەوریان لێ داوە) وە لاقەکان (قاچەکان)ی تێکەوە پێچ چران، لەو ڕۆژەدا گیانەکەی بەرەو پەروەردگارت بەرێ دەکرێ.

وەلە شوێنێکی دیکەش داوەسفی ئەو فریشتانەمان بۆ دەکات کە گیان دەکێشنو دەفەرموێ: ﴿وَالنَّازِعَاتِ غَرْقًا ۞ وَالنَّاشِطَاتِ نَشْطًا ۞ وَالسَّابِحَاتِ سَبْحًا ۞ فَالسَّابِقَاتِ سَبْقًا ۞ فَالْمُدَبِّرَاتِ أَمْرًا﴾[2]، واتە: سوێند بەو فریشتانەی کە زۆر بە توندی (ڕووحی تاوانبارو بێبڕوایان) دەردەکێشن (لە جەستەیان) وە بەو فریشتانەی کە (گیانی بڕواداران) بە نەرمو نیانی دەردەکێشن (لە جەستەیان وەکو چۆن موو لە ماست دەردەهێنرێ

1) ( القيامة: 26-30 ).
2) ( النازعات: 1-5 ).

ئاوا بە نەرمی دەری دەکێشن)، ئنجا دوای ئەوەی کە گیانەکانیان دەرکێشرا مەلە دەکەن وە بەنێو هەوادا دەفڕن و زۆر بەخێرایی و پێشبڕکێ وەدەڕۆن، (تاکو ئەو گیان (ڕووح)ە دەگەینە شوێنی خۆی). پاشان کاروباری ئەو گیانە کێشراوانە بەڕێوەدەبەن (واتە: بەو جۆرە کە خوای کاربەجێ بۆی دیاری کردوون و فەرمانی پێکردوون، دەکەونە سەرەوبەرەکردن و سەرپەرشتی کردنی گیانەکان و دانانی هەرکامێکیان لە شوێنی خۆیدا).

## 4- لە سەرەمەرگ دا چی ڕوودەدات؟!

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە سێ دیاردەی حاڵەتی گیان کێشران و سەرەمەرگ دەخەینە ڕوو:

أ- لە حاڵەتی سەرەمەرگ دائینسان تووشی ئازارو نارەحەتی زۆر دەبێت، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿**وَجَاءَتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ ذَلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ**﴾[1]، واتە: کاتێك کە بێ هۆشیی و نارەحەتی مەرگ بەڕاستی هات (بە بابای کافر یان گوناهبار دەگوترێ) ئەوە ئەو شتەبوو کە تۆ خۆت لێی لادەدا!

پێغەمبەریش (عليه الصلاة والسلام) لەسەرە مەرگدا فەرمووویەتی: (**لا اله الا الله، إنَّ للموت سَكَرات**)[2]، واتە: جگە لەخوا پەرستراوی دیکە نین بەڕاستی مەرگ بێ هۆشیی و ئاگا لەخۆ نەمان و ئێش و ئازاری زۆری هەیە.

---

1) ( ق- 19 ).

2- البخاري عن عائشة رضي الله عنها.

ئنجا ئایا کێ ئێش‌و ئازار (سکرة)ی مردنی تووش نابێ؟! ئەوەی لە فەرموودەکان دابۆ ئەو مەبەستە ئاماژەی بۆ کرابێت، شەهیدی ڕێ گای خوایە، لەوبارەوە پێغەمبەر (علیه الـ صلاة والـ سلام) فەرموو یەتی: **((الشهيد لايَجِدُ أَلَمَ القَتلِ الاّ كما يَجِدُ أحدكُم أَلَمَ القُر صَةِ))**، وا تە: شەهید هەست بە ئازاری کوژران ناکا، مەگەر ئەوەندە کە یەکێکتان هەست بە ئازاری گەزران دە کات، وا تە: وەك ئەوە کە یەکێك مێرووولەیەك، یان قالۆنچەیەك دەیگەزێ، یاخود شتێکی بچووك پێیەوە دەدات، شەهیدیش هەر ئەوەندە هەست بە ئازاری کوژران دە کات، ئەگەر نا جگە لە شەهید وادیارە کە هەموو کەس هەست بە ئازاری سەرەمەرگ دەکات‌و مردن سزاو ئێش‌و نارەحەتی هەر هە یە، بەڵام وادیارە هەتا ئینسان کافرترو گوناهبارترو خراپەکارتر بێت، ڕووحەکەی بەزەحمەت تر لە جەستەی جیا دەبێتەوەو زیاتریش نارەحەتی دەبی نێ، وە بە پێچەوانەوە ئەگەر ئەهلی ئیـ مان‌و تەقوابێ. کەمتر ئێش‌و نارەحەتی دەبینێ، وەکاتێك فریشتەکان دەبینێ‌و دەزا نێ کە بەرەو بەهەشت دەچێ، زۆر هەست بە ئازارو نارەحەتی‌یەکەی ناکات.

ب- لە سەرەمەرگدا مەگەر چۆن، دەنا ئینسان پێی خۆشە نەمرێ‌و جارێ هەر لەدونیادا بێ‌و وازی لـێ بهێنن، بەڵام د یارە بە زۆری کافرو گوناهباران ئاوان، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (**حَتَّى إِذَا جَاءَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ ۞ لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ كَلاَّ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ**﴾[1]، واتە: هەتا کاتێك یەکێك لە بێبڕوایان مردنی دەگاتە سەر، دە ڵێ پەروەردگارم

1) ( المؤمنون 99-100 ).

بمگێڕنەوە (بۆ دونیا باجاریٚ نەمرم) بەڵکو کردەوەی باش بکەم لەو (ژیانی دونیای)ە کە بەجێم هێشتوە، یاخود خەریکم بەجێی بهێڵم (بەڵام پێی دەگوترێ) نەخێر، بێدەنگ بە، ئەو قسەیە (کە دەڵێ بمگێڕنەوە) قسەیەکە هەر بۆ خۆی دەیکا(و کەس بایەخی پێ نادات و لێی وەرناگرێت) وە لە پشتیانەوە پەردەیەك هەیەهەتا ڕۆژی زیندووکرانەوەیان.

ج- لە سەرەمەرگدا، ئەگەر ئینسان مسوڵمان و ئیمانداربێ، پێی خۆشە زوو بڕوات بۆ خزمەتی خوای بەرزو بێوێنە، وە ئەگەر خراپەکاربێ پێی خۆشە نەچێ وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: **((مَن أحبَّ لقاء الله أحبَّ الله لِقاءه ومن كَرِهَ لقاء الله كَرِه الله لقاءه))**[1]، واتە: هەر کەسێك حەز بە دیداری خوا بکات، خواش حەز بە دیداری دەکات، وە هەرکەسێکیش پێی ناخۆش بێ بە دیداری خوا شاد بێت، خواش دیداری وی پێ ناخۆشە. (عائشة) خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا (کُلُّنا نَکرَهُ المَوتَ) هەموومان مردنمان پێ ناخۆشە! ئەویش فەرمووی: مەبەست ئەوە نیە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە ئینسانی ئیماندار (جاری وایە پێش سەرەمەرگ، جاری واشە دوای سەرەمەرگ) شوێنی خۆی لە بەهەشت نیشان دەدەن، ئەویش دەڵێ: پەلە بکەن زوو بمبەن، بۆ لای پەروەردگارم!، (چونکە پەرێزی پاکەو بەرهەمی چاکەو بەرچاوی ڕووناکە، پێی خۆشە زوو بڕوا) ئەوە حەز بە دیداری خوا دەکات، خواش حەز بە دیداری دەکات، بەڵام ئەوەی دیکە کە دەزانێ پەرێزی پیسەو دەزانێ بەرەو کوێی دەبەن، ئەوە چاوو ڕووی نیە کە بچێتە خزمەت و دیداری

1) رواه البخاري عن عائشة -رضي الله عنها-.

خوا، بۆیە حەز دەکات جارێ نەمرێو ئەگەر گیانیـ شی کێ شرا حەز ناکات بەرزی بکەنەوە بەرەو لای خوا -سبحانە وتعالی-.

وەکو لە فەرموودەیەکی دیکە هاتوە: ((**اذا وضِعَتِ الجِنَازَةُ فأحتمـلها الرِّجالُ على أعناقهم، فأن كانَت صالحةً قالت: قَدِّموني، وإن كانَت غَيرُ صالحةٍ قالَت: يا ويلَها أين يَذهَبون بها؟! يَسمَع صَوتَها كلُّ شيء الاّ الأنسان ولو سَمِعَهُ الأنسان لصعق**))[1]، واتە: کاتێك کە جەنازە دادەنرێو پیاوان هەڵی دەگرنو لەسەر شانو مـلی خۆ یانی دادە نێن (و بەرەو گۆڕستان دەیبەن) ئەگەر بابایەکی پاكو چاك بووبێ، دەڵێ: پێشمخەن و زوو بمبەن، بەڵام ئەگەر بابایەکی خراپو بەدکار بوویێت، دە ڵێ: داخو خەفەت بۆ من، بۆ کوێی دەبەن؟! هەموو شتێك دەنگەکەی دەبیـ ستێ، جگە لە ئینسان، وە ئەگەر ئینسان دەنگی ئەو مـردووە خرا پەکارە ببیستێ (کە هاوار هاوار دەکات) بێگومان لە هۆش خۆی دەچێ.



1) رواه البخاري .

## 5- چۆنیەتی بەرزکردنەوەی ڕووحی چاکەکاران و خراپەکاران:

لەوبارەوە ئەم فەرمموودەیەی پێغەمبەری خوای ﷺ دێنینەوە کە بە تێرو تەسەلی باسی ئەو بابەتە دەکات و لە زۆر ڕووەوە ڕوونی دەکاتەوە.

جا ئێمە سەرەتا دەقی فەرمموودەکە دێنین هەرچەندە درێژیشە پاشان مانای دەکەین:

(عن البراء بن عازبٍ رضي الله عنه قال:

**خرجنا مع النبّـي ﷺ في جِنازة رجُلٍ من الأنصار فانتهينا الى القَبر ولمّا يُلحَد، فجلس رسول الله ﷺ (مستقبِل القبلة) وجَلَسنا حوله. وكأنَّ على رؤوسنا الطيّر وفي يده عُودٌ ينكتُ في الأرض، (فجعل ينظر الى السماء وينظر الى الأرض، وجعل يَرفَعُ بَصَرَهُ و يَخْفِضُهُ ثلاثاً) فقال: استعيذوا بالله من عذاب القبر مرَّتَيْنِ أو ثلاثاً، (ثم قال: اللهم إني أعوذ بك من عذاب القبـر) (ثلاثاً) ثم قال: إن العَبْدَ المؤمن اذا كان في انقطاع**

من الدنيا وإقْبالٍ من الاخرة، نزل اليه ملائكة من السماء، بيضُ الوجوه. كأنّ وجوههم الشمس، معهم كَفَنٌ من أكفان الجنة وحنوطٌ من حنوط الجنة، حتى يجلسوا منه مَدَّ البصر ثم يجئُ ملك الموت -عليه السلام- حتى يَجْلِس عند رأسه فيقول: أيتها النفس الطيّبة (وفي رواية: المطمئنة) أخرجي الى مَغفرة من الله ورضوان، قال: فتخرج تَسِيلُ كما تسيلُ القطرة من في السقاءِ فيأخذها. (وفي رواية، حتى اذاخَرَجْت روحُهُ صلّى عَليه كلّ ملكٍ بين السماء والأرض، وكلّ ملكٍ في السماءِ، وفتحت له أبوابُ السَّماءِ لَيْسَ من أهل بابٍ الاّ وهم يدعون الله أن يُعْرَجَ بِروحِه مِنْ قِبَلِهِمْ)، فأذا أخذها لم يَدعوها في يدِهِ طرفة عينٍ حتى يأخذوها فيجعلوها في ذلك الكَفَنِ، وفي ذلك الحنوط، (فذلك قوله تعالى: توفّتْهُ رُسُلنا وهم لايُفَرّطون)، ويخرج منها كأطيب نَفْحَةِ مِسْكٍ وجَدتْ على وجه الأرض، قال: فَيَصْعَدون بها فلايمرّون -يعني بها- على مَلأٍ من الملائكة الاّ قالوا: ما هذا الروحُ الطيّبُ؟ فيقولون: فلان إبن فلان بأحسن أسمائه التي كانوا يُسمُّونَه بها في الدنيا. حتى ينتهوا بها الى السماء الدنيا، فَيستفتحون له، فَيُفْتَحُ لهم. فَيُشَيّعُهُ من كل سماءٍ مُقرَّبوها الى السماء التي تليها، حتى ينتهي به الى السماء السّابعة، فيقول الله -عزّوجلّ-: اكتبوا كتابَ عَبْدي في عِلّيين، (وما أدراك ما عِليّون * كتاب مرقوم * يَشهده المقرَّبون) فيُكتَبُ كتابه في عِلّيين) ثم يقال: أعيدوهُ الى الأرض، فأني (وعدتهم أني) منها خلقتهم وفيها أعُيدهم ومنها أُخرجُهُم تارة أخرى، قال: فـ(يُرَدُّ الى الأرض، و) تُعادُ رُوحُهُ في جَسَده، (قال: فأنه يسمَع خَفْق نعال أصحابه اذا ولّوا عنه) (مُدْبرين)، فيأتيه مَلَكانِ (شديدا الأنتهار) فـ(ينتهرانه، و) يُجْلِسانِهِ،

فيقولان له: مَنْ ربُّكَ؟ فيقول: ربِّي الله، فيقولان له: ما دِينُك؟ فيقول: ديني الأسلامُ، فيقولان له: ما هذا الرجل الذي بُعِثَ فيكم؟ فيقول، هو رسول الله ﷺ، فيقولان له: وما عَمَلُكَ؟ فيقول: قرأتُ كتاب الله، فآمنتُ به وَصدَّقْتُ، فينتهره فيقولُ من ربكُ؟ ما دينكَ؟ من نبيُّكَ؟ و هي آخر فِتْنةٍ تُعْرَضُ على المؤمن فذلك حين يقول الله عزّوجلّ: (يثبت الله الذين آمنوا بالقول الثابت في الحياة الدنيا)، فيقول: ربيّ الله و ديني الإسلام و نبيّي محمد ﷺ فيُنادي مُنادٍ في السماء: أن صَدَق عَبْدي فأفرشوه من الجنّة، وألْبِسوه من الجنّة، وافتحوا له باباَ الى الجنّة. قال: فيأتيه من رَوْحِها وطيبها ويُفْسَحُ له في قبره مَدَّ بصيرِه، قال: ويأتيه (وفي رواية: يُمثَّلُ له) رَجُلٌ حَسَنَ الوجه، حَسَن الثياب، طيِّب الرِّيح، فيقول: أبْشِر بالذي يَسُرّكُ (أبْشِرِ بِرضوانٍ من الله و جنّاتٍ فيها نعيمٌ مُقيم) هذا يومك الذي كنت تُوعَدُ، فيقول له: (وأنت بشَّرك الله الخير) من أنت؟ فوجهك الوجه يجيئ بالخير، فيقول: أنا عملك الصالح (فوالله ما علمتك الا كنت سريعاً في طاعة الله بطيئاً في معصية الله فجزاك الله خيراً) ثم يفتح له بابٌ من الجنة و بابٌ من النار، فيقال: هذا منزلك لو عصيت الله، أبدلك الله به هذا، فأذا رأى ما في الجنة قال: ربِّ عَجِّلْ قيام الساعة، كَيْما أرجع الى أهلي ومالي، (فيقال له: أُسكُنْ).

قال: وان العبد الكافر (وفي رواية: الفاجر) اذا كان في انقطاعٍ من الدنيا وإقبال من الآخرة، نزل اليه من السماء ملائكة (غِلاظٌ شِداد) سُودُ الوجوه، معهم المُسُوحُ (من النار) فَيَجْلِسون منه مدّ البصر، ثم يجيئ ملك الموت حتى يجلس عنده رأسه، فيقول: أيتها النفس الخبيثةُ اخرجي الى

سخَطٍ من الله وَغَضَبٍ، قال: فتفرَّق في جَسَده فَيَنْتَزِعُها كما يُنْتَزَعُ السُّفودُ (الكثيرِ الشُّعَب) من الصّوف المَبْلول، (فَتُقَطَّعُ معها العُروق وَالعَصَبُ)، (فَيَلْعَنُهُ كل ملكٍ بين السماء وَالأرض، وَ كل ملكَ في السماء، وَ تُغْلَقُ أبواب السماء، لَيْس من أهل بابٍ الاّ وهم يَدْعون الله ألاّ تَعْرُج روحُهُ مِنْ قَبلِهِمْ) فيأخذها، فأذا أخذها لم يَدعُوها في يَدِهِ طَرْفة عَيْنٍ حتَّى يجعلوها في تلك المُسُوح، و يخرج منها كأنتنِ ريح جيفةٍ وجدت على وجه الأرض، فيصعدون بها، فلا يمرّون بها على ملأ من الملائكة، إلاّ قالوا: ما هذا الروحُ الخبيثُ؟ فيقولون: فلان بن فلانٍ بأقبح أسمائه التي كان يُسَمَّى بها في الدنيا. حتى ينتهي به الى السماء الدنيا فَيُسْتفتَحُ له، فلا يفتح لَه، ثم قَرَأَ رسول الله ﷺ: (لا تفتحُ لهم أبواب السماء ولا يدخلون الجنّة حتى يَلِجَ الجَمَلُ في سمّ الخياطِ). فيقول الله عزّوجلّ-: اكتبوا كتابه في سجّين، في الأرض السُّفْلى، (ثم يقال: أعيدوا عبدي الى الأرض فأني وَعدتهم أنّي منها خلَقْتُهُمْ، وَفيها أُعيدُهُمْ، وَمنها أُخْرِجهُم تارةً أُخري) فَتُطْرَحُ رُوحُهُ (من السّماء) طَرْحاً (حتى تقع في جَسَده) ثم قرأ: (وَمن يُشْرِكْ بالله فكأنّما خرَّ من السّماءِ فتخطَفُهُ الطّيْرُ أو تهوي به الرّيحُ في مكانٍ سحيق) فتُعادُ روحُهُ في جَسَدِهِ. (قال: فأنه لَيَسْمَعُ خَفْق نِعالِ أصحابهِ اذا وَلّوا عنه).

وَيأتيه ملكانِ (شديداً الأنتهار فَيَنْتَهرانِهِ و) يُجْلِسانِهِ فيقولان له: مَنْ رَبُّكَ؟ (فيقول: هاهٍ هاهٍ لا أدري، فيقولان له: ما دينك؟ فيقول: هاهٍ هاهٍ لا أدري) فيقولان: فما تقولُ: في هذا الرجل الذي بُعث فيكم؟ فلايهتدي لإسْمِهِ، فيُقال: محمدٌ ، فيقول: هاه هاه لا أدري (سمعت الناس يقولون ذلك، قال: فيقالُ لادَرَيْتَ) (ولا تَلَوْتَ)، فيُنادي مُنادٍ من السماء أن: كَذَبَ،

**فَأَفْرِشوا له من النار، وافتحوا له باباً الى النّار، فيأتيه من حرّها وَسمومها و يُضَيَّقُ عليه قبره حتى تختلف فيه أضلاعه و يأتيه (وفي رواية: و يمثّلُ له) رجل قبيح الوجه، قبيح الثياب مُنتِنُ الريح، فيقول: أبشر بالذي يسؤوك  هذا يومك الذي كنت توعَدُ، فيقول: (وأنت فبشّركَ الله بالشّرِّ) مَن أنت؟ فوجهك الوجه يجيء بالشّرِّ، فيقول: أنا عَمَلُكَ الخَبيث، (فوالله ما علمت الاّ كنت بطيئاً عن طاعة الله سريعاً الى معصية الله)، (فجزاك الله شراً ثم يُقَيّضُ له أعمى أصمَّ أبكم في يده مرزَبَةٌ لَو ضُرِبَ بها جَبَلٌ كانَ ترا باً فيضربه ضربةً حتى يصير بها تراباً، ثُمّ يعيده الله كما كان، فيضربه ضربةً أخرى فيصيح صيحةً يسمعه كل شيءٍ الاّ الثقلين، ثم يفتح له بابٌ مِن النّار يُمهّدُ له مِن فرش النّار) فيقول ربّ لا تُقِمِ الساعة)** (أخرجه أبو داوود والحاكم و الطيالسي وأحمد والسياق له والآجرّي في الشريعة و روى النسائي وإبن ماجة القسم الأول منه الى قوله (و كأن على رؤوسنا الطير)... و قال الحاكم: صحيح على شرط الشيخين وَأقرهُّ الذهبي وهو كما قالا، وصححه إبن القيم في (إعلام الموقعين و تهذيب السنن) و نقل فيه تصحيحه عن أبي نعيم و غيره، بڕوانە: (أحكام الجنائز وبدعها) محمد ناصرالدين الألباني ص (198-202).

ئەمەش ماناكەی بەشێوەیەكی دەقاودەق و ڕوون:

بەڕائی كوڕی عازیب -خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێ: ﴿جارێک یان لە گەڵ جەنازەی پیاوێكی ئەنصارییدا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەر چووین هەتا گەیشتینە لای گۆڕەكەو جارێ نەنێژرا بوو، جا پێغەمبەر ﷺ ڕووەو قیبلە دانیشت و ئێمەش لە دەوری دا دانیشتین، وەك باڵندەمان لەسەر سەر

هەڵنیشتبێ[1][ و نەهێڵن هەڵفڕێ ئاوا خۆمان بێدەنگو جووڵە کرد] وە [پێغەمبەر] چیلکەیەکی بەدەستەوە بوو لە زەوی یەوە دەژەنی، ئینجا سەرنجی ئاسمانی داو سەرنجی زەوی دا وە سێ جاران سەری بەرزو نزم کردەوە، ئنجا فەرمووی: پەنا بە خوا بگرن لە ئازاری گۆڕ دوو جار یان سێ جار [وای فەرموو] دوایی سێ جاران فەرمووی: ئەی خوایە پەنات پێ دێنم لە ئازاری گۆڕ، پاشان فەرمووی: بێگومان بەندەی بڕوادار هەرکات کەوتە حاڵەتی لە دونیا پچڕانو بەرەو دوارۆژ چوو، چەند فریشتەیەك لە ئاسمانەوە دادەبەزنە لای ڕوویان سپیو درەوشاوەیە ڕوویان دەڵێی خۆرە، کفنیان لە قوماشی بەهەشت [کە ئاوریشمە] پێیە، وە بۆنی خۆشیان لە بۆنی خۆشی بەهەشت پێیە، هەتا چەشمەندازێك لێیەوە دادەنیشن، دوایی فریشتەی مەرگ -سەلامی لێ بێت- دێ، هەتا لەلای سەری یەوە دادەنیشێو دەڵێ: ئەی گیانی پاكوچاك (وە لە ڕیوایەتێکدا: ئارامگرتوو!) دەربچۆ بەرەو لێبووردنو ڕەزامەندیی لە خواوە، فەرمووی: جا (ئەو ڕووحە) دەردەچێ (بە نەرمی) دەڕژێ وەك چۆن دڵۆپە ئاو لە زاری کوندە دەڕژێ. (وە لە ڕیوایەتێکدا، جا کاتێك ڕووحەکەی دەر چوو هەر چی فریشتەی نێوان ئاسمانو زەوی یەو هەر چی فریشتەی ئاسمانە دوو عای بۆ دەکەن وە دەرگاکانی ئاسمانی بۆ دەکرێنەوە، خاوەنی هیچ دەرگایەك نیە کە لە خوا نەپاڕێنەوە کە لەلای وانەوە ڕووحەکەی بەرز بکرێتەوە).

جا کاتێك (فریشتەی مەرگ) ڕووحەکەی وەرگرت، (فریشتەکان) ناهێڵن چاو ترووکانێك بەدەستی یەوە بێت یەکسەر وەری دەگرنو لەو کفنو بۆنی

---

1) ئەوەی نێوان ئەم دوو کەوانەیەو کەوانەی دیکەی لەم جۆرەش زیادەی خۆمە بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی واتای ڕستەو وشەکانو لەدەقی فەرمایشتەکەدا نەهاتوون.

خۆشەوەی دەپێچن، جا ئەوەیە قسەی (خوای) بەرز: "فریشتەکانمان وەری دەگرنو هیچ کەمتەرخەمی تێدا ناکەن" وە خۆشترین بۆن کە لەسەر ڕووی زەوی هەیە لێیەوە دەردەچێ فەرمووی: ئەوجار بەرزی دەکەنەوەو بەلای هەر کۆمەڵێك لە فریشتەکانی دا بەرن دەڵێن: ئەو ڕووحە پاكو چاکە کێیە؟! ئەوانیش دەڵێن: ئەوە فلان کەس کوڕی [یا کچی] فلان کەسە. بە خۆشترین ناو کە لە دونیادا ناویان پێ بردووە [ناوی دەبەن]، هەتا دەیگەیەننە ئاسمانی نزیك، جا داوای دەرگاکرانەوە دەکەن بۆیان دەکرێتەوە، ئیدی لە هەر ئاسمانێك [فریشتە] لە خوا نزیکەکانی بەرەو ئاسمانی دوای خۆی بەڕێی دەکەن، هەتا دەگاتە ئاسمانی حەوتەم، جا خوای زاڵو پایەبەرز دەفەرموێ: ناوی بەندەکەم لە (علییین)دا تۆمار بکەن. (وە تۆ چوزانی (علیّون) چییە! لیستێکی نووسراوە. کە (فریشتە) نزیکەکان دەیبینن، ئیدی ناوەکەی لە (علّیین)دا تۆمار دەکرێ، پاشان دەگوترێ: بیگێڕنەوە بۆ زەوی، چونکە من گفتم پێداون کە لەوێ دروستم کردوونو بۆ ئەوێیان دەگێڕمەوەو جارێکی دیکەش لەوێ دەریان دێنمەوە. فەرمووی: جا دەگێڕرێتەوە بۆ زەویو گیانەکەی بەبەر جەستەدا دەکرێتەوە[1]، فەرمووی: وە ئەو دەنگی پێڵاوی هاوەڵەکانی دەبیستێ کاتێك بەجێی دەهێڵنو پشتی تێدەکەن، ئنجا دوو فریشتەی دێنەلا کە بە توندیی تێوەی دەخوڕن، ئیدی تێی دەخوڕنو دایدەنیشێننو پێی دەڵێن: پەروەردگارت کێیە؟ دەڵێ: خوا پەروەردگارمە، ئنجا پێی دەڵێن: ئایینت چییە؟! دەڵێ: ئیسلام بەرنامەمە، ئنجا پێی دەڵێن: ئەدی ئەو پیاوە کە لەنێوتاندا ڕەوانەکرابوو

1) بێگومان ئەو گیان چوونەوە بەرجەستەیە حاڵەتێکی تایبەتەو وەك هی ژیانی دونیا نییە ووا پێ دەچێ کاتی (مؤقت) یش بێت.

چی یە؟! ئەویش دەڵێ: ئەوە ڕەوانەکراوی خوایە ﷺ. ئنجا پێی دەڵێن: ئەدی کردەوەت چی بووە؟! ئەویش دەڵێ: کتێبی خوام خوێندۆتەوەو ئیمانم پێی هێناوەو بە ڕاستم داناوە.

ئەوجار (فریشتەکە) تێی دەخوڕێ‌و دەڵێ: پەروەردگارت کێیە؟! ئایینت چییە؟! پێغەمبەرت کێیە؟!

ـ وە ئەوە دوایین تاقیکردنەوەیە کە بڕواداری پێ تاقی دەکرێتەوە، وە ئەوەیە کاتێك کە خوای زاڵ‌و پایە بەرز دەفەرموێ: ﴿خوا بە هۆی وتەی چەسپاوەوە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە لە ژیانی دونیادا چەسپاو دەکات﴾- ئەویش دەڵێ: خوا پەروەردگارمە‌و، بەرنامەم ئیسلامە‌و، پێغەمبەرم موحەممەدە ﷺ، ئنجا بانگدەرێك لە ئاسمانەوە بانگ دەکات کە: بەندەکەم ڕاست دەکات، جا لە بەهەشت جێی بۆ ڕاخەن‌و لە پۆشاکی بەهەشتی بکەنەبەر، وە دەرگایەکی بەرەو بەهەشت بۆ بکەنەوە، فەرمووی: جا لەبۆن‌و فێنکایی ئەوێی بۆ دێ وە هەتا چاو بڕ بکات گۆڕەکەی بۆ فراوان دەبێ، فەرمووی: وە پیاوێکی ڕوو جوان‌و پۆشاك جوان‌و بۆن خۆش دێتە لای (وە لە ڕیوایەتێکدا: بۆی وێنا دەکرێ) پێی دەڵێ: موژدەت لێبێ بەوەی کە پێی دڵخۆش دەبی، موژدەت لێبێ بە ڕەزامەندیی خواو چەند باغێك کە نازو نیعمەتی بەردەوامیان تێدایە، ئەمە ئەو ڕۆژەبوو کە گفتت پێ دەدرا! ئەویش پێی دەڵێ: تۆش خوا موژدەی چاکت بداتێ، تۆ کێی؟ چونکە ڕووت ڕووێکە خێری پێوەبێ! پێی دەڵێ: من کردەوەی چاکی تۆم، سوێند بە خوا وەك من ناسیومی لە فەرمانبەریی خوادا خێراو لە سەرپێچی دا سست بووی، خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە، پاشان دەرگایەکی لە بەهەشت‌و دەرگایەکی لە ئاگر-ی دۆزەخ- بۆ دەکرێتەوەو پێی دەگوترێ:

ئەگەر سەرپێچیت لە خوا کردبایە ئێرە جێگات بوو [مەبەست دۆزە خە].
بەڵام خوا بۆی گۆڕیوی بە ئێرە [مەبەست بەهەشتە]!

جا کاتێك ئەوە دەبینێ کە لە بەهەشت دایە دەڵێ: خوا یە زوو کاتی قیامەت بێنە تاکو بچمەوە لای خێزان و ماڵەکەم! پێی دەگوترێ: ئارام بە!
فەرمووی: وە بەندەی کافر (وە لە ڕیوایەتێکدا: خراپەکار) هەرکات کەوتە حاڵەتی لە دنیا بڕان و بەرەو دوارۆژ مل نان، لە ئاسما نەوە فری شتەی دادەبەزنە لا (زەبەلاح و بەهێزن) ڕوویان ڕەش و بر شەو پۆ شاکی[1] زبرو خراپی ئاگرینیان پێیە، جا چەشمەندازێك دوور لێیەوە دادەنی شن، دوا یی فریشتەی مەرگ دێ هەتا لەلای سەریەوە دادەنیشێ، دەڵێ: ئەی نەف سی پیس! بچۆ دەرێ بەرەو قەڵ سیی و تووڕەیی خوا، فەرمووی: جا لە جەستەیدا پارەپارە دەبێ و دەریدەکێشێ وەك چۆن شانەی ئاسنی قولاپ زۆر لە خوری تەڕ دەردەکێشرێ ئیدی هەرچی ڕەگ و دەمارە لەگەڵی دەپچڕێن، وە هەرچی فریشتەیە لە نێوان ئاسمان و زەو یداو هەر چی فری شتەیە لە ئاسمانێ نەفرینی لێدەکەن. وە دەرگاکانی ئاسمانێ دادە خرێن وە سەرجەم خاوەن دەرگاکان لە خوا دەپاڕێنەوە کە ڕووحە کەی بەلای وان دا بەرز نەبێتەوە. جا (فری شتەی مەرگ) وەری دە گرێ و هەر کە وەری گرت (فریشتەکان) ناهێڵن چاو تروکانێك بە دەستیەوە بێت کە دەیخەنە نێو ئەو پۆشاکە بووزووەوەو بۆنێکی لێ دێ وەك بۆگەنترین بۆنی کەلاکی سەرزەوی، ئیدی بەرزی دەکەنەوەو بەلای هەر کۆمەڵێك لە فری شتەکانی دا بەرن دەڵێن: ئەو ڕووحە پیسە چی یە؟! ئەوانیش دەڵێن: ئەوە فلانی کوڕی [یان

---

1) وشەی (مسوح) کۆی (مِسح)ەو ئەو بەرگەیەکە لە (موو) دەچنرێ و دیارە زبرو خراپەو دەبێتە مایەی ئازاردانی جەستە، کە بە کوردی (بووزوو)ی پێ دەڵێن.

کچی] فلأن کەسە بە ناخۆشترین ناوی کە لە دونیادا پێی ناونراوە [ناوی دەبەن]. هەتا دەگاتە ئاسمانی نیزیك، جا داوای دەرگا کرانەوەی بۆ دەکرێ، بەڵام بۆی ناکرێتەوە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەی خوێندەوە: ﴿ئەوانە دەروازەکانی ئاسمانیان بۆ ناکرێتەوەو نا چنە بەهەشتەوە هەتا حوشتر بەکونی دەرزی یەوە نەچێ﴾.

جا خوای زاڵو پایە بەرز دەفەرموێ: ناوی بەندەکەم لە (سجيّن) بنووسن لە زەوی خوارەوە. پاشان دەگوترێ: بەندەکەم بگێڕنەوە زەوی چونکە من بەڵێنم داوە کە لەوێدا دروستم کردوونو بۆ وێیان دەگێڕمەوەو جارێکی دیکەش لەوێ یان دەردێنمەوە. جا ڕووحەکەی لە ئاسمانەوە فڕێ دەدرێ بە فڕێ دران هەتا دەکەوێتە نێو جەستەی. ئنجا ئەم ئایەی خوێندەوە: ﴿وە هەرکەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێ وەك ئەوە وایە لە ئاسمانێوە بکەوێتە خوارێو باڵندە بیرفێنن یاخود با بەرەو شوێنێکی دوورو قووڵ بیبا تە خوارێ﴾، جا ڕووحەکەی دەگێڕرێتەوە نێو جەستەی، فەرمووی: وە ئەو دەنگی پێڵاوی هاوەڵەکانی دەبیستێ کاتێك بەجێی دەهێڵن. وە دوو فریشتەی دێنەلا کە توند تیژوەی دەخوڕن، جا تێی دەخوڕنو دایدەنیشێننو پێی دەڵێن: پەروەردگارت کێیە؟ ئەویش دەڵێ: هاه نازانم.

ئنجا پێی دەڵێن: بەرنامەت چی یە؟! دەڵێ: هاه هاه نازانم! ئنجا پێی دەڵێن: ئەدی لەبارەی ئەو پیاوەوە کە لەنێوتاندا ڕەوانەکراوە چی دەڵێی؟! ئەویش ناوەکەی نازانێ، جا پێی دەگوترێ، موحەممەد، ئەویش دەڵێ: هاه هاه نازانم. گوێم لە خەڵکی بوو وایان دەگوت! فەرمووی: پێی دەگوترێ: (یا خوا) نەزانیو نەیلێی.

ئنجا بانگکەرێك لە ئاسمانەوە بانگ دەكات كە: درۆ دەكات‌و لە ئاگردا جێگەی بۆ ڕاخەن‌و دەرگایەكی بەرەو ئاگری بۆ بكەنەوە، جا لە گەرمایی‌و گرەبای وی بۆ دێ، وە گۆڕەكەی لێ وەتەنگ دێ هەتا پەراسووەكانی تێك دەترنجێن (ڕاست‌و چەپ)، وە پیاوێكی ڕوو دزێوی بەرگ نا شیرین بۆن بۆگەن دێتەلای (وە لە ڕیوایەتێكدا: بۆی وێنا دەكرێ)، دە لێ: مژدەت لێبێ بەوەی كە پێت ناخۆشە، ئەمە ئەو ڕۆژەیە كە گفتت پێ دەدرا، ئەویش دەڵێ: ئەدی تۆ خوا مزگێنی خراپت بداتێ تۆ كێی؟! چونكە ڕووت ڕووێكە خراپە بێنێ! ئەویش دەڵێ: من كردەوەی خراپی تۆم. سوێند بە خوا ئەوەی من بیزانم هەمیشە لە فەرمانبەری خوادا سست و لە سەرپێ چی خوادا خێرا بووی، دەجا خوا سزای خراپت بداتەوە.

پاشان بابایەكی كوێرو كەڕی بۆ دادەنرێ گورزێكی بەدەستەوەیە ئە گەر پێی لە چیا بدات دەیكاتە خۆڵ. جا زەبرێكی لێدەدا هەتا پ ێی دەبێ تە خۆڵ، پاشان خوا وەك خۆی لێ دەكاتەوەو زەبرێكی دیكەی لێ دەدات بە جۆرێك هاوار دەكات كە هەموو شتێك جگە لە ئینسان‌و جند دەیبیستێ. پاشان دەرگایەكی بەرەو ئاگر بۆ دەكرێتەوەو لە ئاگردا جێ گای بۆ ساز دەكرێ. جا دەڵێ: پەروەردگارم قیامەت مەهێنە!).

وەك بینیمان پێغەمبەری خوا ﷺ لەم فەرمایشتەی دا زۆر جوان ڕوونی كردۆتەوە كە هەركام لە ڕووحی ئیماندارانی پارێزكارو بێ بڕواو خراپەكاران چۆن چۆنی دەكێشرێ‌و بەرەو خوا بەرز دەكرێتەوەو مامەڵەی دادگەرانەو پڕ بە پێستی لەگەڵ دا دەكرێ.




## 6- گـۆڕ یەكەمین مەنزڵگـای ڕۆژی دو ە:

لە فەرموودەدا هاتوە: كە (عوسمانی كوڕی عەففان) خوا لێی ڕازی بێ، هەر كاتێك كە دەیبینی كە سێك لە سەرەمەرگ دا یە، دەگر یاو زۆر ناڕەحەت دەبوو، گوتیان: بۆچی دەگری؟ ئەویش گوتی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: **(القبـر أول منـازل الآخرة، فأنْ نجى منه، فما بعده أيْسَرُ منه، وانْ لَمْ يَنْج منه، فما بعده أَشَدَّ منه، قال: وسمعت ر سول الله ﷺ يقول: مارأيت منظراً قطّ الاّ والقبـر أفْظَعُ منه)**[1]، واتە: گۆڕ یە كەمین مەنزڵو قۆناغی دوا ڕۆژە ئەگەر ئینسان لە گۆڕ ڕزگاری بێ، قۆنا غەكانی دوایی ئاسانتـرن، ئەگەر لەوێشدا توشی سزاو ئازار بێ، قۆناغەكانی دیكە

1) رواه الترمذي وابن ماجه، وحسنه الألباني عن عثمان رضي الله عنه.

زۆر سەختتــرن، وە گوتی لە پێغەمبەرم بیستوە ﷺ فەرموو یەتی: هیچ دیمەنێکم نەدیوە کە نارەحەت ترو ترسناکتر بوبێت لە د یمەنی گۆڕ! وە بێگومان گۆڕ تاریکی تێدایە، بۆ بێبڕوایانو تاوانباران، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **(انَّ هذه القبور عليها ظلمة ع لى أه لها، وان الله عزّو جلّ مُنَوِّرها لهم بِصلاتي عليهم)**[1]، واتە: ئەم گۆڕانە تاریکایی یان تێدایە لە سەر خاوەنەکانیان، بەڵام بەهۆی ئەوەی کەمن دووعایان بۆ دەکەم، خوای زاڵو پایەبەرز بۆیان ڕۆشن دەکاتەوە.

هەروەها گۆڕ، گۆڕەوشار (ضمةُ القبــر) یان (ضَغْطَة القبر)ی تێدایە، وەك پێغەمبەر ﷺ دەربارەی (سەعدی کوڕی موعـاذ) خوای ل ێی ڕازی بێ فەرموویەتی: **(لو نجى أحدٌّ من ضَمَّةِ القبر لَنَجى سَعْدُ بنُ معاذ)**[2]، واتە: ئەگەر هیچکەس (لە گۆڕەوشار) (فشارو پەستانی گۆڕ، هاتنەیەکی گۆڕ) ڕزگاری ببوایە، بێگومـان (سەعدی کوڕی معاذ) ڕز گـاری دە بوو، ( کە بەهۆی مردنی ئەوەوە عەرشی خوا لەرزیوە، وەك لە (صحيح البخاري)دا هاتوە)، بەڵام تەنانەت ئەویش ڕزگاری نەبووە. بەڵێ هەموو مرۆڤ ێك ئەو گۆڕەوشارەی هەر هەیە، بەڵام ئینسانی ئیماندار، بە شێوەیەك گۆڕەو شار دەدرێ، وەك کە چۆن خۆشەویستێکت بە توندی بە خۆیەوە دەتگوشـێ بەو جۆرەیە ئینسانی کافرو خراپەکاریش، پەراسووەکانی ڕاستو چەپی ت ێك دەترینجێنو، دەچنەوە نێو یەك، چونکە زۆر بەتو ندی گۆڕە کەی لـێ دێتەیەك.

---

1) رواه (البخاري ومسلم).
2) رواه احمد والطبراني، وصححه الألباني.




## 7- پرسیارو وەڵامو خۆشیو ناخۆشی نێو گۆڕ:-

خوێنەری بەڕێز!

گۆڕ پرسیارو وەڵامی تێدایە، وە خۆشیو ناخۆشی تێدا یە، دیارە بۆ ئینسانی ئیماندار، نازو نیعمەتو خۆشی تێدا یەو بۆ ئینسانی کافرو تاوانبارو خراپەکاریش، ئازارو مەینەتی تێدایە.

هەڵبەتە لەوبارەوە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ یەکجار زۆرن، بۆ وێنە دەفەرمویَ: **(انَّ العبد اذا وُضعَ في قَبره وتولَّى عنه أَصْحابُه، إنَّه يَسْمَعُ قَرْعَ نعالهم، اذا انصرفوا، أتاه ملكان فَيُقْعِدانِه، فيقولان له: ماكنت تقول في هذا الرجل (محمد)؟! فأما المؤمن فيقول: أشهد أنَّه عبدالله ورسوله، وأما الكافر أو المنافق[وفي رواية: وأما الكافر والمنافق] فيقول: لا أدري كنت أقول ما**

**يقولُ الناس فيه فيُقال: لادَرَيْتَ ولاتَلَيْتَ)**[1]، واتە: كاتێك بەندە دەخرێتە نێو گۆڕەوەو ئەوانەی كە ناشتوویانە دەڕۆن، گوێی لەدەنگی پێڵاوەكانیانە، دوو فریشتە دێنە لای‌و دایدەنیشێنن‌و پێی دەڵێن: دەربارەی ئەو پیاوە (محمد) ﷺ چ دەڵێی‌و هەڵوێستت دەربارەی چۆن بوو؟! جا ئەوەی بڕوادار بووبێ دەڵێ: شایەدیی دەدەم كە بەندەی خواو ڕەوانەكراوی خوا بووە، بەڵام كافر، یان مونافیق، له ڕیوایەتێكدا: دەڵێ: كافرو مونافیق دەڵێت نازانم كێیە شتێكم دەگوت كە خەڵك لەبارەیەوە دەیگوت (واتە: شایاتـمانی هێناوە، بەڵام وەك چاولـێكەریی- نەك وەك قەناعەتی دڵ) پێی دەگوترێ: یاخوا نە قەت بزانی‌و نە قەت بەدەمیشت دابێت.

ئەوە لەبارەی پرسیارو وەڵامی نێو گۆڕەوە، لەبارەی ئازارو ئەشكەنجەی نێو گۆڕیشەوە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆرن وە ئەم ئایاتانەش بەڕای زۆربەی هەرەزۆری توێژەرەوانی قورئان ئاماژەیە بە ئازارو ئەشكەنجەی پاش مەرگ‌و پێش هاتنی قیامەت كە بە گۆڕ (قبر) یان بەرزەخ تەعبیری لـێ دەدرێ: ﴿**...وَحَاقَ بِآلِ فِرْعَوْنَ سُوءُ الْعَذَابِ ۝ النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ**﴾(غافر: 45-46)، واتە: وە خراپترین ئازار دەوری داروودەستەی فیرعەونی دا، ئاگر كە بەیانیان‌و ئێواران لە سەری ڕادەنوێنرێن، وە ڕۆژی هاتنی قیامەتیش دەگوترێ- داروودەستەی فرعەون بخەنە توندترین ئازارەوە.

وەك دەبینین لێرەدا خوای دادگەرو كاربەجێ سێ جۆرە ئازاری وەك سزا (عقاب) بۆ فیرعەون‌و دەستەو دایەرەكەی باسكردوە، یەكیان لە ژیانی

1) رواه البخاري ومسلم وابوداود والنسائي عن أنس -رضي الله عنه-.

دونیاداو یەکیان لە قۆناغی بەرزەخداو ئەوی دیکەشیان لە ڕۆژی دوایی یدا، چونکە:

1- مەبەست لە: (**وَحَاقَ بِآلِ فِرْعَوْنَ سُوءُ الْعَذَابِ**) خنکانی فیرعەونو شوێنکەوتووەکانییەتی لە دەریای سووردا کە لە کۆتایی ژیانی دونیایان دابووە.

2- وە مەبەست لە: (**النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا**) ئازاردرانیانە لە قۆناغی بەرزەخ دا، چونکە دواتر باسی ئازاری قیامەت دەکات وە لە فەرموودەکانی پێغەمبەریش دا ﷺ باسکراوە کە خۆشیو ناخۆشی گۆڕو بەرزەخ بەیانیانو ئێوارانە، وەك دوایی فەرموودەکان دێنین، حیکمەتی پێکەوە لکێنرانو پێکەوە باسکرانی ئازاری دونیاو ئازاری بەرزەخیش ئەوەیە کە پاش گیان کێشرانی کافرو تاوانباران یەکسەرو بێ دواخران تووشی ئازارو مەینەتییەکانی بەرزەخ دەبن.

3- وەمەبەست لە: (**وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ**) سزاو جەزرەبەی ڕۆژی دوایی یە کە بێگومان سزاو ئازاری ڕۆژی دواییش لە هی دونیاو بەرزەخ توندترو بێ ڕەزاترە، چونکە هەرکام لە جەستەو ڕووح بە تەواوی تێیدا بەشدارنو بێ بڕانەوەو هەمیشەیی یە.

هەروەها ئەم ئایەتانەی کۆتایی سورەتی (الواقعة)ش زۆر بەڕوونی دیارە کە باسی نعیمەتو خۆشییو ئازارو ناخۆشی بەرزەخو گۆڕ دەکەن. وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿**فَلَوْلَا إِذَا بَلَغَتِ الْحُلْقُومَ ۞ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ۞ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَكِن لَّا تُبْصِرُونَ ۞ فَلَوْلَا إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ۞ تَرْجِعُونَهَا إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ۞ فَأَمَّا إِن كَانَ مِنَ الْمُقَرَّبِينَ ۞ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّةُ نَعِيمٍ ۞ وَأَمَّا إِن كَانَ مِنْ أَصْحَابِ الْيَمِينِ ۞ فَسَلَامٌ**

لَّكَ مِنْ أَصْحَابِ الْيَمِينِ ۞ وَأَمَّا إِن كَانَ مِنَ الْمُكَذِّبِينَ الضَّالِّينَ ۞ فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ ۞ وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ ۞ إِنَّ هَذَا لَهُوَ حَقُّ الْيَقِينِ ۞ فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ﴾(الواقعة: 83-96)، واتە: دەبا كاتێك (ڕووح) دەگاتە گەروو، وە ئێوەش لەوكاتەدا سەرنج دەدەن‌و ئێمەش (فریشتەكانمان) لە ئێوە لێی نزیكترین، بەڵام ئێوە نابینن دەجا ئەگەر ڕاستە ئێوە توانا بەسەردا شكاو نین. دەیبیگێڕنەوە (نێو جەستەكەی) ئەگەر ڕاست دەكەن. جا ئەگەر ئەو كەسە لە خوا نزیكان بێت. ئەوە پادا شتی ئا سوودەیی‌و بۆنی خۆش‌و بەهەشتی هەمیشەیی یە، وە ئەگەر لە هاوەڵانی ڕاستە بێت، ئەوە سڵاو لە تۆ لە هاوەڵانی (دەستە) ڕاستەوە. وە ئەگەر لە بێبڕوا یانی سەرگەردان بێت، ئەوە مەنزڵگای ئاوی داغەو دەخرێتە نێو كڵپەوە. بێگومان ئەوە ڕاستییەكی بێگومانە دەجا ناوی پەروەردگاری مەزنت بە پاك ڕ بگرە.

بەڵگەش لەسەر ئەوە كە ئەم ئایەتانە با سی پادا شت‌و سزاو خۆ شی‌و ناخۆشی پاش مەرگ دەكەن -كە بە ژیانی بەرزەخ‌و گۆڕ ناسراوە- نەك هی ڕۆژی دوایی ئەوەیەكە:

1- لە سەرەتای سوورەتی (الواقعة)ەوەو لە میانەی پەنجا ئایە تدا - لە ئایەتی (7 تا 56)- خوای بەرزو مەزن باسی پاداشت‌و سزای هەركام لە (المقربين)و (أصحاب اليمين)و (أ صحاب ال شمال)ی كردوە، دوای ئەوەی باسی هاتنی قیامەتی كردوە!

2- هەروەها دووبارە بوونەوەی باسی پاداشت‌و سزای ئەو سێ كۆمەڵە لە كۆتایی سوورەتی (الواقعة)دا ئەگەر نەڵێین با سی حا ڵەتی بەرزەخ‌و گۆڕیانە بێحیكمەت دێتە بەر چاو، وە ڕا ستەوخۆش دوای با سكرانی حاڵەتی گیانەڵاو ڕووح كێشرانەو بە (ف)ی بەدوادا هاتن (تعقيب)یش

ئەو پاداشتو سزایانە خراونە ڕوو، بۆیە پێویستە بڵێین: مەبەست پێی پاداشتو سزای بەرزەخو گۆڕە.

ئێستاش با چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە بخەینە ڕوو:

1/ (عن ابن عمر -رضي الله عنهما- أن رسول الله ﷺ قال: إنَّ أحدكم اذا مات عُرِضَ عليه مقعده بالغداة والعشيّ ان كان من أهل الجنة فمن أهل الجنة وان كان من أهل النار فمن أهل النار، يقال: هذا مقعدك حتى يبعثك الله اليه يوم القيامة) رواه البخاري برقم: 1379 ومسلم برقم: 2866، واتە:... بێگومان یەکێکتان کە دەمرێ بەیانیانو ئێواران شوێنی خۆی پیشان دەدرێ ئەگەر ئەهلی بەهەشت بێت لە بەهەشتێداو ئەگەر ئەهلی دۆزەخیش بێت لە ئاگردا، دەگوترێ: ئەمە جێگاتە هەتا ڕۆژی دوایی خوا بۆ لای خۆی زیندووی دەکاتەوە.

2/ (عن زيد بن ثابت -رضي الله عنه- أن رسول الله ﷺ قال: إنَّ هذه الأمة تُبْتَلى في قبورها فلولا أن لا تدافنوا لدعوت الله أن يُسْمِعَكُم من عذاب القبر الذي أسمَع منه) رواه مسلم برقم: 2867، واتە: بێگومان ئەم ئومەتە لە گۆڕەکانیدا ئەشکەنجە دەدرێ، وە ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە کە مردووان نەنێژن لە خوا دەپاڕامەوە کە ئەوەی من لە ئازاری گۆڕ دەیبیستم بیبیستن.

3/ (عن أنس -رضي الله عنها- أن النبّـي ﷺ قال: لولا أن لا تدافَنوا لدعوت الله أن يُسْمعكم من عذاب القبر) رواه مسلم برقم: 2868.

کە پێشتر مانا کراوە، وە خاوەنی کتێبی ( شرح العقيدة الطحاوية) لەبارەی پرسیارو وەڵامی نێوگۆڕو خۆشیو ناخۆشی نێوگۆڕ گوتوویەتی:

﴿وقد تواترت الأخبار عن رسول الله ﷺ في ثبوت عذاب القبر ونعيمه

لمن كان لذلك أهلاً وسؤال الملكين. فيجب إعتقاد ثبوت ذلك والأيمان به، ولا نتكلّم في كَيْفيَّتِهِ، إذْ لَيْس للعقل وقف على كَيْفيَّتِهِ لكونه لاعهد له بِهِ في هذه الدار والشرع لايأتي بما تحيلُهُ العقول، بَلْ انَّ الشرع قد يأتي بما تَحارُ فيه العقولُ فأنَّ عودة الروح الى الجسد لَيْس على الوجه المعهود في الدنيا، بَلْ تعادُ اليه إعادة غير الأعادة المألوفة في الدنيا﴾، واته: ئازارو نیعمەتی گۆڕ بۆ هەرکەسێك شایستەی بێ وە پرسیاری دوو فریشتەکان، هەواڵی (متواتر) بۆ سەلماندنی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هاتوون، بۆیە پێویستە قەناعەت بە چەسپاندنی هەبێو ئیمانی پێ بهێنرێ، وە لەبارەی چۆنیەتی یەکەیەوە قسە ناکەین چونکە عەقل سەری لە چۆنیەتی یەکەی دەرناچێ لە سۆنگەی ئەوەوە کە هیچ ئاشنایەتییەکی پێی نیە لەم ژیانە دونیایی یەدا، دیارە شەرعیش هەرگیز شتی وا ناهێنێ کە عەقل بە مەحاڵی بزانێ، بەڵکو شەرع شتی وادێنێ کە عەقڵان تێیدا سەرسام دەبن.

دیارە گێڕانەوەی گیان بۆ جەستەش بەو جۆرە زانراو نیە کە لە ژیانی دونیادا پێی ئاشناین، بەڵکو ڕووح بە جۆرێك دەگێڕرێتەوە جیا لەو گەڕانەوە زانراوەی کە لە دونیادا هەیە.

شایانی باسیشە زانایانی ڕەسەنی ئیسلام کە بە (أهل السنة) ناسراون دەربارەی خۆشیو سزای گۆڕ، سێ ڕایان هەیە:

**یەکەم:** دەڵێ: خۆشیو ناخۆشی قۆناغی بەرزەخو گۆڕ تەنیا بۆ جەستەیە، دیارە ئەمە ڕایەکی زۆر لاوازو بێهێزو پێزەو پێچەوانەی عەقلو نەقڵە.

**دووەم:** دەڵێ: خۆشیو ناخۆشی قۆناغی بەرزەخ، تەنها بۆ ڕووحە، کە (ابن حزم الأندلسي) لایەنگری ئەم ڕایەیە.

**سێیەم:** دەڵێ: هەرکام لە ڕووح و جەستە لە نیعمەت و ئازاری گۆڕو بەرزەخدا بەشدارن، ئەمە ڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایانە.

دەشتوانین بۆ لە عەقڵ نزیك خستنەوەی خۆشی و ناخۆشی بەرزەخ و گۆڕ وێنە بە دوو کەسی خەوتوو (نائم) بهێنینەوە کە یەکیان دەڵێ سەد حەیف کە لەو خەونە خۆشە خەبەرم بۆوەو ئەوی دیکەش سوپاسی خوا دەکات کە خەبەری بۆتەوە!

جا دیارە ئەگەر هەردووکیان لای کەسێك و لە ژوورێکدا خەوتبن ئەو کەسە نەهەست بە خۆشی هی یەکەمیان و نە بە ناخۆشی هی دووەمیان ناکات، ئەمە لە لایەکەوە لە لا یەکی دیکەشەوە ئەگەر گریمان هەرکامێکیان لە خەونەکەی بێدار نەبووبایەوە دیارە هەر بەجددی لە خۆشی و ناخۆشیدا دەبوون!

لە کۆتاییشدا دەڵێم:

ڕەنگە ئەوەی ئیشکالی بۆ هەندێك کەس دروست کردوە لەبارەی ئازارو نیعمەتی قۆناغی بەرزەخەوە دوو شت بێ:

یەکەم: قیاسی ژیانی قۆناغی بەرزەخ لەسەر قۆناغی ژیانی دنیا، کە بێگومان ئەوە هەڵەیە. چونکە قۆناغەکانی دنیاو بەرزەخ وە قیامەت هەرکامێکیان تایبەت مەندیی خۆی هەیەو جیایە لەوانی دیکە.

دووەم: وشەی گۆڕ (قەبر)، چونکە کابرا دەڵێ: ئەگەر خۆشی و ناخۆشی یەکە لە گۆڕدا بن خۆ کەسانێك هەن کە ناخرێنە گۆڕەوە!!

بۆیە دەڵێین: لە ڕاستیدا مەبەست لە ووشەی (گۆڕ) و (ژیانی نێو گۆڕ) ئەو ژیانەیە کە لە پاش مردنەوە دەست پێ دەکا کە بە قۆناغی بەرزەخ ناسراوە، بەڵام وشەی گۆڕ هەڵهێنجراوی عادەت و نەریتی زۆربەی خەڵکی و

واقیعی کۆمەڵگاکانی مرۆڤە لەسەر زەوی، ئەگەر نا خۆشی و ناخۆشی پاش مەرگ و بەرزەخ نەبەستراوەتەوە بە گۆڕو چونە نێو گۆڕەوە!

پێویستە ئەوەش بگوترێ: کە وەك لە ئایەت و فەرمایشتەکاندا دەبینرێ هەر چۆن بێ -واتە خۆشی و ناخۆشی پاش مەرگ تایبەت بن بە ڕوو حەوە یان ڕووح و جەستە بگرنەوە- ژیانی پاش مەرگ و قۆناغی نێوان دونیاو قیامەت کە بە قۆناغی بەرزەخ ناو براوە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە بەهەشت و دۆزەخەوە هەیە، جا بە چوونە نێویان بێ -ئەگەر خۆشی و ناخۆشیە کە تایبەت بن بە ڕووحەوە- یان هەر جۆرە پەیوەندییەکی دیکە بێ، چونکە خوای زاناو شارەزاو پێغەمبەری خواش ﷺ جگە لە بەهەشت و دۆزەخ چ بۆ ژیانی دوای مەرگ و چ بۆ ڕۆژی دوایی، باسی شوێنێکی دیکەی نەکردوە بۆ خۆشی وەرگرتنی چاکەکاران و ناخۆشی چێژتنی خراپەکاران.

## خاڵی پێنجەم:

## نیشانە نزیکەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی

خوێنەری بەڕێز!

لەم خاڵی پێنجەمەدا لەبارەی نیشانە نزیکەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی یەوە قسە دەکەین کە بە گشتی سێ بەشن:

1- بەشێکیان هاتوونو رابردوون کە ئێمە چواریان وەك نموونە باس دەکەین.

2- بەشێکیان ئێستە لە نێو ـیان دا ـینو ڕوودەدەن، ـیان ڕوو ـیان داوەو دەشگونجێ دووبارە ببنەوە، لەم جۆرەشیان حەوت نموونە باس دەکەین.

3- بەشێکیشیان جارێ نەهاتوونو ڕوویان نەداوە کە ئێمە پێنج ـیان ـبە نموونە دێنینەوە.

شایانی باسیشە کە زانایان نیشانەکانی هاتنی قیامەتیان کردوونە دوو جۆری سەرەکی:

(1) نیشانە گەورەکان (الأشراط الكبـري).

(2) نیشانە گچکەکان (الأشراط الصّغري).

بەڵام من سیفەتی گەورەو گچکەم بۆ نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوا ـیی پێ ڕاست نیە، چونکە:

یەکەم: ئەو دوو سیفەتە بۆ نیشانەکان لە قورئانو سوننەت نەهاتوون تاکو نەتوانین لێیان لادەین.

دووەم: هەندێك لە نیـ شانەکان گەورە شنو ڕا شبردوونو هەندێکیـ شیان بچووکیشنو نەشهاتوون! بۆیە مـن ـبە پە سەندم زا ـنی نیـ شانەکانی قیامەت بە نزیكو دوور وەسف بکەین، چونکە هە ـندێکیان ـنزیکنو هەندێکیشیان دوورن، وە لەنێو هەرکام لە نیشانە نزیكو دوورەکاندا هی گچکەو گەورەش هەن، دیارە ئەم خاڵی پێنجەمە بۆ نیشانە نزیکەکانو هی شەشەمیش بۆ نیشانە دوورەکان تەرخان کراون:

# دەستپێك

خوێنەری بەڕێز!

خوای پەنهان بین فەرموویەتی: ﴿فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلاَّ السَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً فَقَدْ جَاء أَشْرَاطُهَا فَأَنَّى لَهُمْ إِذَا جَاءتْهُمْ ذِكْرَاهُمْ﴾[1]، واتە: ئایا چاوەڕوانی چی دەکەن جگە لە قیامەت کە بێگومان نیشانەکانیشی هاتوون، جا

1) ( محمد- 18 ).

کاتێك کە قیامەت لە ناکاو هات چۆن چۆنی دەتوانن خوایان بێتەوە یادو پەند وەربگرن!

ئێستاش با بزانین مەبەست لە نیشانەکانی قیامەت چی یە؟! (إبن حجر العسقلاني) ئاوا پێناسەی نیشانەکانی قیامەتی کردوە، دەڵێ: (الأ شراط: أمارات للساعة، إما على قربها وإمّا على حصولها)[1]، واتە: (أ شراط) نیشانەکانی هاتنی قیامەتن، یان بۆ نزیکبوونەوەی، یان لە کاتی پەیدابوونیدا[2]، چونکە هەندێك لە نیشانەکانی قیامەت کاتێك دێن کە قیامەت دەستی پێکردوەو دێت، هەندێکیشیان پێش شەکییو زەمینە خۆشکەرن.

جا وەك پێشتریش باسمکرد من تەعبیری نیشانە بچوکەکان وە نیشانە گەورەکان بە پەسەندو بگرە بە ڕاستیش نازانمو پێم وایە ڕاست ئەوەیە کە لە جیاتی (نیشانە گچکەکان) بگوترێ: (نیشانە نزیکەکان)، (الأ شراط القريبة)، وە لە جیاتی (نیشانە گەورەکان) بگوترێ: (نیشانە دوورەکان) (الأشراط البعيدة). چونکە یەکێك لە نیشانە بچووکەکان، هاتنی پێغەمبەرمان (محمد)ە ﷺ ئاشکراشە کە ئەوە نەك هەر شتێکی بچووك نیە، بەڵکو گەورەترین کارەساتی ئیجابی یە لە تەمەنی بوونەوەردا. هەروەها یەکێکی دیکە لە نیشانەکان (لەت بوونی مانگ)ە کە بێگومان ئەویش شتێکی گچکە نیەو زۆر گەورەیە!

---

1) فتح الباري، بەرگی11، لاپەڕە 352.
2) وشەی (أَشراط) کۆی (شَرَط)ەو بە مانای نیشانە (علامە، آية) دێ.

ئێستاش با باسی هەرکام لەو دوو جۆرە نیشانانە بکەین‌و سەرەتا لەم خاڵی پێنجەمەدا باسی نیشانە نزیکەکان (الأشراط القريبة) دەکەین: وەك پێشتر باسمان کرد ئەم جۆرە دابەش دەبێ بۆ سێ بەش:

**بەشی یەکەم: ئەوانەن کە هەتا ئێستا ڕوویان داوەو تێپەڕ بوون:**

جا ئێمە چواریان لــێ بە نموونە دێنینەوە:

1- یەکێك لەوانە، هاتنی پێغەمبەری کۆتایی (محمد) ﷺ، وەك خۆی فەرموویەتی: (بُعِثْتُ أنا والساعة كهاتين، كَفَضْلِ إحداهما على الأُخرى، وضمَّ السبّابة والوُسْطى)[1]، واتە: من‌و قیامەت وەك ئەم دوو پەنجەی شایەتمان‌و نێوەڕاست بەیەکەوە هاتووین، جیاوازیمان وەك زیادەی پەنجەی نێوەڕاستە بەسەر پەنجەی شایەتماندا (لەو کاتەش پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بە هەردوو پەنجەکە کردوە).

2- لەتبوونی مانگ (إنشقاق القمر)، وەك خوای زانا‌و شارەزا فەرموویەتی: ﴿**اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ ۞ وَإِن يَرَوْا آيَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ**﴾[2]، واتە: قیامەت نزیك بۆوەو مانگ لەت بوو، ئەگەر نیشانەیەك ببینن، پشتی تێدەکەن‌و دەڵێن: ئەوە جادوو یەکی هەمیشەو بەردەوامە.

دیارە ئەم ئایەتە لەگەڵ لەتبوونی مانگ یەتی کە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ لەت بووە وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە: ( **عن أنس رضي الله عنه أن اهل مكة سألوا رسول الله ﷺ أنْ يُرِيَهُمْ آيةً، فأراهم**

1) رواه البخاري ومسلم عن انس رضي الله عنه.
2) ( القمر: 1-2 ).

**انشقاق القمر مَرَّتَيْنِ)**[1] واتە: خەڵكی (مەككە) داوایان لە پێغەمبەری خوا كرد كە نیشانەیەكیان نیشان بدات، پێغەمبەریش ﷺ (بە فەرمانی خوا) دووجار مانگ لەتبوونی نیشان دان! (بەڵام هەڵوێستی ئەو هاوبەش پەیداكەرانە هەر ئەوە بوو كە وەك قورئان لێی گێڕاوەتەوە گوتیان: (سحر مستمر).

3- سێیەمیان ئەوەیە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **(لاتقوم الساعة حتى تخرج نار من أرض الحجاز تُضِيءُ أعناقَ الأبل بِبُصرى)**[2]، واتە: قیامەت نایەت هەتا ئاگرێك لەسەر زەوی حیجاز دەردەچێ كە گەردنی حوشتران لە شاری (بوسرا) بەهۆی ڕووناكی و مەشخەڵ و بڵێسەیەوە دەردەخات.

ئەم نیشانەیەش هاتۆتەدی و ڕابردوە، وەك (ابن كثیر) لە كتێبە ناودارەكەی خۆی (البدایة والنهایة) بەرگی (31) لاپەڕە (187-193)دا لە ڕووداوەكانی ساڵی (654)ی كۆچیدا، باسی ئەو ئاگرە دەكات، وە ئەو ئاگرە وەك زانایانی ئێستاو هاوچەرخ لێی دواون، بوركانێكی گەورە بووە، لە زەوی هاتۆتەدەرێ و مەشخەڵ و ڕووناكییەكی زۆر گەورەی هەبووە، بە شێوەیەك كە لە وڵاتی شام خەڵك شتی لەبەردا نوسیوەو خوێندۆتەوە، وەك فەرمودەكەش فەرموویەتی: (ملی حوشتران لە بوسرا بە هۆیەوە دیار بووە).

---

1) رواه مسلم.
2) رواه البخاري و مسلم عن أبي هريرة -رضي الله عنه-.

(شێخ شهاب الدین ابو شامة المقدسي) دەڵێ: ئێمە لە (تیماء) - کە شارێکە لە شام- کتێبمان لەبەر ئەو ئاگرەدا نووسیوەتەوە.

هەروەها (نووي)یش کە هاوچەرخی ئەو ڕووداوە بووە لە (شرح صحیح المسلم) بەرگی (18)، لاپەڕە (28)دا، ئەویش باسی لەو ڕووداوە کردوە، کە چۆن پێغەمبەر ﷺ باسی کردوە، ئاوا بووە، کەواتە ئەم نیشانەیەش ڕووی داوەو تێپەڕیوە.

4- نەمانی سەرانەو خەراج، (الجزیة والخراج): پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (**مَنَعتِ العراقُ دِرْهَمها وقَفيزَها، ومَنَعتِ الشامُ مُدَّها ودينارها، ومَنَعتِ مصرُ إِرْدَبَّهَا ودينارها، وعُدْتُمْ من حيث بدأتم، وعُدْتمْ من حيث بدأتم، وعُدْتم من حيث بدأتم**)[1]، واتە: ڕۆژگارێك دێت کە عێراق دیرهەمو پێوانەی خۆی نادات، (وەك سەرانە)، وە شامیش هەر پێوانەو دینارەکەی نادات، وە میسریش پێوانەو دینارەکەی خۆی نادات، وە دەگەڕێنەوە خاڵی سەرەتاتان، وە دەگەڕێنەوە خاڵی سەرەتاتان، وە دەگەڕێنەوە خاڵی سەرەتاتان، واتە: کاتێك دێت کە نە عێراقو نە شامو نە میسر، کە هەرسێکیان سەرچاوەی دارایی زۆر گەورە بوونو باجو سەرانەو خەراجیان لێ کۆکراوەتەوە بۆ خەزێنەی مسوڵمانان کاتێك دێت ئەوانە هیچیان بە دەست ئیسلامەوە نامێنن.

(ئیمام نەوەوی) لە شەرحی ئەم فەرموودەیەدا، کە ئەو کات ئەو مەسەلەیە ڕووی نەداوە، دەڵێ: (الأشهر في معناه ان العجم والروم يَسْتَولون

1) رواه مسلم عن أبي هريرة -رضي الله عنه- برقم: 2896.

على البلاد في آخر الزمان، فيمنعون حصول ذلك للمسلمين)[1]، واتە: ئەوەی باوترە لە مانا لێکدانەوەی ئەم فەرموودەیەدا ئەوەیە کە عەجەم و ڕۆم (کافرەکانی لای ڕۆژهەڵات و لای ڕۆژئاوا) دەسەڵات بەسەر وڵاتاندا پەیدا دەکەن لە کۆتایی زەماندا وە ئەو باج و خەراج و سەرانەیە، مەنع دەکەن لە مسوڵمانان و ناهێڵن وەریبگرن.[2]، واتە: باج و خەراجی نەغدنیەو پێوراوی عێراق و شام و میسر کە لە ئەهلی کیتاب وەرگیراوە کە سەردەمی خۆی هی مسوڵمانان بووە، دوایی لە مسوڵمانان مەنع دەکرێ، ئێستاش هاتۆتەدی.

**بەشی دووەم: لە نیشانە نزیکەکان ئەوانەن کە لە ڕابردوودا ڕوو یان داوەو ئێستاش بەردەوامن، یاخود دەگونجێ دووبارە ببنەوەو ڕووبدەنەوە:**

لەم بەشەش ئەم حەوت نموونەیەمان هێناوەتەوە:

1- سەقامگیربوونی ئیسلام و دەسەڵات پەیداکردنی بەسەر زۆر شوێناندا: وەك لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (عليه الصلاة والسلام) هاتوە، کە بۆ دڵدانەوەی هاوەڵەکانی لەکاتی ئەشکەنجەو ئازاردانیاندا بەدەستی

1) شرح صحيح المسلم، بەرگی 18، لاپەڕە (20).
2) هەرکام لە (قفيز)و (مدّ)و (إردب) هۆکاری پێوان (کیل) بوونە.

کافرە قوریشییەکان بە (خەبابی کوڕی ئەرەت)ی فەرموو: **(واللهِ لَيُتَمِنَّ اللهُ هذا الأمْرَ حتى يسيرَ الراكبُ مِنْ صنعاءَ الى حضرموت لايَخافُ الاّ الله أو الذّئْبَ على غَنَمِهِ ولكنكم تَسْتَعْجلون)**[1]، واتە: بە خوا، خوا ئەم دینە تەواو دەکا، هەتا بابایەکی سوار لە ( صنعاء)وە دە چێ بۆ (حضرموت) جگە لە خوا لە کەس ناترسێ، وە مە گەر لە گورگیش بترسێ کە زیان بە ڕانەمەڕو مێگەلەکەی بگەیەنێ، بەڵام ئێوە پەلە دەکەن.

جا بێگومان ئەمەش هاتۆتە دی، چونکە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لە کاتێکدا ئەوەی فەرمووە کە هاوەڵە بەڕێزەکانی ئە شکەنجە دەدران‌و دەسەڵاتی نەبووو هیچی بۆ یان پێ نەدەکرا، بەڵکو هەر دەیفەرموو: خۆڕاگربن (صبراً آل ياسر فأنَّ موعدكم الجنَّةَ)!. بەڵام موژدەی ئەوەی پێ دان کە کاتێك دێ دەسەڵاتی ئیسلام ئەوەندە پەیدا دەبێ کە لە شاری (صنعاء)وە کەسێك بەتەنیا دەچێ بۆ (حضرموت) جگە لە خوا لە هیچ کەس ناترسێ، ئەوەندە ئاسایش‌و هێمنی لە سەر دەستی ئیسلام پەیدا دەبێ، کە بەس لە خوا دەترسێ‌و لەوەش دەترسێ کە نەبادا گورگێك زیان بە ڕانە مەڕەکەی بگەیەنێ.

جا ئەوە هاتۆتە دی‌و تێپەڕیوە، بەڵام دە شکۆنجێ دووبارە بێتەوە، خواش پشتیوان بێ دووبارە دەبێتەوەو دەسەڵاتی ئیسلام بەسەر جیهاندا پەیدا دەبێتەوە.

لە فەرموودەیەکی دیکەدا پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: **(اذا هَلَك كسرى فلا كسرى بعده، واذا هلك قَيْصَرُ فلا**

---

1) رواه البخاري عن خباب بن ارت -رضي الله عنه-

**قَيْصَرُ بعده، والذي نفس محمدٍ بيده لَتُنْفقُنَّ كُنوزَهُما في سبيل الله)**[1]، واتە: ئەگەر کیسرا لەنێو چوو، کیسرای دی دروست نابێتەوە، وە ئەگەر قەیسەر لەنێو چوو، قەیسەری دی دوای ئەو دروست نابێتەوە، بەو کەسەی کە گیانی محمدی بەدەستە، خەزێنەکانی کیسراو قەیسەر (خەزێنەکانی دەوڵەتی فارس ورۆم) لە پێناوی خوادا دەبەخشرێنەوە وسەرف دەکرێن. بێگومان ئەمەش وەك موعجیزەیەکی ئاشکراو ڕوون هاتۆتە دی‌و لە دوایی ئەوان کیسراو قەیسەرێکی دی نەهاتۆتە جێگایان‌و ئیسلام وڵات‌و مەملەکەتی هەردووکیانی بە میرات گرت.

هەروەها هەر لەوبارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە کە (عبدالله بن عمرو بن العاص) -خوا لێیان ڕازی بێت-، دەڵێ: **بينما نحن حول رسول الله ﷺ نكتب، إِذْ سُئلَ رسولُ الله: أيُّ المدينتين تفتحُ اولاً أقسطنطينية أو رومية؟! فقال رسول الله ﷺ مدينة هرقل تفتح أولاً، يعني قسطنطينية)**[2]، واتە: ئێمە لە دەوری پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین فەرمایشتەکانیمان دەنووسی، پرسیار لە پێغەمبەر کرا، ئایا کام لە دوو شارەکان لە پێشدا ئیسلام دەیانگرێ‌و رزگاریان دەکات، (قسطنطينية) (ئەستەمبوولی ئێستا)، یان (ڕۆما) (پایتەختی ئێستای ئیتاڵیا)؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: شاری (هیرەقل) لە پێشدا دەگیرێ (واتە: ئەستەمبووڵ)، کە ئەوە بوو لە سەردەمی (سوڵتان موحەمەدی فاتح)دا گیرا، بەڵام تا ئێستاش ڕۆمای پایتەختی ئیتاڵیا نەگیراوەو حەتمەن کاتێك دێ بگیرێ‌و ئازاد بکرێ، جا درەنگ بێ یان زوو!.

1) رواه البخاري.

2) رواه احمد والداري والحاكم، وصححهُ الحاكم و وافقهُ الذهبي، وصحَّحهُ الألباني.

2- پەیدابوونی چەندان دەجەجالٚو بانگەشەکەری پێغەمبەرایەتی: وەك پێغەمبەرمان (علیه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: **(لا تقوم الساعة حتى يُبْعَثُ دجّالون كذّابون قريبٌ من ثلاثين كل يزعم انه رسول الله)**[1]، واتە: قیامەت نایەت هەتا زۆرێك خەڵك هەڵخەڵەتێنەری درۆزن پەیدا دەبن، نزیکەی سی (30) کەس، هەرکامێکیان پێی وایەو واپێشانی خەڵك دەدا کە پێغەمبەری خوایە، (بەلاٚم بەبێگومانی هەموویان درۆزنن)، هەڵبەتە زۆر لەوانە تێپەڕیون، وەك: (مسيلمة الكذاب، أسود العنسي، سجاح اليمامة، طليحة الأسدي)و ژمارەیەکی دیکەش کە کەمو زۆر ناوو شۆرەتیان هەبووە.

3- ئاشووبو هەراو ئاژاوە پەیدا بوون: وەك پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموی: **(انَّ مِن أشراط الساعة أَنْ يُرفع العِلْمُ وَيكثُرَ الجهل، ويكثر الزّنا، ويكثر شُرْبُ الخَمر، ويَقِلَّ الرّجال، ويَكْثُر النساءُ حتّى يكون لخمسين امرأةً القَيّمُ الواحِدُ)**[2]، واتە: لە نیشانەکانی هاتنی قیامەت ئەوەیە کە زانیاری کەم دەبیٚو نەزانین زۆر دەبیٚو داوێن پیسی زۆر دەبیٚو شەڕاب خۆریی زۆر دەبیٚو پیاو کەم دەبنو ژن زۆر دەبن، هەتا وای لیٚدیٚ کە پەنجا (50) ئافرەت یەك پیاو سەرپەرشتی یان دەکات، (دیارە مەرج نیە هەموویان هاوسەری بن بەڵکو خوشكو کچو دایكو خزمو ئەوانەن، کە لە بەرامبەر پەنجا (50) ئافرەتدا پیاوێك دەبیٚ بۆ مشوور لیٚ خواردنیان).

---

1) متفق عليه، عن أبي هريرة ـ رضي الله عنه.
2) متفق عليه، عن أنس -رضي الله عنه-.

بەڵێ: هەرکام لەمانەش لەبەر چاومانن‌و کەم‌وزۆر هاتوونە دی‌و دێنەدی.

لە فەرموودەیەکی دیکەدا هاتوە: **(والذي نفسي بيده لـيأتينَّ عـلى الناس زمان لايدري القاتل في أي شيءٍ قتَل، ولا يدري المَقْـتُولُ في أي شيءٍ قُتِلَ)**[1]، واتە: سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە، ڕۆژگارێك بەسەر خەڵك دا دێت، کە نە کوژەر دەزانێ کابرای کوژراوی بۆ چی کوشتوە‌و نە کوژراویش دەزانێ بۆچی کوژراوە.

جا بەڕاستی ئەو جۆرە جەنگانەش ئێستاکە ڕوو یان داوە‌و ڕوودەدەن، کە ئەو جۆرە کوشتن‌و کوژرانەیان تێدا یەو نازانن بۆ چی دە کوژن‌و لەسەرچی دەکوژرێن.

4- نیشانەیەکی دیکە ئەوەیە کە لە فەرموودەکەی (جبريل)دا هاتوە، کە (جبريل) پرسیار لە پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) دە کات، دە ڵێ: **(فأخبرني عن أماراتها)** هەواڵم پێ بدە دەربارەی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی؟ پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام)یش لەوەڵامیدا فەرمووی: **(أَنْ تَلِدَ الأمَةُ رَبَّتَها، وأَنْ ترى الحُفاةَ العُراةَ رِعاءَ الشاه يَتَطاولون في البنيان)**[2]، واتە: کاتێك کە کەنیزەك (جارية) گەورە (سيدة)ی خۆی لـێ ببێ، وە ئەوەی کە خەڵکی پێ خواس (بێ پێڵاو)و ڕووت‌و حوشتر لەوەڕێن‌و مەڕ لەوەڕێن ببینی، کە پێشبڕکێ دەکەن لە بەرزکردنەوەی کۆشك‌و تەلاردا.

دیارە ئەمانەش هەموویان هاتوونە دی‌و ئێستاش لە ئارادان.

---

1) رواه مسلم، عن أبي هريرة -رضي الله عنه-.

2) رواه مسلم عن عمر بن الخطاب -رضي الله عنه-.

5- (گەلەکۆمەکی کردنی ئەهلی کوفر لەسەر ئومەتی پێغەمبەر ﷺ وەك پێغەمبەر فەرموویەتی: (**يُوشِكُ الأُمَمُ أَنْ تَداعى عليكم كما تَداعى الأَكَلَةُ الى قصْعَتِها، فقال قائلُ: أَوَ مِنْ قلَّةٍ نَحن يومئذٍ؟! قال: بَلْ أنتم يومئذ كثيرُ، ولكنكم غُثاءٌ كَغُثاء السَّيْلِ، ولَيَنْزِعَنَّ اللهُ مِنْ صُدور أعداءِكم المَهابَةَ مِنكُمْ، ولَيَقْذِفَنَّ اللهُ في قلوبكم الوهْن، فقال قائلُ، يارسول الله وما الوهْن؟! قال: حُبُّ الدُّنْيا وكراهية الموت**)[1]، واتە: نزیکە ڕۆژێك بێ کە کۆمەڵانی کافر لێتان کۆببنەوەو دەستتان بۆ درێژ بکەن، وەك چۆن کە کۆمەڵە خەڵکێك لەسەر سفرەی خواردنەکەیان دادەنیشن‌و هەریەکەیان دەستی بۆ درێژ دەکات‌و بەشی خۆی دەپچڕێنێت.

یەکێك گوتی: ئایا لەو ڕۆژەدا ئێمە کەمین، لەبەر کەمی وامان لێ دێت؟ فەرمووی: نەخێر ئێوە زۆرن، بەڵام وەك پووش‌و پەڵاش وان، (ئاوا بێ نرخ‌و بێ سەنگن) وە خوا ترسی ئێوە لە دڵی دوژمنانتاندا دەردێنێ، وە بێ هێزیی دەخاتە دڵی ئێوەوە، یەکێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا (وهن) چی‌یە؟ فەرمووی: خۆشویستنی دونیاو ڕق هەستان لە مردن.

ئەوەش دیارە کە هاتۆتە دی‌و لە ئارادایە وهیچ کافرێك نەماوە کە پارووی خۆی لە خێروبێری وڵاتی مسوڵمانان دا نەگرتبێ!

6- پەیدابوونی پیاوانی قەمچی بە دەست‌و ژنانی بێ ئابڕوو: وەك لە فەرموودەیەکدا هاتوە: (**صِنْفانِ مِنْ أهل النار لَمْ أَرهما: قومٌ معهم سياطٌ كأذناب البقر يضربون بها الناس، ونساءٌ كاسياتٌ عارياتٌ مُميلاتٌ مائلاتٌ رؤسهنَّ كأسنمة البُخْتِ المائلة**)[2]، واتە: دوو تاقمی

1) رواه احمد وابو داود وصححه الألباني، بڕوانه (سلسلة الأحاديث الصحيحة) ژماره 958

2) رواه مسلم عن ابي هريرة ـ رضي الله عنه ـ.

دۆزەخیی هەن کە هێ شتا نەمبینیون: پیاوانێك کە قەمچی یان بەدەستەوەیە وەکو کلکی مانگا، پێی لە خەڵکی دەدەن (و زوڵم و زۆری پێ ئەنجام دەدەن) وە ئافرەتانێکی خۆداپۆشەری ڕووت، خەڵك لادەری، ڕێ لێ ون بوو، سەریان دەڵێی دووگی حوشترە - مەبەست بەرزایی پشتیەتی کە لار بۆتەوە-.

ئەم دوو نیشانەش بێگومان هەردووکیان هاتوونەدیو لەبەر چاون و بەردەوامن.

7- نیشانەیەکی دیکە ئەوەیە کە پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) دەفەرموێ: **(سيأتي على الناس سنوات خدّاعات يُصَدَّقُ فيها الكاذِب، وَيُكذَّبُ فيها الصادِقُ، ويُؤتَمَنُ فيها الخائنُ ويُخَوَّنُ فيها الأمين، ويَنْطِقُ فيها الرُّوَيْبِضَةُ، قيل: وما الرُّوَيْبِضةُ؟! قال: الرَّجل التّافِهُ يتكلَّم في أمْرِ العامَّة)**[1]، واتە: ساڵانێکی خەڵك فریودەر بەسەر خەڵکدا دێن، پیاوی درۆزن بە ڕاست دەزانرێ و پیاوی ڕاستگۆ بە درۆزن لەقەڵەم دەدرێ و پیاوی خیانەتکار بە ئەمیندار دادەنرێ و پیاوی ئەمین بە خیانەتکار لەقەڵەم دەدرێ، وە لەو زەمانەدا (رويبضة) قسە دەکات و دەبێتە دەم ڕاست، گوترا: (رويبضة) چی یە؟ فەرمووی: پیاوی هیچ وپووچ کە قسە دەربارەی بەرژەوەندی خەڵك دەکات.

سەرنج بدەن ئێستا لەم ڕۆژگارەدا ئەم نیشانەیە چۆن هاتۆتە دی! بە ئیسلامییەکان کە خەڵکی دیندارو پاك و ڕاست ڕاستگۆو دەست بە دەستنوێژن، دەگوترێ: گێرەشێوێن و پیاو خراپ و دواکەوتوو!!

1) رواه احمد وابن ماجة والحاكم عن ابي هريرة، وصححه الألباني، ژمارە (1887)

بەڵام خەڵکی بێدین‌و دزو درۆزن‌و ساختە چی‌و قوڵ بڕو فێڵ بازو چەواشەکار، بە پیاوی باش‌و خەمخۆرو سیاسەتمەدارو ڕۆشنبیر دادەنرێ!، وە لە ڕاستیدا ئەو جۆرە (رويبضة)انەی کە فەرموودەکە باسیان دەکات، لەم ڕۆژگارەدا یەکجار زۆرن، دەبینی کابرا قسە لەبارەی خەڵك‌و میللەتەوە دەکات، کەچی هەتا بڵێی پووچ‌و نزم‌و بێ نێوەڕۆکە!!



## بەشی سێیەم: لە نیشانە نزیکەکان ئەوانەن کە جارێ نەهاتوون:

لەم بەشەش پێنج نموونە دەخەینەڕوو:

1/ دووبارە گەڕانەوەی دوورگەی عەرەبی بە ڕووبارو باغ‌و بێستان: وەك پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: **(لاتقوم الساعة حتى يكثر المال ويفيض حتى يخرج الرجل بزكاة ماله فلايجِدُ أحداً يقبلها منه وحتى**

**تعود أرض العرب مُروجا وأنهاراً)**[1]، واته: قیامەت نایەت هەتا پارە زۆر دەبێو كەلەڕێژەیی دەكات بە جۆرێك كە كابرا زەكاتی ماڵو سامانی دەردەكات بەڵام كەسی چنگ ناكەوێ لێی وەربگرێ، وە هەتا سەرزەمینی عەرەب دەبێتەوە بە باغو سەوزاییو جۆگەو ڕووبار.

دیارە ئەمەش نەهاتوە بەڵام خەریكە بێتە دی بە هۆی بیری ئیر تیوازی وە بە هۆی ئەو هەموو پارەو سامانەی نەوت كە دێتە دەستیانو وردە وردە بیابانو دەشتە دێمەكان ئاودێر دەكرێنو دەكرێنە باغو دارستان.

2/ ئەوەیە كە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرموو یەتی: **(والّذي نفسي بيده لاتقوم الساعة حتى يُكَلِّم السّباعُ الأنْس، و يُكَلِّم الرَّجُلَ عُذبة سوطه وشِراكَ نَعْلِهِ ويُخْبِرُهُ فَخِذُه بِما حَدَّثَ أهله بعده)**[2]، واته: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، قیامەت نایەت هەتا دڕندە قسە لە گەڵ خەڵكیدا نەكات، وە هەتا سەری قەمچیو لاسكی پێڵاوەكەی پیاو قسەی لەگەڵدا نەكات، وە هەتا ڕانی خۆی هەواڵی پێ نەدا بەوەی كە دوای خۆی ماڵو خێزانی چیان باسكردوە، ئەوانەش جارێ بە زەقی نەهاتوونە دی.

3/ وشك بوونی ڕووباری فوراتو دەر كەوتنی خەزێنە یەكی زێڕ: وەك پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرموو یەتی: **(يُوشِكُ الفُراتُ أنْ يَحْسِرَ عن كنز منْ ذَهبٍ فَمَنْ حَضَرَهُ فلا يأخذْ منه شيئاً)**[3]، واتە: نزیكە ڕووباری فورات وشك بێو خەزێنەیەكی زێڕ دەربخات، جا هەر

1) رواه مسلم و أحمد عن ابي هريرة -رضي الله عنه- وفي صحيح مسلم برقم: 1012.
2) ابن حبان وحاكم به (صحيح)يان داناوه، وه (ذهبي)يش پشتگيريى كردوون و (ألألباني)يش به (صحيح)ى داناوه، ژماره(122) .
3) متفق عليه عن أبي هريرة -رضي الله عنه-.

کەسێك ئامادەبوو لەوێ با هیچی لـێ هەڵ نەگرێ. لە ڕیوا یەتێکی دیکەدا فەرموویەتی: (**فَيَقْتَتِلونَ عليه فَيُقْتَل مِنْ كلِّ ما ئةٍ تسعة وتسعون**)[1]، واتە: خەڵك لەسەر ئەو خەزنەیە بەشەڕ دێتو لە هەر سەد کەس نەوەدونۆ کەس دەکوژر یێتو یەکێك دەمێنێ تەوە، (وا تە: لە ملیۆنێك هەزار دەمێنێتەوە)، ئەمەشیان ڕێ خۆ شکەرەکانی هاتوون، وەك ئەو بەربەستە (سد)انەی کە تورکیا درو ستی کردوون لە سەر ڕووباری فوڕات، کە ژمارە یان زۆرەو وەك دە ڵێن: ئە گەر هەموویان جێبەجێ بکرێنو بکەونە کار بۆی هەیە ڕوباری فوڕات و شك ب بێو چۆڕایی لـێ ببڕێ.

4/ جەنگ لەگەڵ جوولەکەدا دەکرێو بەرد بانگی مسوڵمانان دەکات کە ئەوە جوولەکەیەو لە پشتمەوە خۆی حە شارداوە، وەرن بی کوژن: وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (عن عبدالله بن عمر - رضي الله عنهما - أن رسول الله ﷺ قال: **تقتتلون أنتم ويهود، حتى يقول الحجر: يا مُسْلِمُ هذا يهوديّ ورائي تعال فاقتلْهُ**) **رواه مسلم، برقم: 2921**، د یارە ئەمەشیان تا ئێستا نەهاتووەو حەتمەن دوایی دێ.

5/ هاتنی موحەمــمەدی مەهدی: کە واپێ دەچێ ئەمەیان کۆتا نیـ شانەی نزیك بێ لەوانەی کە جارێ نەهاتوون.

جا لەوبارەوە چەند فەرموودەیەك هاتوون کە هەندێکیان بە ڕوون یی هەندێکیشیان بە ئاماژە لەوبارەوە دەدوێن، بۆ نموونە: (**لا تَذْهَبُ الدنيا**

1) رواه مسلم عن أبيّ بن كعب -رضي الله عنه- برقم: 2895.

**حتى يَمْلِكَ العَرَبَ رَجُلٌ مِنْ أهل بَيْتي يُواطِئُ اسْمُهُ آسْمي)**[1]، واتە: دونیا كۆتایی پێ نایەت هەتا پیاوێك لە بنەماڵەی من دەكرێتە دەسەڵاتدار بەسەر عەرەبدا، ناوی وەك ناوی من وایە.

وە زانایان دەڵێن: ئەم فەرموودەیەش وا پێدەچێ كە مەبەستی پێ ئەو كەسەبێ كە دەفەرموێ: **(يكون في آخِرِ أُمَّتي خليفةٌ يَحْثي المالَ حَثْياً، لا يَعُدُّه عداً)**[2]، واتە: لە كۆتایی تەمەنی ئۆمەتـمدا خەلیفەیەك دەبێت، كە پارەو سامان بە چنگو بەمشت دەدا بە خەڵكی دەیبەخشێتەوە، نەك بیژمێرێ!

دیارە دەربارەی ئەو فەرموودانە كە باسی موحەممەدی مەهدی دەكەن، زانایان ڕاجیایی‌یان لە نێواندا هەیە، هەندێكیان زۆربەی یان هەموو ئەو فەرموودانە بە لاوازو هەڵبەستراو دادەنێن‌و، گومانیش تێدا نییە كە هەڵبەستراوو لاوازیان تێدایە، بە تایبەتی ئەوانەیان كە ڕەگو ڕیشاڵیان دەچێتەوە سەر شیعە، چونكە شیعە زۆر بە سەختی‌و خەستی بڕوایان بە (مەهدی) هەیە، بەڵام بێگومان ئەوەی ئەوان بڕوایان پێیی هەیە جیایە لەوەی كە ئەهلی سوننەت بڕوایان پێی هەیەو ئەهلی سوننەت ئەو مەهدی یەی ئەوان بە ئەفسانەو بێبناغە دەزانن‌و دەڵێن هیچ بەڵگەیەكی شەرعی‌و عەقلّی لەسەر نیە.

شایانی باسیشە كە ژمارەیەكی زۆر لە زانایانی ڕەسەنی ئیسلام كە بە ئەهلی سوننەت ناسراون بڕوایان وایە كە ئەو فەرموودانەی باسی هاتنی مەهدی دەكەن بە گشتی ڕاستن، هەرچەندە هی هەڵبەستراوو بێهێزیشیان

1) رواه الترمذي وأبو داود، عن ابن مسعود -رضي الله عنه-
2) رواه مسلم عن جابر بن عبدالله ـ رضي الله عنهما ـ برقم 2913.

تێدان، بۆ نموونە: (الحاكم، الذّهبي، أبو نُعَيمْ، ابن العربي، القرطبي، ابن تيمية، ابن القيم، ابن حجر العسقلاني، سيوطي، ابن باز، ألباني) لەو زانایانەن کە بڕوایان بە ڕاستی ئەو فەرموودانە هەیە کە باسی مەهدی دەکەن، بەڵام ئەگەر کەسێکیش بڵێ: بڕوام بە هاتنی مەهدی نیە، ناتوانین بڵێین، کوفری کردوە، چونکە ئەسڵی مەسەلەکە مەشتومڕێکی لە سەر هەیەو بە درێژایی مێژووش ژمارەیەك لە زانایان نکوولّیان لە مەسەلەی هاتنی مەهدیو ڕاستیی ئەو فەرموودانەش کردوە کە لەوبارەوە گێڕراونەوەو هیچکەسیش بە کوفر تۆمەتباری نەکردوون.

ئەمە کورتەیەك بوو دەربارەی نیشانە نزیکەکانی هاتنی ڕۆژی دواییو لە خاڵی داهاتووشدا باسی نیشانە دوورەکان دەکەین ان شاء الله تعالى.



## خاڵی شەشەم:

## نیشانە دوورەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی

خوێنەری بەڕێز!

ئەم خالّی شەشەمە تەرخان کراوە بۆ تویێژینەوە لەبارەی نیشانە دوورەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی کە وەك پێشتر باسمان کرد زانایان زیاتر وشەی: نیشانە گەورەکان (ألأشراط الكبرى) یان بۆ بەکارهێناون، بەلاّم ئێمە وشەو تەعبیری: نیشانە دوورەکان بە چاکترو ڕاستتر دەزانین، جا نیشانە دوورەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی بە دەقی فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ ژمارەیان دە (10)یەو بەڕیزو بە خێراییش بە دوای یەکدا دێنو ئەوانیش بریتین لە:

1- هاتنی دەججال .
2- هاتنە خوارەوەی عیسا - علیه السلام -.
3- دەرچوونی یەئجوج و مەئجوج .
4- پەیدابوونی دووکەڵ .
5، 6، 7- ڕۆچوونی سێ شوێن لە ڕۆژ هەلاّت و ڕۆژ ئاواو دوورگەی عەرەب.
8- هاتنەدەری زیندەوەری زەوی .
9- هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە .
10- ئاگرێك کە خەڵك بەرەو شام ڕاپێچ دەکات .

ئێستاش با بەڕیز بە تویێژینەوەی ئەم دە نیشانە گەورەو دوورانەی هاتنی ڕۆژی دوایی بچینەخوار بەلاّم سەرەتا چۆنیەتی ڕیز بوونو پەیدابوونیان دەخەینەڕوو:

خوێنەری بەڕێز!

**1/** پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی نیشانە گەورەو دوورە کانی هاتنی قیامەتەوە ئەم فەرموودەیەی لێوە هاتوە: (**عن حذيفة بن أسيد الغِفاريّ قال: اطّلع النبيّ ﷺ ونحن نتذاكر، فقال: ما تذاكرون؟ قالوا: نَذْكُرُ الساعة، فقال: إنّها لَنْ تقوم حتّى تَرَوْنَ قبلها عشر آيات، فَذَكَر، الدُّخان، والدَّجّال، والدّابّة، وطُلوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِها، ونُزُلَ عيسى ابْنِ مريم (عليه السلام)، ويأجوج ومأجوج، وثلاثة خسوف، خسف بالمشرق، وخسف بالمغرب، وخسف بجزيرة العرب، وآخر ذلك نارٌ تخرج من اليمن تَطْرُدُ النّاس الى محشرهم**)[1]، واتە: حوذەیفەی کوڕی ئەسیدی غیفاری دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ هاتە لامان کە ئێمە لەنێو خۆمان دا قسەمان دە کرد، فەرمووی باسی چی دەکەن؟ گوتمان: باسی هاتنی قیامەت دە کەین، فەرمووی: قیامەت نایەت تاکو دە (**10**) نیشانە لە پێشەوە دەبینن، ئنجا باسی ئەمانەی کرد: دووکەڵ، دەججال، زیندەوەرێك[2] (کە قسە لەگەڵ خەڵکیدا دەکات) هەڵهاتنی خۆر لە ڕۆژئاواوە، هاتنەخوارەوەی عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێ بێ)، هاتنی یەئجووجو مەئجووج، وە سێ ڕۆچوونی زەوی، یەکێك لە ڕۆژهەلات، یەکێك لە ڕۆژئاوا، یەکێکیش لە نیوە دوورگەی عەرەبی، وە کۆتایی ئەوانە ئاگرێکە لە یەمەن پەیدا دەبێت، کە خەڵك بەرەو شوێنی کۆبوونەوەیان ڕاپێچ دەکات (کە مەبەست سەرزەمینی شامە وەك لە فەرمایشتی دیکەدا هاتوە).

---

1) رواه مسلم و ابوداود والترمذي وفي صحيح مسلم برقم: 2901

2) وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا وَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَابَّةً مِّنَ الْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ النَّاسَ كَانُوا بِآيَاتِنَا لَا يُوقِنُونَ ﴾ (النمل-82) .

شایانی باسیشە کە ئەم دە نیشانەیە وەك (نیشانە نزیکەکان) نین، کە ماوەی زۆریان لەنێواندا هەبێت، بەڵکو هەموویان بە دوای یەکتردا دێن، وەك چۆن کە ملوانکەیەك دەزووەکەی بپچڕێ و هەموو دەنکەکانی یەك لەدوای یەك بکەونە خوارێ، ئەوانیش لە کاتێکی نزیکدا بە دوای یەکدا دێن، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە: **(عن أنس ـ رضي الله عنه ـ قال: قال رسول الله ﷺ الأمارات خَرَزاتٌ مَنْظوماتٌ في سِلْكٍ، فَأنْ يُقْطَع السِّلْكُ يَتْبَعُ بَعْضُها بعضاً)**[1]، واتە: نیشانە (دوورە)کانی (هاتنی قیامەت) وەك ملوانکەیەك وان کە بە دەزوویەکەوە کرابن کاتێك کە دەزووە کە پچڕا هەموویان بە دوای یەکدا بکەونە خوار. کەواتە نیشانە دوورەکان هەرکات یەکەمیان دەرکەوت، زۆری پێ ناچێ کە ئەوانی دیکەش دەردەکەون[2].

ئێستاش بە پێویستی دەزانم تۆزێك تیشك بخەینە سەر چۆنیەتی سەرهەڵدان و شێوەی ڕیزبەندیی ئەو دە نیشانەیە کە زانایان قسەو باسی زۆریان لەوبارەوە کردوە، هەر لە هاتنی دەججاڵەوە هەتا ئەو ئاگرەی کە لە یەمەن پەیدا دەبێت و خەڵك بەرەو شام ڕاپێچ دەکات، کەوەك پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونی کردۆتەوە دوایین نیشانەیە.

جا ئەوەی کە من لە کۆی فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ و قسەو تەفسیری زانایان و سەرنجدانی خۆمەوە بۆم دەرکەوتوە چۆنیەتی سەرهەڵدان و دەست پێکردنی ئەو نیشانانەو ڕیز بوونیان بەم جۆرەیە:

---

1) رواه الحاكم وقال: صحيح على شرط مسلم، ووافقه الذهبي، و صححه الألباني برقم (1762).

2) بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کە لە ماوەیەکی ساڵێك یان چەند ساڵێکی کەمدا ڕوودەدەن، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە چەند سەدەیەك و بگرە سەدەیەکیشیان پێ ناچێ.

جارێ لە سەرەتاوە كۆمەڵێك جەنگ و ڕووبەڕووبونەوە لەنێوان ئەهلی ئیسلام و ئەهلی كوفردا ڕوودەدەن كە دەبنە پێشەكی و زەمینە خۆ شكەری هاتنی دەججال وەك لەم فەرموودەیەی پێغەمبەردا ﷺ دەردەكەوێ، كە دەفەرموێ: (**عِمرانُ بيتِ المَقْدِس خَرابُ يَثْرِب، وخرابُ يثرب خُروجُ المَلْحَمَةِ، وخروج المَلْحَمة فَتْحُ القسطنطينيية، وفتح القسطنطينيية خروج الدجّال**)[1]، واتە: كاتێك دێ كە (بيت المقدس) زۆر ئاوەدان دەبێتەوە، بەڵام (يثرب) واتە (شاری مەدینە) تێكدەچێ، وە تێكچونی مەدینە، (مَلْحَمة)ی بەدوادا دێ (كە گەورەترین جەنگە لەنێوان مسوڵمانان و نەصرانییەكاندا ڕوو دەدات، و بە سەركەوتنی مسوڵمانان كۆتایی پێدێت) ئنجا ڕوودانی (ملحمة) یەكسەر گرتنی ئەستەمبووڵی بەدوادا دێت (واتە: بۆجاری دووەم) وە گرتنی ئەستەمبووڵیش یەكسەر دەرچوونی دەججاڵی بەدوادا دێت.

ئنجا ئەو مەلحەمەیەش كە گرتنی ئەستەمبوڵ (قسطنطينيية)ی بەدوادا دێ، كە بە دوای ویشدا دەرچوونی دەججالە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوای باسی دەكات: (**ستصالحون الروم صُلحاً أَمْناً فتغزون أنتم وهُم عدّواً مِنْ ورائكم فَتُنْصَرون، وتَغْنمون، وتَسْلَمون، ثم ترجعون، حتى تَنْزِلون بِمَرْجٍ ذي تُلولٍ، فيَرْفَعُ رجلٌ مِنَ أهل النَّصرانية الصَّليب، فيقول غَلَبَ الصَّليبُ، فَيَغْضَبُ رجلٌ من المسلمين فَيَدُقُّهُ، فعند ذلك تَغْدِرُ الروم وتَجْمَعُ للملحمة**)[2]، واتە: كاتێك دێت كە سوڵحێك لەگەڵ ئەوروپا (روم)دا دەكەن و هەردووك لاتان لە یەكدی ئەمین و دڵنیا دەبن، و ئێوە و ئەوان جەنگێك لەگەڵ دوژمنێكتاندا دەكەن كە لە پشت ئێوەوەیە و بە سەریاندا سەردەكەون و

1) رواه أبو داود، بڕوانە (مشكاة المصابيح) ژمارەی فەرموودە (5425) .
2) رواه أبو داود، هەمان سەرچاوە، ژمارەی فەرموودە كە (5428) .

دەستکەوتتان لێیان دەبێ‌و سەلامەتیش دەبن‌و پاشان دەگەڕێنەوە، تا لە شوێنێك پشوو دەدەن کە باخ‌و بێستان‌و تەپۆڵکەی زۆری تێدا یە، لەوێ یەکێك لە نەصرانییەکان خاچ (صلیب)ەکەیان بەرز دەکاتەوەو دەڵێ: خاچ سەرکەوت! پیاوێکیش لە مسوڵمانان لێیان توڕە دەبێ‌و خاچەکەیان لێ دە شکێنێ، لەوکا تەدا ڕۆ مەکان پەیمانە کەیان (لە گەڵ مە سوڵمانان) دەشکێنن‌و بۆ جەنگە گەورەکە (ملحمة) هێزێکی زۆر کۆدەکەنەوە.

ئنجا چۆنیەتی ئەو جەنگە گەورەیەش کە بە (المَلْحَمة) ناسراوەو وادیارە گەورەترین جەنگە لە نێوان مسوڵمانان‌و خاچ پەر ستەکان (الـ صَّلیبیّین)دا ڕوودەدات پێش کۆتایی هاتنی دونیا، بەم شێوەیەیە وەك پێغەمبەری خوا ﷺ لەم فەرموودەیەدا بۆمان باس دەکات: **(لا تقوم الساعة حـتى يَـنْزِل الرُّوم بالأعْماق أو بِدابِقَ، فَيَخْرُج لَهُمْ جيشٌ من المدينة من خـيار أ هل الأرض يومئذٍ، فأذا تصافّوا قالَتِ الرُّوم: خلُّوا بَيْنَنا و بين الذين سَبَوْا مِنّا، نُقاتِلُهُمْ، فيقول المسلمين لا، والله لا نُخلِّي بينكم وبين إخواننا، فيقاتلونهم فَيُهْزَمْ ثُلثُ لايتوبُ الله عليهم أبداً، ويُقْتَلُ ثُلُثهم أفضل الشّهداء عند الله، ويَفْتَتِحُ الثُّلُثُ لا يُفْتَنون أبداً، فَيَفْتَتِحون قسطنطينية، فَبينَما هم يَقتَسِمون الغنائم قد عَلَّقوا سيوفَهُم بالزَّيتون إذ صاح فيهم الشَّيطان: إنَّ المسيح قد خَلَفَكُم في أهليكم فَيَخْرجون، وذلك باطِل، فأذا جاؤا الشّام خَرَجَ، فبينما هم يَعِدُّون للقتال يُسَوُّون الصُّفوف، إذ أقيمتِ الصَّلاةُ فَيَنْزِلُ عيسى إ بْنُ مريم (عليه الصلاة والسلام) فأمَّهُم، فأذا رآه عدُّو الله، ذابَ كما يَذُوبُ المِلْحُ في الماء، فَلَو تركه لانذابَ حتى يَهْلِكَ، ولكن يَقْتُلُه الله بِيَدِهِ فَـيُريهمْ دَ مَهُ في حَرْبَـتِهِ)**[1]، وا تە: قیا مەت نا یەت تاکو ڕۆم (ئەورووپیـ یە

1) رواه مسلم عن أبي هريره، برقم: 2897.

نەصرانییەکان) دێن بۆ (أعماق) یاخود (دابِق)[1] جا کاتێك لەوێ دادەمەزرێن، سوپایەکی مسوڵمانان لە مەدینەوە دێت، کە باشترینی خەڵکی سەرزەوین لەو کاتەدا، جا کاتێك کە بەرامبەر بە یەك دەوەستنو ڕیز دەبەستن، نەصرانییەکان بە مسوڵمانەکان دەڵێن: لێمانگەڕێن با جەنگ لەگەڵ ئەو کۆمەڵە مسوڵمانەی دیکەدا بکەین، کە خەڵکیان لە ئێمە ئەسیر کردوە (دیارە مسوڵمانەکان دوو بەش بوونو پێشتر هەندێکیان لەگەڵیاندا جەنگاونو خەڵکێکیان لێ بە دیل گرتوون) بەڵام (ئەو سوپایەی کە لە مەدینەوە هاتوون) دەڵێن: نەخێر بە خوا لێتان ناگەڕێین، جەنگ لەگەڵ برایەکانمان دا بکەن، ئیدی سەرەنجام (ڕۆمەکان) جەنگیان لەگەڵ دەکەنو ئەو سوپایەی مسوڵمانان دەبنە سێ بەش: سێ یەکیان پشت لە دوژمن دەکەنو هەرگیز خوا، لەوانە خۆش نابێت.

سێ یەکیشیان لە پێناوی خوادا دەکوژرێن، کە لای خوا چاکترین شەهیدن، سێ یەکیشیان سەردەکەون کە هەرگیز گیرۆدەی گوناهو خراپە نابن، (واتە: ئەوانە لە ئاکامی ئەو خزمەتە گەورەیەدا کە بە ئیسلامو مسوڵمانانیان کردوە، خوا -عزّوجلّ- ئەو چاکەیان لەگەڵ دەکات کە لە گوناهو خراپە دەیانپارێزێ).

پاشان (قسطنطينية) (واتە: ئەستەمبووڵ) دەگرن، جا لە کاتێکدا کە خەریکی دابەشکردنی دەستکەوت (غنيمة)ن، وە شمشێرەکانی خۆیان بە درەختی زەیتون هەڵواسیوە، شەیطان بانگ دەکات دەڵێ: ئەوە دەججال لە پشتتانەوە هاتە نێو ماڵو منداڵتان، بەڵام ئەو قسەیە ڕاست نابێ، بەڵام کاتێك دەچنە شامێ ئەوجار (دەججال) دێ، جا کاتێك کە ئەوان خۆیان

1- (أعماق) و (دابق) دوو شوێنن لە نزیکی شاری (حلب) لە سووریای ئێستا.

ساز دەکەن (بۆ جەنگێکی چارەنووس سازو یەکلاییکەرەوە لەگەڵ دەججالّدا)و ڕیزەکانی خۆیان ڕێك دەخەن، خەریکی نوێژ دەبن و قامەت دەخوێنرێ بۆ نوێژ، یەکسەر لەو کاتەدا (عیسای کوڕی مەریەم) دێتە خوارێ (سەلامی خوای لە سەربێ) پێشنوێژیی بۆ مسوڵمانان دەکات[1].

جا کاتێك (کە لە نوێژەکەیان بوونەوە، لەوکاتەدا) کە (دەججالی) دوژمنی خوا، (عیسا) دەبینێ دەپووکێتەوە وەك چۆن خوێ لەنێو ئاودا دەتوێتەوە (ئەویش ئاوا دەتوێتەوە) وە ئەگەر وازی لێ هێنابایە، هەر لەوێ دەتوایەوەو لەنێو دەچوو، بەڵام خوا بەدەستی وی (واتە: عیسا -علیه السلام-) دەیکوژێ‌و خوێنەکەییان پێشان دەدات بە نێزەکەیەوە. (تاکو بۆیان دەربکەوێ کە ئەو کەسەی لافی ئەوەی لێ دەدا کە خوای خەڵکییە! جگە لە دروستکراوێکی بێهێزی خوا چیدیکە نەبووا). کەوا تە: لەم فەرموودانەدا دەردەکەوێ کە یەکەمین نیشانە لە دە نیشانە گەورەو دوورەکانی قیامەت بریتیە لە هاتنی دەججاڵ، وە دەردەکەوێ کە دووەمین نیشانە، هاتنە خواری (عیسا)یە (علیه الصلاة والسلام)، وە (عیسا) کۆتایی بە تەمەنی شوومی چل ڕۆژەی دەججاڵ دێنێ.

وە لە فەرموودەکاندا دەردەکەوێ کە سێ هەمین نیشانە بریتیە لە هاتنی یەئجووج‌و مەئجووج، چونکە لە دوای هاتنە خواری (عیسا)و لەنێوچوونی دەججاڵ خوا -تبارك وتعالى- وەحی بۆ عیسا -علیه السلام- دەنێرێ کە: (ئەوە جۆرە دروستکراوێکی من هاتن، هیچ کەس ناتوانێ پێشیان پێ بگرێ، جا ئەی عیسا تۆ خۆت‌و ئەو مسوڵمانانەی کە لەگەڵت

1- چەکەکانیان، کە مەرج نیە هەر شمشێر بێت ڕەنگە پێغەمبەریش ﷺ و شەی (أ سلحتهم) چەکەکانیانی بەکارهێنابێ‌و ڕاوییەکە گۆڕیبی بە (سیوفهم) .

دان بچن بۆ کێوی (طور) لەوێ خۆتان پەنا بدەن)[1]، وەك دوا یی با سی دەکەین، کەواتە: سێهەمین نیشانە، هاتنی یەئجووج و مەئجووجە، ئەم سێیانە بە دوای یە کدا د ێن، وە (یەئجووج و مەئجووج)یش هەر لەسەردەمی (عیسا)دا خوا عزّوجلّ- لەنێویان دەبات، پا شان بارانێك دەبارێ و زەوی یان لێ پاك دەبێتەوە[2].

ئنجا ئایا ئەو شەش نیشانەی دیکە واتە: ﴿دووکەڵ و زی ندەوەری زەوی (دابة الأرض) و سێ ڕۆچوونەکان، وە هەڵهاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە﴾ کام یان پێش کامیانە و کامیان دوای کامیانە؟! ئەوە -بە بۆچوونی من- زۆر ڕوون نیە، بەڵام دڵنیاین کە دوایین نیشانە لەو نیشانە دوورو گەورانە، بریتییە لەو ئاگرەی کە لە یەمەنەوە پەیدا دەبێت و خەڵك ڕاپێچ دەکات بەرەو شام، کە لە هەندێ لە فەرموودەکاندا بەناوی (شام) هاتوە، لە هەندێکیشیاندا بەناوی (محشر) هاتوە، چونکە خەڵك لەوێ کۆدەبێتەوە، نەك وەك هە ندێك گومانیان بردوە لەوێ پاش زیندووکرانەوە حەشرو حیسابیان بکرێ! بەڵکو مەبەست ئەوەیە پێش ئەوەی دونیا کۆتایی پێ بێت خەڵك یان خەڵکی مسوڵمان بە تایبەت بە زۆری لەوێ کۆدەبێتەوە، چونکە لەوەدا هەندێ لە زانایانیش بە هەڵەدا چوون و پێیان وابووە مەبەستی فەرموودەکان ئەوەیە کە خەڵك لەوێ کۆ دەبێتەوە بۆ حەشرو حیساب! نەخێر بەڵکو مەبە ست ئەوەیە کە پێش هاتنی کۆتایی دونیا بە زۆری خەڵك لەوێ کۆدەبێتەوە، بە تایبەتی خەڵکی مسوڵمان.

---

1) بڕوانە (صحيح مسلم) ص 1569، برقم: 2137.
2) بڕوانە (صحيح (مسلم) ص 1570، برقم: 2137.

جا لێرەدا فەرموودەیەك هەیە كە جۆرێك لە ئیشكالی دروست كردوە، كە دەفەرمویٚ: **(انَّ أول الآيات خروجاً طلوع الشمس من مغربها، وخروج الدابّة على الناس ضُحَىً، وأيهما كانت قبل صاحبتها، فالأخرى على إِثْرِها قريباً)**[1]، واتە: یەكەمین نیشانە لە نیشانە دوورەكان كە پەیدا دەبیٚ هەڵهاتنی خۆرە لە ڕۆژئاواوە، پاشان پەیدابوونی گیاندارى زەوى (دابة الأرض)ە، كە لە كاتی چێشتەنگاودا پەیدا دەبێت، جا هەركامێكیان پێشتر هات، ئەوەی دیكەش دوای وی پەیدا دەبێت، (ابن حجر العسقلاني) ڕەحمەتی خوای لێبیٚ، دەڵیٚ: ئەوەی كە دەردەكەویٚ ئەوەیە كە نیشانە گەورەكان دوو جۆرن، بەشێكیان نیشانەی سەر زەوینو پەیوەندییان بە سەر زەوییەوە هەیە، بەشێكیشیان پەیوەندییان بە ئاسمانەوە هەیە، واتە: بەشێكیان (سُفْلي)ن، وە بەشێكیان (عُلْوي)ن، دوایی دەڵیٚ: لە نیشانە زەمینییەكان دیارە دەججاڵ لە پێش هەموویانەوە پەیدا دەبێت، وە لە نیشانە ئاسمانییەكانیش خۆر لە پێش هەموویانەوە لە ڕۆژئاواوە هەڵدێت[2].

كەواتە فەرموودەكەی پێغەمبەر ﷺ كە دەفەرمویٚ: (یەكەمین نیشانە خۆرە كە لە ڕۆژئاواوە هەڵدیٚ، واتە: لە نیشانە ئاسمانییەكان، چونكە كاتێك كە خۆر لە ڕۆژئاواوە هەڵدیٚ، تازە خەڵك هەمووی ئیمان دێنێت بەڵام سودی نیە. كەواتە: حەتمەن پێش ئەوەی كە خۆر لە ڕۆژئاواوە هەڵبیٚ. دیارە دەججاڵیش هاتوەو (عیسا)ش هاتۆتە خوارێو یەئجووجو مەئجووج هاتوونو ئەو شتانە هەموویان ڕوویان داوە ئنجا خۆر لە ڕۆژئاوا هەڵدیٚو ئیمان هێنان سوودی نابیٚ، چونكە، ئەوكاتە كۆتایی دونیایەو نیشانەكانی

1) رواه مسلم عن عبدالله بن عمر بن عاص
2) فتح الباري، بەرگی 11 لاپەڕە (353) .

خوا هێندە زەقن خەڵك ئیمانێکی ناچاری دێنن نەك ئیختیاری‌و هیچ هونەرو ئازایەتی تێدا نیە.

ئێستاش کە چۆنیەتی پەیدابوونی نیشانە دوورەکان‌و ڕیزبەندیی‌یانمان خستەڕوو، با هەڵوەستەیەك لە بەرانبەر هەرکام لەو دە نیشانەیەدا بکەین، بەتایبەت یەکەم‌و دووەم‌و سێیەمیان: ﴿هاتنی دەججال‌و هاتنەخوارەوەی عیسا -علیه السلام-و دەرچوونی یەئجووج‌و مەئجووج﴾، ئەوانی دیکەش بە کورتی بەسەریاندا ڕەت دەبین:

## یەکەم: هاتنی دەججالْ (علیه اللعنة):

### 1- ناوەکەی:

پێی دەگوترێ (المسیح الدّجّال)، جا عیسای کوڕی مەریەم -علیه السلام- پێی دەگوترێ (المسیح)ەوە دەججاڵیش هەر پێی دەگوترێ (المسیح)، بەڵام زانایان دەڵێن: ناوی (المسیح) بۆ عیسا، (فعیلٌ بمعنى الفاعِل)ە، واتە: (ماسح)، چونکە ئەو کەسانەی نەخۆش بوون، عیسا دەستی بەسەردا هێناون‌و مەسحی کردوون، چاك بوونەتەوە بە فەرمانی خوای پەروەردگار[1]، بەڵام هی دەججالْ (فعیل بمعنى المفعول)ە، واتە (مَمْسوح) چونکە وەك لە فەرموودەکاندا دەردەکەوێ دەججالْ: چاوی سڕاوەتەوەو (ممسوح العَیْن)ەو چاوێکی کوێرەو وەك لاچاوی وایە. و شەی (دجّال) لە

1) (جامع الأصول) لابن الأثیر، بەرگی 4 لاپەڕە 204.

(دجل)وه هاتوه، واته: درۆ، داپۆشینی حەق، خەڵك فریودان، وه (دجّال) (صیغة المبالغة)ی (داجل) ە، واته: زۆر درۆزنو فریودەرو فێڵباز[1].

## 2- سـیفەتەکانی دەجـال:

پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی سیفەتە جەستەیی یەکانی دەجاڵەوە فەرموویەتی: **(رجلٌ جَسيمٌ أحمر، جَعْدُ الرأس، أعور العَيْن كأنَّ عَيْنَهُ عِنَبَةٌ طافية)**[2]، واته: پیاوێکی زلو لاشەی گەورەیە، سوورە، قژی لوولە، چاوی ڕاستەی کوێرە، چاوی وەك بۆڵوە ترێ دەرپەڕیوەو زەق بۆتەوە.

هەروەها فەرموویەتی: **(أنَّ المسيح الدجّال رجلٌ قصيرٌ، أَفْحَجٌ، جَعْدٌ، أَعورٌ، مَطْموسُ العَيْنِ، لَيْسَتْ بِناتِئَةٍ و لاحَجْراء، فأنَّ أُلبس عليكم فأعلموا أنَّ ربّكم ليس بأعور وانّكم لن تروا ربكم)**[3]، واته: مەسیحی دەجاڵ پیاوێکی کورتە بالآیە، قاچەکانی گێڕن، (واته: قاچی لە یەك دوورنو بە گێڕیی‌و خواری دەڕوا) پرچو قژی لوول دراوه، یەك چاوه، چاوێکی سڕاوەتەوه، چاوی نەزۆر دەرپەڕیوەو نە زۆریش قووڵە، (بەڵکو هەروا کەمێك زەقە) ئەگەر سەرتان لێ دەرنەچوو بزانن کە پەروەردگارتان یەك چاو نیە، وه دڵنیاش بن کە پەروەردگاری خۆتان (لە دونیادا) نابینن.

هەڵبەتە پێغەمبەر ﷺ بۆیە داکۆکی زۆری لەسەر ئەوە کردوه، چونکە دەجاڵ لەعنەتی خوای لەسەربێ، داوای خوایەتی دەکات.

وە نیشانەی زۆر زەقی دەجاڵ، کە پێیانەوە دەناسرێ، سێ شتن:

- یەك چـاوه

---

1) (فتح الباري) بەرگی11، لاپەڕە 91.
2) رواه البخاري عن ابن عمر -رضي الله عنه- .
3) رواه الأمام احمد وابو داود، عن عبادة بن الصامت، بسندٍ صحيح.

ب- لەنێو چاوانی نوســراوە (کافر) یان (ك، ف، ر).
ج- نەزۆكە.

وەك پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: **﴿ما بُعِثَ نبــيٌّ الاّ أنْذَر أمَّتهالأعْور الكذاب، الا إِنَّه أعْورُ وإن ربكم ليس بأعور، وأنَّ بين عَيْنَيْه مكتوب كافر، (وفي رواية مسلم: مكتوبٌ بين عينيه ك، ف، ر)[1]﴾**، واتە: ﴿ هیچ پێغەمبەرێك نەنێرراوە (علیهم الصلاة والسلام) مەگەر ئوممەتی خۆی لە یەك چاوی درۆزن ئاگادار كردۆتەوە، ئاگاداربن یەك چاوە، پەروەردگاری ئێوە یەك چاو نیە، وە لەنێوان دوو چاوەكانی نووسراوە كافر، (لە ڕیوایەتی مسلم دا) نووسراوە (ك، ف، ر)﴾ وەك لە ڕیوایەتێكی دیكەی ( بخاریو مسلم)دا هاتوە! **(يقرؤه كل مؤمن كاتبٍ وغير كاتبٍ)[2]**، واتە: هەموو بڕوادارێك دەیخوێنێتەوە چ خوێندەوار بێ چ نەخوێندەوار، وە هەر لە فەرموودەدا هاتوە كە دەفەرموێ: **(هو عقيم لايولد له)[3]**، واتە: نەزۆكەو منداڵی نابێ.

دیارە خوای كاربەجێ ئەو ناتەواویی‌و كەم‌وكووڕیی‌یانەی لە دەججالدا هێناوەتەدی، تا هەموو كەس، هەر بەو ناتەواویی‌و نیشانە زەق‌و بەرچاوانەی خۆی تێی بگات كە درۆ دەكات، ئەگەر ڕاست دەكات خوایە، بۆچی چاوی كوێرەو خۆی پێ چاك ناكرێ؟ بۆچی گێڕو خوارو خێچە؟ بۆچی زۆر دزێوو ناقۆڵاو نەزۆكە؟ بۆچی لە نێوچاوانی نووسراوە كافر؟ ئایا بۆ ئەوە نیە تاكو خەڵك بزانێ ساختەچی‌و فێڵبازە!!

## 3- توانــاو دەســتەڵاتی دەججــاڵ:

1) رواه البخاري عن أنس - رضي الله عنه- و رواه مسلم، برقم 2933.
2) رواه البخاري برقم: 345 و مسلم برقم: 2934.
3) رواه مسلم عن أبي سعيد الخدري برقم 2927 .

خوای کاربەجێ لە ڕووی حیکمەتی بێسنووری خۆیەوە، توانا یەکی زۆر نائاسایی (خارق العادة) دەدات، بە دەججالٚ، کە شتی زۆر سەیری لەدەست دێت، بۆئەوەی ئیمانی خەڵکی پێ تاقی بکاتەوە، جا ئێستا با بزانین چی لە توانادا هەیە؟:

أ- زۆر بە خێرایی بەسەر زەویدا دەڕوات: **(عن النوّاس بن سَمعان أنَّ النبيّ ﷺ سُئلَ عن إِسْراع الدجّال في الأرض، فقال: كالغيث اسْتَدبَرَتْهُ الرّيحُ)**[1]، واتە: نەوواسی کوڕی سەمعان دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەربارەی خێرایی دەججالٚ کە بە زەویدا دەڕوا، پرسیاری لێ کرا، فەرمووی: وەکو بارانێك وایە کە با دەیهێنێ، ئاوا بە خێرایی دێتو دەچێ.

ب- وە دەججالٚ زۆربەی هەرە زۆری دونیا دەگەڕێ، وەك پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: **(لَيْسَ مِنْ بَلَدٍ الاّ سَيَطؤه الدجّال الاّ مكّة و المدينة)**[2]، واتە: هیچ شوێنێك نیە کە دەججالٚ نەیگرێ، جگە لە مەککەو مەدینە.

ج- وە دەججالٚ شتێکی پێیە دەڵێ: ئەوە بەهەشتە، شتێکیشی پێیە دەڵێ، ئەوە دۆزەخە، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **(معه جنّة و نار، فنارهُ جَنّة، وجنّتُه نارٌ)**[3]، واتە: باغی پێیەو ئاگری پێیە، ئاگرەکەی بەهەشتەو باغەکەیشی ئاگرە.

(حذيفة)ش خوا لێی ڕازی بێ لەوبارەوە گوتوویەتی: **(إنَّ معه نهراً من ماءٍ و نهراً من نار، فأما الذي ترون انه نارٌ، ماءٌ، وأما الذي ترون**

1) رواه مسلم برقم 2137.
2) رواه البخاري عن حذيفة ﷺ و رواه مسلك، برقم: 2055، (مختصر صحيح مسلم) 619.
3) رواه مسلم عن أنس ﷺ، برقم: 2934س

**أنه ماءٌ نارٌ، فمن أدرك ذلك منكم فأراد الماء فَلْيَشْرب من الذي يَراه أنَّه نـار، فأنه سَيَجِدُهُ مـاءً) (وقال ابن مسعود: هكذا سمعت النبّـي ﷺ)** بڕوانه (صحيح مسلم) برقم: 2935. كورتەی قسەكەی حوزەیفەش ئەوەیە كە دەججاڵ دوو جێگای پێیە وەك بەهەشتو دۆزەخ جا بە پێچەوانەی ڕواڵەتیانەوە بەهەشتەكەی دۆزەخی خواو دۆزەخەكەیشی بەهەشتی خوایە.

د- شەیطانەكانیش ئەوپەڕی توانای خۆیان بۆ دەججاڵ دەخەنەگەڕ! وەك كە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (**وانَّ مِنْ فتْنَتِهِ أنْ يقول لأعرابيّ: أرأيت أنْ بَعَثْتُ لك أباك و أمَّك أتشهد أني ربُّكَ؟! فيقول: نعم، فيتمثَّل له شيطانُ في صورة أبيه و أُمهِّ، فيقولان يا بُنيَّ اتَّبِعْهُ فأنَّه ربَّك)**[1]، واتە: لە بەلاو فیتنەی دەججاڵ ئەوەیە كە بە كابرای خێڵەكیو سادە دەڵێ: ئایا ئەگەر بابو دایكت بۆ زیندوو بكەمەوە شایەدیی دەدەی كەمن پەروەردگاری تۆم؟! ئەویش دەڵێ، بەڵێ، جا لەوكاتەدا شەیطانێك دێتە سەر شێوەی بابیو دایكیو هەردووكیان پێی دەڵێن: ئەی ڕۆڵەگیان ئیمانی پێ بهێنەو بەدوای بكەوە، چونكە ئەوە پەروەردگارتە!

هـ - وە دەججاڵ گیاندارو بێگیان بە گوێی دەكەن! وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (. . . **فيأْتي على القوم فيدعوهم فيؤمنون به و يَسْتَجيبون له، فَيَأْمُر السَّماْءَ فَتُمْطِرُ والأرْضَ فَتُنْبِتُ، فَتَرُوحُ عليهم سارِحَتُهُم أطْولَ ما كانت دَرّاً وأَسْبَغَهُ ضروعاً، وأمدَّه خواصِرَ، ثم يأتي القوم فيدعوهم فَيردُّون عليه قَولَهُ فَيَنصَرِفُ عَنْهم فَيُصْبِحون مُمْحلِين، لَيْسَ بأيديهم شيءٌ مِنْ أموالهم، ويَمُرُّ بالخَرِبَه فَيقولُ لَها أَخْرِجي كُنوزَكِ فَتَتْبعَهُ كَنوزُها**

1) رواه ابن ماجة وابن خزيمة وصححه الحاكم عن أبي أمامة -رضي الله عنه-.

**کیعاسیب النَّحل)**[1]، واتە: دەججاڵ دەچێ بۆ لای کۆمەڵێك و بانگیان دەکات ئەوانیش ئیمانی پێ دەهێنن و بەدەمیەوە دەچن، ئەویش فەرمان بە ئاسمان دەکات کە بارانیان بۆ ببارێنێ ئیدی باران دەباری، وە بە زەوی دەڵێ دەغڵ و دانەوێڵەیان بۆ برِوێنە! بۆیان دەڕوێنێ، وە مەڕو ماڵاتیان ئێواران دێتەوە چاکترین شیریان دەبێ و گوانەکانیان پڕ دەبن و کەلەکەکانیان دەئاوسێن (بە هۆی قەڵەویی یەوە).

پاشان دەچێ بۆ لای کۆمەڵێکی دی و بانگیان دەکات، ئەوانیش بەرپەرچی دەدەنەوە و بڕوای پێناهێنن، جا کاتێك بەجێیان دەهێڵێ زەوی و زاریان قاقڕ و بێبەرهەم دەبێ و هیچ شتێکیان لە ماڵ و سامان نامێنێ! وە بە لای کاولگەدا ڕەت دەبێ و پێی دەڵێ خەزنەکانت بێنەدەری! ئیدی خەزنەکانی دێنە دەری و شوێنی دەکەون وەك چۆن هەنگ بە دوای شاژنەکەیان دەکەون!!

## 4- شوێنی دەرچوون و ئەندازەی مانەوەو شوێنکەوتووانی دەججاڵ:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **(انَّ الدجّال یَخْرجُ مِنْ أَرضٍ بالَمشْرِق یُقال لَها خُراسان)**[2]، واتە: دەججاڵ لە سەر زەمینێکەوە دێت کە لەلای ڕۆژهەڵاتەوەیە، پێی دەگوترێ (خوراسان).

کاتی خۆی بە بەشێك لە ئێران و بەشێکی زۆر لە پاکستان و ئەفغانستان، گوتراوە خوراسان، واتە: لەو دەوروبەرەی ڕۆژهەڵاتەوە دەردەچێت، بەڵام کە

1) رواه مسلم عن النَّواس بن سَمعان -رضي الله عنه- برقم: 2137.
2) رواه احمد و الترمذي ابن ماجة والحاكم عن أبي بكر الصديق ـ رضي الله عنه.

دەردەچێ بۆ مسوڵمانان، لەنێوان عێراقو شام دا دەردەچێ، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (**إنَّه خارجٌ خَلَّةً بين الشام والعراق فَعاث يميناً و عاث شمالاً يا عباد الله فاثْبِتُوا**)[1]، واتە: دەججاڵ دەردەکەوێ لە شوێنێك لەنێوان شامو عێراق، بەلای ڕاستو بەلای چەپدا خراپەدەکات، جا ئەی بەندەکانی خوا خۆڕاگر بن (لە بەردەم ئاشوبی دەججاڵ دا).

وە دەربارەی مانەوەی دەججاڵ لە زەویدا هاوەڵان پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کردو گوتیان: (**وما لُبْثُهُ في الأرض؟ قال: أربعون يوماً يوم كسنة، ويوم كشهر، ويوم كجمعة، و سائر أيامه كأيامكم**)[2]، واتە: ئایا مانەوەی دەججاڵ چەندە لەسەر زەوی؟! لە وەڵامدا فەرمووی: چل ڕۆژ دەمێنێتەوە، ڕۆژێکیان وەك ساڵێکەو ڕۆژێکیان وەك مانگێکەو ڕۆژێکیان هەفتە (جمعة) یەکەو ڕۆژەکانی دیکەشی وەك ڕۆژەکانی ئێوەن.

جا لە ڕاستیدا زانایان لێرەدا زۆر سەرسام بوون، کە ئایا مانای چی یە کە ڕۆژ بە ئەندازەی ساڵ بێتو بە ئەندازەی مانگ بێتو بە ئەندازەی هەفتە بێت؟!

من بۆ خۆم ئەو تەئویلەی مامۆستا ( سەعیدی نورسی)م ڕەحمەتی خوای لێبێ، تا ڕادەیەك پێ تەئویلێکی مەعقوولو بەجێ یە، کە دەڵێ: (هەڵبەتە دەججاڵ لەلای ڕۆژهەڵاتەوە دێت، وە بە نسبەت نیوەدوورگەی عەرەبی یەوە ڕۆژهەڵات تا جەمسەری بەستەڵەکی باکوور (قطب المنجمد الشمالي) هەمووی هەر ڕۆژهەڵاتەو شوێنی واش هەیە لە سەرووی زەوی

1) رواه مسلم و ابوداود عن النواس بن سمعان -رضي الله عنه- برقم: 2137.
2) رواه مسلم و ابوداود عن النواس بن سمعان، وفي صحيح مسلم برقم: 2137.

کە تا یەك ساڵ تیشکی خۆری بەرناکەوێ، یاخود بە پێچەوانەوە بەردەوام هەر ڕۆژە، جا کە دەفەرموێ: (یوم کسنة) ڕۆژێك بە ئەندازەی ساڵێکە، ڕەنگە ئەو ڕۆژەی کە دەججاڵ دێت یەکەم ڕۆژ، لەو شوێنە دوورە بێت کە ڕۆژەکەی یەك ساڵە، وەکە دەشفەرموێ: (یوم کشهر) ڕۆژێك بە ئەندازەی مانگێکە، مەبەست ئەوەیە کە ئەگەر زیاتر بەرەو ئەملا یە بێت، کە ڕۆژەکەی وردە وردە کەم دەبێتەوەو جاری وایە بە ئەندازەی مانگێکی لێ دێت وە دوایی کە دەفەرموێ: (یوم کجمعة) ڕۆژێك بە ئەندازەی هەفتەیەکە، لەبەر ئەوەیە کە ئەگەر لەو شوێنانەوە زیاتر بەرەو ئەملا هاتیو نزیك بوویەوە ڕۆژبە ئەندازەی هەفتەیەکی لێ دێت، وە پاشان ڕۆژەکان وەك ئێستای ئێرە ئاسایی دەبنەوە)[1].

دەربارەی ئەوەش کە ئایا شوێنکەوتووانی دەججاڵ، بە زۆری کێن؟ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (أكثر أتباع الدجّال اليهودُ و النساءَ)[2] واتە: زۆربەی شوێنکەوتووانی دەججاڵ جوولەکەو ئافرەتن.

## 5- چۆنیەتی خۆ لێ قوتارکردنی دەججاڵو چۆنیەتی بەرەنگاربوونەوەی:

1) المكتوبات، للأستاذ بديع الزمان ملا سعيد النورسي.
2) رواه احمد عن عثمان بن ابي عاص.

پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە دەفەرموێ: **(لَيَفِرَنَّ الناسُ مِنَ الدجّال في الجبالِ)**[1]، واتە: خەڵك لە دەججاڵ ڕادەكەن‌و پەنا بۆ شاخ‌و كێوەكان دەبەن وە دەفەرموێ: **(فَمَنْ أَدْرَكه منكم فَلْيَقِرأْ عليه فواتح سورة الكهف)**[2]، واتە: هەر كامێك لە ئێوە گەیشت بە دەججاڵ‌و لەگەڵیدا ڕووبەڕوو بۆوە با سەرەتای سوڕەتی (الكهف)ی بەسەردا بخوێنێ (لە زیانی پارێزراو دەبێ).

وە هەندێ لە زانایان لەوانە (ابن حزم) گوتوویانە: ئەو دووعایە كە لە (تحيات)ی نوێژدا دەخوێنرێ، فەرزە كە لە هەموو نوێژێكدا هەر بخوێنرێ، كە ئەوە دەقەكەیەتی: **(اللّهم إنّي أعوُذ بِكَ مِنْ عذاب جَهنَّم و مِنْ عذاب القبر، ومن فتنة المَحْيا والممات ومن شَرِّ فِتْنَة المسح الدجّال)**[3]، واتە: ئەی خوایە پەنات پێدەگرم لە سزای دۆزەخ وە لە سزاو ئازاری گۆڕ، وە لە فیتنەو ئاشووبی ژیان‌و مردن، وە لە هەراو ئاشوبی مەسیحی دەججاڵ!



## 6- هەڵوێستی ئەهلی سوننەت دەربارەی دەججاڵ:

---

1) رواه مسلم عن ام شريك ـ رضي الله عنها ـ
2) رواه مسلم عن النواس بن سمعان، برقم 2137.
3) رواه البخاري و مسلم.

(ئیمام نەوەوی) ڕەحمەتی خوای لێ بێ لەوبارەوە گوتوویەتی: ( **قال القاضي: هذه الأحاديث التي ذكرها مسلمٌ و غيره في قصة الدجّال حجَّةٌ لِمَذْهَب أهل الحقّ في صِحَّة وجُودِهِ وأنَّه شَخْصٌ إبتلى الله بِهِ عبادَهُ، وأَقْدرَهُ على أَشياء مِنْ مقدورات الله تعالى من إحياء الـميّت الذي يَقْتُلُه، ومِنْ ظهورِ زَهْرَة الدنيا والخِصَبِ مَعَه وجنَّتِهِ ونارِهِ ونَهْرَيه وإتباع كنوز الأرض لَهُ وأمْرِهِ السماء أَنْ تُمْطِر فَتُمْطِرُ، والأرض أنْ تُنْبِتَ فَتُنْبِتُ، هذا مذهب أهل السنة وجميع المحدثين والفقهاء والنُظّار، خلافاً لِمَنْ أنكره وأَبطَل أَمْرَه مِنْ الخوارج والجَهْمِيّة وبَعْض المُعْتزِلة)**[1]، واتە: (قاضي عياض) گوتوویەتی: ئەم فەرموودانەی (مسلم)و غەیری ویش لەبارەی بەسەرهاتی دەججالەوە باسیان کردوون بەڵگەن بۆ ڕێبازی ئەهلی هەق کە دەججاڵ هەیەو کە سێکە خوا بەندەکانی خۆی پێ تاقی دەکاتەوە، وە تواناداری دەکات بەسەر هەندێك لەو شتانەدا کە تەنیا لەژێر ڕکێفی دەسەڵاتی خوادان. وەك زیندووکردنەوەی ئەو مردووەی کە دەیکوژێ، وە دەرکەوتنی جوانیو پیتو پیزی دونیا لەگەڵیدا، وە دوو ڕووبارەکەیو شوێنکەوتنی خەزێنەکانی زەوی بۆی، وە فەرمانکردنی بە ئاسمان کە ببارێنێو دەبارێنێ، وەبە زەوی کە برووێنێو دەڕووێنێ! ئائەمە ڕێبازی ئەهلی سوننەتو سەرجەم فەرموودەناسانو شەرعزانانو عەقیدەزانانە، بە پێچەوانەی ئەوانەوە کە نکوولی یان لەوە کردووەو بە ناڕاستیان زانیوە وەك خەواریجو جەهمییەکانو هەندێك لە موعتەزیلەکان.

## دووەم: هاتنە خوارەوەی عیسا -عليه السلام-:

1) شرح صحيح مسلم .

بەڵێ دووەمین نیشانە هاتنەخوارەوەی (عیسا)یە صەلاّتو سەلامی خوای لەسەربێ، چونکە (عیسا) بە دەقی قورئان کاتی خۆی خوای زاڵو کاربەجێ -عزّوجلّ- لە پیلانو فێڵی جوولەکەو ڕۆمەکان دەربازی کردو بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان، وە بە دەستی ناحەزانی نەکوژرا، بە پێ چەوانەی لێحاڵی بوونی نەصرانییەکانەوە کە پێیان وایە: (عیسا) بە دەسیسەی جوولەکەکانو بە دەستی ڕۆمەکان لە قەنارە دراوەو ئێستا نەصرانییەکان خاچ (صلیب) هەڵدەواسنو بە ملی خۆیانی دادەکەن، بە خەیاڵی خۆیان دەڵێن: (عیسا) ئاوا بە داردا کراوەو هەڵواسراوە!

بەڵام خوای بەرزو مەزن ئەو درۆو ئەفسانەیەی ئەوانی پووچەڵ کردەوە وەك گەلێك درۆو ئەفسانەی دیکە شیان، وەك لەوبارەوە فەرموویەتی: **﴿وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَى مَرْيَمَ بُهْتَانًا عَظِيمًا ۞ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَـكِن شُبِّهَ لَهُمْ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلاَّ اتِّبَاعَ الظَّنِّ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا ۞ بَل رَّفَعَهُ اللهُ إِلَيْهِ وَكَانَ اللهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ۞ وَإِن مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلاَّ لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا﴾**[1]، واتە: وە بە هۆی کوفرکردنو قسەکردنیانەوە (واتە: جوولەکەکان) دەربارەی مریەم، کە بوختانێکی زۆر گەورەیان بۆی کردوە (کە دەڵێن: مەریەم زینای کردوە، ئنجا عیسای لێ بووە)، وە بەو قسەیان کە دەڵێن: ئێمە مەسیحی عیسای کوڕی مەریەم ڕەوانەکراوی خوامان کوشتوە، بەڵام نە کوشتوویانەو نە هەڵیانواسیوە، بەڵکو شێوەی وی (عیسا)یان بۆ براوەتە سەر یەکێکی دیکە

1) النساء (156 ــ 159).

(کە یەهوودای ئەسخەریوطی یە) ، وە ئەوانەی لەبارەی (عیسا)ەوە کەوتوونە راجیاییەوە تێیدا لە دوودڵیی دان، بێجگە لەو گومان هیچ زانیارییەکیان نیە، وە بە مسۆگەریی ئەوان نەیانکوشتوە، بەڵکو خوا بۆ لای خۆی بەرزی کردەوە،و خوا زاڵی کاربەجێیە، وە هیچ کام لە خاوەن کتێبەکان نیە مەگەر پێش مردنی ئیمانی پێ دێنێ. وە رۆژی قیامەتیش لەسەریان دەبێتە شایەد (چاودێر).

وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی هاتنە خوارەوەی عیسا (علیه السلام) فەرموویەتی: **(والّذي نفسي بيده لَيوشِكنَّ أَنْ يَنْزِلَ فيكم إبنُ مريم حكماً عَدْلاً فَيَكْسِرُ الصَّليب وَ يقْتَل الخِنْزير و يَضَعُ الحَرْبَ ويَفيضَ المالُ حتىّ لايَقْبَلَه أحدٌ، حتى تكون السجدة الواحدة خيرٌ من الدنيا و ما فيها)**[1]، واتە: سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە نزیکە کە عیسای کوڕی مەریەم بێتە خوارێ بۆ نێوتان، فەرمانڕەوایەکی دادگەر دەبێت، خاچ (صلیب) دە شکێنێت ( چونکە ئەفسانەیە) وە بەراز دە کوژێ ( کە نەصرانییەکان خواردنی گۆشتەکەی بە ڕەوا دەزانن) وە جەنگ کۆتایی پێدەهێنێ (چونکە کەس نامێنێ کە بەرهەڵستی بکات) وە ماڵو سامان ئەوەندە زۆر دەبێ کە هیچ کەس نایەوێ، وە هەتا وای لێدێ، سەجدە بردنێك بۆ خوا (لە سەردەمی عیسادا) بۆ خەڵك چاکتر دەبێ لە دونیاو لەوەی لە دونیا دایە.

وە بێگومان (عیسا) سەلامی خوای لەسەربێ، حوکم بە ئیسلام دەکا، وە بێجگە لە ئیسلام دینو بەرنامەیەکی دی ناهێڵێت، وەك پێغەمبەر ﷺ

1) متفق عليه عن أبي هريرة ﷺ البخاري برقم: 2222، ومسلم برقم: 155، واللفظ له.

دەفەرموێ: **(فيُقاتِلُ على الأسلام فَيُدقّ الصَّليبَ ويقتل الخِنْزير ويَضَعُ الجِزْية ويُهلِكُ الله في زمانه المِلَلَ كلّها الاّ الأسلام)**[1]، واتە: (عیسا) لەسەر ئیسلام جەنگ دەکات، خاچ دەشکێنێ‌و بەراز دەکوژێ‌و سەرانە (الجزية) ناهێڵێ، وە خوا لە ڕۆژگاری ئەودا هەموو بەرنامەکان لەنێو دەبات جگە لە ئیسلام.

وە (عیسا) سەلامی خوای لەسەر بێ، چل ساڵ دەمێنێتەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **(فَيَمكُثُ في الأرض أربعين سنة، ثم يُتوفى و يُصَلّي عليه المسلمون)**[2]، واتە: چل ساڵ لە زەویدا دەمێنێتەوەو پاشان وەفات دەکات‌و مسوڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن.

وە لە سەردەمی خۆیدا حەج‌و عومرە دەکات، وەك لەم فەرموودەیەدا باسکراوە: **(والذي نفسي بيده لَيُهِلَّنَّ ابنُ مريم بِفَجّ الرَّوحاء حاجّاً أو مُعْتمِراً أو لَيُثَنّينَّهما)**[3]، واتە: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، عیسای کوڕی مەریەم لە (فج الروحاء) (کە شوێنێکە) ئیحرام بە حەج یان بە عومرە دەبەستێ، یاخود ئیحرام بە حەج‌و بە عومرە بە هەردووکیان دەبەستێ.

## سێیەم: هاتنەدەری یەئجووج‌و مەئجووج:

1) رواه ابوداود عن ابي هريرة رضي الله عنه.
2- رواه ابوداود عن ابي هريرة رضي الله عنه.
3) رواه احمد و ابوداود عن ابي هريرة رضي الله عنه.

وەك پێشتر باسمان كرد سێیەمین نیشانەی هاتنی قیامەت دەر چوونی یەئجووجو مەئجووجە، وەك خوای زانا لەوبارەوە فەرموویەتی: **﴿حَتَّى إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ ۞ وَاقْتَرَبَ الْوَعْدُ الْحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَاخِصَةٌ أَبْصَارُ الَّذِينَ كَفَرُوا يَا وَيْلَنَا قَدْ كُنَّا فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَذَا بَلْ كُنَّا ظَالِمِينَ﴾**[1]، واتە: كاتێك دەر گاو دەروو لە بەردەم (یەئجووجو مەئجووج)دا كرایەوە (ئەو پەرچو بەربەستەی لە پێشیانە نامێنێو دێنو بە ولاتاندا بلاودەبنەوە) وە لە هەموو بەرزاییەیان زۆر بە خێرایی دەڕۆن. وە بەڵێنی حەق (كە قیامەتە) نزیك دەبێتەوەو ئەوانەی بێبڕوان چاویان ئەبڵەق دەبێ (دەڵێن:) هاوار بۆ ئێمە، بەڕاستی ئێمە لەمە لە بێئاگایی دابووین، بەڵكو ئێمە ستەمان لە خۆمان كرد!

كەواتە: لە دوای یەئجووجو مەئجووج زۆری پێ ناچێ كە دونیا كۆتایی پێ دێ، دیارە (یەئجووجو مەئجووج)یش دوو كۆمەڵنو یەكجار زۆرن، بەلام ئایا ئێستاكە هەن؟ یان دوایی پەیدا دەبن؟! وە ئا یا خەڵكی ولا تەكانی چینو یابانو.....هتدن؟! بێگومان بە مسۆگەری نازانین، بەلام گرنگ ئەوەیە كە لە ڕۆژگاری هاتنەخوارەوەی حوكمڕانیی (عیسا)دا سەرهەڵدەدەن.

وە پێغەمبەرمان ﷺ لەوبارەوە كە یەئجووجو مەئجووج لە ڕۆژ گاری (عیسا)دا (علیه الصلاة والسلام) سەرهەڵدەدەن، فەرموویەتی: **(ثم يأتي عيسى ابْنَ مريم قَوْمٌ قَدْ عَصَمَهم الله منه، فَيَمْسَحُ عن وجوههم و يُحدِّثهم بدرجاتهم في الجنة فبينما هو كذلك، إذْ أوحى الله الى عيسى أني قد أَخْرَجْتُ عباداً لي لايَدانِ لأحدٍ بِقتالهم فَحَرِّزْ عبادي الى الطُّور، ويَبْعثُ الله**

1) (الأنبياء 96- 97).

يأجوج ومأجوج ﴿وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ﴾(الأنبياء- 96))، فَيَمُرُّ أوائلهم على بحيرة طبرية فيشربون مافيها، ويَمُرُّ آخرهم فيقولون لقدكان بهذه مَرَةً ماءٌ، و يُحْصَرُ نبيّ الله عيسى ابن مريم -عليه الصلاة والسلام- وأصحابُهُ حتى يكون رأس الثَّور لأحدهم خيراً من مائة دينار لأحدكم اليوم فيرغب نبيّ الله عيسى ابن مريم و أصحابه فَيُرسِلُ الله عَلَيهم النَّغَفَ في رقابهم فَيُصْبِحون فَرسى كَموت نفس واحدة ثم يهْبِط نبيّ عيسى و أصحابه الى الأرض فلا يَجِدون في الأرض موضِعَ شِبْرٍ الاّ ملأهُ زَهَمُهُم ونَتَنُهُم فيرغب نبيّ الله عيسى و أصحابه الى الله -عزّوجلّ- ثم يُرسِلُ الله طَيْراً كأعناق البُخت فَتَحْمِلَهم فَتَطْرَحُهُم حيث شاء الله -عزّوجلّ- ثم يُرْسِلُ الله مَطراً لا يَكُنُّ منه بَيْتُ مدَرٍ ولا وبَرٍ فَيَغْسِلُ الأرض حتى يَتْرُكها كالزَّلَفَة......) (مختصر صحيح مسلم (رقم: 2048) عن النّواس بن سمعان .

واتە: دوایی کۆمەڵێك دێن بۆ لای عیسای کوڕی مەریەم (عليه الصلاة والسلام) کە خوا ئەو کۆمەڵەی لە شەڕو خراپەی دەججاڵ پاراستوون، جا (عیسا -عليه السلام- دڵخۆشییان دەداتەوە، وە باسی پلەوپایەکانیان بۆ دەکات لە بەهەشتداو دڵخۆشیان دەکات) ئیدی ئەوان لەو قسانەدا دەبن کە خوا -عزّوجلّ- وەحی بۆ عیسا دەنێرێ: کە من هەندێ لە بەندە (و دروستکراوە) کانی خۆمم دەرهێناوەو بە دونیام وەرکردوون کە (زۆر زۆرن‌و) کەس پێیان ناوێرێ، جا تۆ بەندە (مسوڵمانە)کانم بەرەو (طور) (یان بەرەو چیاو چۆڵ) بەرەو پەنایان بدە! ئنجا خوا یەئجووج‌و مەئجووج دەنێرێ (وبە دونیادا بڵاویان دەکاتەوە)، ﴿وە ئەوان لە هەموو گردو تەپۆڵکەیەك بە

خێرایی دێنە خوارێ﴾ (الأنبياء- 96)، جا ئەوەڵەکانیان بە لای دەریاچەی طەبەرییەدا ڕەت دەبن و هەر چی ئاوی تێیدا یە دەیخۆنەوە، وە کاتێك دوایەکانیان پێیدا ڕەت دەبن دەڵێن: کاتی خۆی ئێرە ئاوی لێ بووە! وە پێغەمبەری خوا عیسای کوڕی مەریەم و هاوەڵەکانی ئابلووقە دەدرێن، هەتا وایان لێ دێ کە سەلکە گایەك بۆ یەکێکیان چاکتر دەبێ بۆ یەکێك لە ئێوە لەمڕۆدا لە سەد دینار، (واتە سەد دیناری زێڕ)، پاشان پێغەمبەری خوا عیسای کوڕی مەریەم و هاوەڵەکانی دەپاڕێنەوە و خوا کرمێك لە ملیاندا پەیدا دەکات ئیدی تێکڕایان دەمرن و تەخت دەبن وەك مردنی یەك کەس (واتە پێکەوە و لە یەك کاتدا دەمرن).

پاشان پێغەمبەری خوا عیسای کوڕی مەریەم و هاوەڵەکانی لە چیا دێنە خوار بەڵام بە ئەندازەی بستە خاکێك نامێنێ کە زوو خاو بۆ گەنی جەستەکانیان پڕی نەکردبێ، ئنجا پێغەمبەری خوا عیساو هاوەڵەکانی لە خوای زاڵ و پایەبەرز دەپاڕێنەوە و خواش جۆرە باڵندەیەك دەنێرێ کە هێندەی گەردنی حوشتر (یان حوشتری مل درێژ) دەبن، وە لە شوێنێك کە خوای زاڵ و پایە بەرز دەیەوێ فڕێیان دەدەن، پاشان خوا بارانێك دەنێرێ کە (هێندە زۆرو بە خورزەم دەبێ) هیچ خانوو دەوارێك خەڵکی بۆ پەنا نادرێ لێی، وە سەر زەوی پاك دەکاتەوە و دەیشواتەوە وەك ئاوێنەی لێ دەکات! دوای ئەوە (عیسا) -عليه السلام- وەفات دەکات پاش چل ساڵ حوکمڕانیی، وە مسوڵمانانیش وردە وردە لە کەمی دەدەن و ئیسلام کە پێشتر لەوپەڕی دەستەڵاتدا دەبێ، وردە وردە بەرەو کزیی دەڕوات، وەك لەم فەرموودەیەدا دەردەکەوێ: **(يُدْرَسُ الأسلامُ كما يُدْرَسُ وشْيُ الثوب حتى لايُدرى ما صيامٌ ولا صلاةٌ ولا نُسْكٌ ولا صَدَقَةٌ، وليُسْرى على كتاب الله في**

**ليلةٍ فلا يَبْقى في الأرض مِنْه آية)**[1] واتە: ئیسلام نامێنێ و ڕەنگی دەچێت و دەڕوا، وەك چۆن کە ڕەنگی قوماش دەچێتەوە، وە وای لێ دێت کە خەڵك نازانێ ڕۆژوو چییە، نوێژ چییە، قوربانی و زەکات و صەدەقە چییە، وە شەوێك لە شەوان قورئان هەڵدەگیرێتەوە و یەك ئایەتیشی لەسەر زەوی نامێنێتەوە.

شایانی باسیشە کە دونیا تێکدەچی و قیامەت دێت، بەسەر خراپترین خەڵکدا خراپ دەبێ و تێکدەچێ، وەك پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: **(لا تقوم الساعة الاّ على شِرارِ الخَلْقِ)**[2]، واتە: قیامەت نایەت، مەگەر بەسەر خراپترینی خەڵکدا، فەرموویەتی: **(لا تقوم الساعة حتى لا يُقال في الأرض الله، الله)**[3]، واتە: قیامەت نایەت و دونیا کاول نابێ، هەتا وای لێدێ لەسەر زەوی کەسێك نامێنێ کە بڵێ خوایە، خوایە! واتە: لەسەر ئەم زەوییە کەسێك نامێنێ کە خوا بناسێ!

هەر لەوکاتەش دایە کە (کعبة)ش دەڕووخێ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: **(يُخَرِّبُ الكَعْبَةَ ذو السُّوَيْقَتَيْنِ مِنَ الْحَبَشَةِ)**[4]، واتە: کابرایەكماڵی خوا (کعبة) دەڕووخێنێ، کە حەبەشەیی یە و دوو لاقی باریکە لەی گێڕی هەن، وەك فەرموویەتی: **(كأنّي أنظر اليه أسْود أفْحَجَ يَنْقُضُها حَجَراً**

---

1) رواه ابن ماجة والحاكم عن حذيفة وصححه الحاكم ووافقه الذهبي وصححه الألباني (السلسلة الصحيحة) برقم (87).
2) رواه مسلم.
3) رواه مسلم.
4) رواه مسلم.

**حَجَراً يعني الكعبة**[1]، واتە: وەك ئەوە وایە كە ئێستا من تەماشای بكەم، كابرایەكی گێڕی ڕەشكەڵەیە، بەرد لەدوای بەرد كەعبە دەڕووخێنێ.

ئەوە دەربارەی سێ نیشانەی یەكەم:

(هاتنی دەججاڵ)و (هاتنە خوارەوەی عیسا) -علیه السلام-و (دەرچوونو بە زەویداو بڵاوبوونەوەی یەئجووجو مەئجووج). كە وەك بە ڕوونی لە فەرموودەكانی پێغەمبەردا ﷺ دیارە بەو ڕیزبەندیی (ترتیب) یەی كردوومانە لە سەرەتاوە بە دوای یەكدا دێن.

بەڵام بۆ نیشانەكانی دیكە ڕیزبەندیی یەكەیان ڕوون نیە، ئەوەندە هەیە دەرچوونی ئەو ئاگرەی كە خەڵكی بەرەو شام ڕاپێچ دەكات دوامین نیشانەیە وەك لە دەقی فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: **(و آخر ذلك نارٌ تخرج من اليمن تطرد الناس الى محشرهم)** وەك پێشتر دەقی فەرمایشتەكەمان هێنا.

كەواتە: ئەو نیشانە گەورەو دوورانەی كە -بە بڕوای من- ڕیزبەندیی یەكەیان ڕوونو دیار نیە ئەم شەشەن:

1- دووكەڵ.

2- زیندەوەری زەوی.

3- هەڵهاتنی خۆر لە ڕۆژئاواوە.

4، 5، 6- سێ ڕۆچوونەكانی زەوی لە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواو دوورگەی عەرەبیدا.

شایانی باسیشە كە هاتنی دووكەڵ (دخان) ئاماژەیەكی پێ كراوە لە قورئانێدا وەك خوا فەرموویەتی: ﴿**فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاء بِدُخَانٍ مُّبِينٍ**﴾

1) رواه البخاري.

**يَغْشَى النَّاسَ هَذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾**(الدخان: 10-11)، واتە: چاوەڕێ بە کە ئەو ڕۆژەی کە ئاسمان دووکەڵێکی ئاشکرا دێنێ * خەڵکی دادەپۆشێ (دەڵێن:) ئەمە ئازارێکی بە ئێشە!.

هەروەها زیندەوەری زەوی (دابة الأرض)یش لە قورئانێ ئاماژە یەکی پێکراوە، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: **﴿وَإِذَا وَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَابَّةً مِّنَ الأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ النَّاسَ كَانُوا بِآيَاتِنَا لاَ يُوقِنُونَ﴾**(النمل-82) ، واتە: کاتێك بڕیار (ی خوا) لەسەریان هاتەدی (کە دونیا تێك بچێ) زیندەوەرێکیان لە زەوی بۆ دەردێنین کە قسەیان لە گەڵ دەکات (و دەڵێ:) خەڵك بڕوا بە ئایەتەکانمان ناهێنن! بەڵام نە لە قورئانو نە لە سوننەتدا چۆنیەتی ئەو زیندەوەرە ڕوون نەکراوەتەوەو هەر چی لەوبارەوە بگوترێ زادەی بیرو خەیاڵی خەڵکییە!

بە گشتی خوای کاربەجێ عزّوجلّ- ئەوەی ڕاگەیاندوە کە هەرکاتێك هەندێك لە نیشانەکان (واتە نیشانە گەورەو دوورەکان) هاتن ئیمان هێنانو گەڕانەوەی خەڵکی قبووڵ ناکرێ، وەك فەرموویەتی: **﴿....يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ لاَ يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا قُلِ انتَظِرُواْ إِنَّا مُنتَظِرُونَ﴾**(الأنعام-158)، واتە: ئەو ڕۆژەی کە هەندێك لە نیشانەکانی پەروەردگارت دێن، ئیمان هێنانی هیچ کەس کە پێشتر ئیمانی نەهێنابێو کردەوەی چاکی بە هۆی ئیمانەکەیەوە بەر هەم نەهێنابێ سوودی پێ ناگەیەنێ، بڵێ: چاوەڕێ بکەن ئێمەش چاوەڕێین.

بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونی كردۆتەوە كە مەبەست لەو جۆرە نیشانانە كە پاش هاتنیان ئیمان هێنان دادی خاوەنە كەی نادات ئەم سێیانەن:

- هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە.
- هاتنی دەججاڵ.
- هاتنەدەری زیندەوەری زەوی.

وەك فەرموویەتی: **﴿ثلاث إذا خرجن (لاينفع نفساً إيمانها لم تكن آمنت من قبل أو كسبت في إيمانها خيراً): طلوع الشمس من مغربها، والدجّال، ودابة الأرض﴾** رواه البخاري برقم: 4359. و مسلم برقم 2046، عن أبي هريرة -رضي الله عنه-.

لێرەشدا كۆتایی بە نیشانەكانی ڕۆژی دوایی دێنین.

# خاڵی حەوتەم:

## کارەسات و ڕووداوو ئەنجامەکانی ڕۆژی دوایی

خوێنەری سەنگین!

خوا یاربێ لەم خاڵی حەوتەم و کۆتاییەدا و لە سیزدە (13) بڕگەدا بە ڕیز سەرجەم کارەسات و ڕووداوو ئەنجامە گەورەو گرنگەکانی ڕۆژی دوایی دەخەینەڕوو، هەرچەندە لە خاڵەکانی ڕابردووش دا کەم و زۆر تیشکیان خراوەتە سەرو قسەو باسیان لەبارەوە کراوە، ئەمەش ناونیشانی ئەو سیزدە بڕگەیەیە:

1- سەرجەم کارەساتەکانی ڕۆژی دوایی لە دوو قۆناغاندا دێنەدی.
2- کارەساتەکانی ڕۆژی دوایی تەنیا لە سنووری ئاسمانەکان و زەوی دان.
3- لە ئەنجامی فووی دووەمدا سەرجەم مردووەکان زیندوو دەبنەوەو کۆدەکرێنەوە.
4- چۆنیەتی و شوێنی کۆکردنەوەی دروستکراوەکان.
5- حاڵ وباڵی خراپەکاران و چاکەکاران لەو ڕۆژەدا.
6- تکاکردنی مەزن (الشفاعة العُظمى).
7- لێپرسینەوەو دادگاییکردنی بەندەکان.
8- کێشران و هەڵسەنگێنران.

9- بەشرانەوەی نامەو لیستی کردەوان.

10- بەرەو دۆزەخ بەڕێکرانی کافرو خراپەکاران.

11- تێر ئاوبوونی ئیماندارانی چاکەکار لە حەوزی کەوثەری پێغەمبەر ﷺ.

12- بەڕێکەوتنی ئەهلی ئیسلام بەرەو بەهەشتو پەڕینەوەی ئیماندارانی چاکەکار لە (صراط) و کەوتنە نێو دۆزەخی مونافیقانو کافرانو گوناهباران.

13- نیشتەجێ بوونی ئیمانداران لە بەهەشتداو کافرو خراپەکارانیش لە دۆزەخدا.

ئێستاش با بە ڕیز باسیان بکەین:

## دەستپێك:

بەڵێ بەڕێزان!

هاتنی ڕۆژی دوایی گەورەترین گۆڕانکاریی‌و مەزنترین کارەساتە:

کاتێك سەرنجی ئایەتەکانی قورئان دەدەین دەبینین کە خوای بەرزو مەزن زۆر بە گەورەیی باسی هاتنی ڕۆژی دوایی دەکات، بۆ وێنە فەرموویەتی: ﴿**يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ ۞ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُم بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللهِ شَدِيدٌ**﴾[1]، واتە: ئەی خەڵکینە! لە پەروەردگارتان بپارێز بکەن، بێگومان لەرزینەوەی قیامەت شتێکی گەورەیە، ڕۆژێکە دەیبینن هەموو شیردەرێك ئاگای لە شیرە خۆرەکەی خۆی دەبڕێ، وە هەموو ئاوس‌و خاوەن (حمل) ێك بێچووەکەی خۆی لەبەر دەچێت، وە خەڵك دەبینی وا دەزانی سەرخۆشن، بەڵام سەرخۆش نین، بەڵکو سزاو ئازاری خوا زۆر توندە.

هەر دەربارەی گەورەیی‌و بێزرەزایی ئەو ڕۆژە فەرموویەتی: ﴿**فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ نَفْخَةٌ وَاحِدَةٌ ۞ وَحُمِلَتِ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَاحِدَةً ۞**

1) (الحج 1-2).

**﴿فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ ۞ وَانشَقَّتِ السَّمَاء فَهِيَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ ۞ وَالْمَلَكُ عَلَى أَرْجَائِهَا وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ ۞ يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لا تَخْفَى مِنكُمْ خَافِيَةٌ﴾**(1)، واتە: کاتێك کە فوو (لە جاری یەکەمدا) بە کەڕەنا (صور)دا کرا یەك فوو، وە زەوی و شاخەکان هەڵگیران و یەکجار بە یەکدا دران، (واتە: بەرز کرانەوە و بە یەك کێشران) لەو ڕۆژەدا ئەوەی کە شایستە بێ پێی بگوترێ کارەسات ڕوو دەدات، ئاسمان لەت لەت دەبێ و دالآن دالآن دە بێ، وە فریشتەکان لەملاو لای ئاسمانەندا خۆیان دەگرنەوە، وە لەو ڕۆژەدا هەشت (فریشتە) عەرشی پەروەردگارت لە سەرووی خۆیانەوە هەڵ دەگرن، جا لەو ڕۆژەدا ئێوە دەهێنرێنە پێش و ڕادەنوێنرێن و هیچ شتێکتان (لە خوا) پەنهان نیە، (یان هیچ شتێکتان لێ شێرراوە نیەو هەموو شتێکتان لێ ڕوونە).

وە هەر لەو بارەوە دەفەرموێ: **﴿إِذَا وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ ۞ لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ ۞ خَافِضَةٌ رَّافِعَةٌ ۞ إِذَا رُجَّتِ الْأَرْضُ رَجًّا ۞ وَبُسَّتِ الْجِبَالُ بَسًّا ۞ فَكَانَتْ هَبَاء مُّنبَثًّا﴾**(2)، واتە: کاتێك ئەو ڕووداوە قەوما، کە هەر ئەو پڕ بە پێستی خۆیەتی پێی بگوترێ ڕووداو، هیچ کەسێك ناتوانێ بەرپەرچی بداتەوە، نزم دەکات و بەرز دەکات (خەڵکی بەرز دەکات و نزم دەکات، یان بەرزاییەکان نزم دەکات و دۆڵ و شیوو نزماییەکان بەرز دەکات و هەموویان وەك یەك تەخت دەکات) کاتێك زەوی ڕاتەکێنرا بە ڕاتەکاندن، چیاکانیش وردو خاش کران و بوون بە تۆزو گەرد، کەواتە: ڕۆژی دوایی

1) ( الحاقة 13-17 ).
2) ( الواقعة 1-6 ).

کارەساتێکی ئەوەندە گەورەیە، کە بوون شتی وای بەخۆوە نەبینیوەو بە خۆشیەوە نابینێتەوە!

**1/ سەرجەم کارە ساتەکانی ڕۆژی دوا یی لە دوو قۆناغا ندا دێنەدی، لە ئا کامی فووکردنی یە کەم و دووەم بە کەڕەنا (صور)دا:**

وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: (**وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الأَرْضِ إِلاَّ مَن شَاء اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُم قِيَامٌ يَنظُرُونَ ۞ وَأَشْرَقَتِ الْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ الْكِتَابُ وَجِيءَ بِالنَّبِيِّينَ وَالشُّهَدَاءِ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِالْحَقِّ وَهُمْ لا يُظْلَمُونَ ۞ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَا يَفْعَلُونَ**)[1] لەم سێ ئایەتەدا خوای زاناو توانا باسی هەردوو قۆناغەکانی قیامەت دەکاتو دەفەرموێ: وە فوو بە کەڕەنادا کرا، جا هەرچی لە ئاسمانەکانو زەوی دایە مەگەر ئەوەی خوا حەزبکا ئەگەرنا هەمووی مرد (ئەوە جاری یەکەم) پاشان فووێکی دیکەی پێدا کرایەوە یەکسەر هەموویان هەڵسانەوەو چاوەڕێ بوون (بۆ فەرمانی خوا) وە سەر زەوی بە ڕووناکی پەروەردگاری ڕۆشن بۆوە، وەنامەولیست (ی کردەوەی هەرکەسێك) دانرا، وە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و شایەدەکان هێنران (هەر پێغەمبەرێكو ئوممەتی خۆی) وە بە حەقو دادگەریی حوکمیان لە نێواندا کرا بێ ئەوەی کە ستەمیان لێ بکرێ، وە هەرکە سێك بەپێی ئەوە کە کردوویەتی پاداشتو سزای درایەوە، وە خواش خۆی زاناترە بەوەی کە ئەنجامیان دابوو.

هەروەها هەر دەربارەی هەردوو قۆناغە کە دە فەرموێ: ﴿**إِذَا السَّمَاء انفَطَرَتْ ۞ وَإِذَا الْكَوَاكِبُ انتَثَرَتْ ۞ وَإِذَا الْبِحَارُ فُجِّرَتْ ۞ وَإِذَا الْقُبُورُ**

1) ( الزمر 68-70 ).

**بُعْثِرَتْ ۞ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ﴾**[1]، واتە: كاتێك ئاسمان لەت بوو، وە كاتێك ئەستێرەكان پرژانو بڵاو بوونو هەڵوەرین، وە كاتێك دەریاكان تەقینەوە، وە كاتێك گۆڕ (قبر)ەكان هەڵدرانەوە، ئەو كاتە هەموو ئینسانێك دەزانێ چی پێش خستوەو چی پاش خستوە.

هەر لەبارەی ئەو بابەتەوە خوا ـ عزّوجلّ ـ فەرموو یەتی: (**إِذا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ ۞ وَإِذا النُّجُومُ انكَدَرَتْ ۞ وَإِذا الْجِبَالُ سُيِّرَتْ ۞ وَإِذا الْعِشَارُ عُطِّلَتْ ۞ وَإِذَا الْوُحُوشُ حُشِرَتْ ۞ وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ ۞ وَإِذَا النُّفُوسُ زُوِّجَتْ ۞ وَإِذا الْمَوْؤُدَةُ سُئِلَتْ ۞ بِأَيِّ ذَنبٍ قُتِلَتْ ۞ وَإِذا الصُّحُفُ نُشِرَتْ ۞ وَإِذَا السَّمَاء كُشِطَتْ ۞ وَإِذا الْجَحِيمُ سُعِّرَتْ ۞ وَإِذا الْجَنَّةُ أُزْلِفَتْ ۞ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا أَحْضَرَتْ﴾**[2]، واتە: كاتێك خۆر پێچرایەوە، وە كاتێك ئەستێرەكان تاریك داهاتنو ڕووناكییان نەما، وە كاتێك چیاكان لە شوێنی خۆیان هەڵقەنران، وە كاتێك حوشتری ئاوسی دەمانگە وێڵ كرا (كە ماڵێكی زۆر بە نرخ بووە لای عەرەبەكان) وە كاتێك هەموو ژیا نەوەران[3] كۆكرانەوە، وە كاتێك دەریاكان گڕیان گرت، وە كاتێك كە گیانەكان لەگەڵ جەستەكاندا جووت كرانەوە، وە كاتێك كچی زیندە بەچاڵ كراو پر سیاری لێكرا بەچ گوناهێك كوژراوە، (تا ئێرە قۆناغی یەكەم، ئەمجار قۆناغی دووەم) وە كاتێك نامەی كردەوەكان بڵاوكرانەوە، وە كاتێك ئاسمان كەوڵ كرا، وە كاتێك دۆزەخ بڵێسەداركرا، وە كاتێك بەهەشت نزیك خرایەوە، ئەو كاتە هەموو كەسێك دەزانێ چی ئامادەكردوە.

---

1) ( الإنفطار 1-5 ).
2) ( التكوير 1-14 ).
3) چونكە گیان (روح) تایبەتە بە مرۆڤەوەو زیندەوەرانی دیكە ژیان (حیاة)یان هەیە نەك گیان! ئەمەش ـ بەڕای من ـ یەكێكە لەو ڕاستی یانەی كە لە ئەنجامی وردبوونەوەم لە قورئاندا بۆم دەركەوتوە.

## 2/ کارەساتەکانی ڕۆژی دوایی، تەنیا لە سنوور ئاسمانەکان و زەوی دان:

بەڕێــزان!

ئەم ڕاستییە گەلێك ئیشكالات حەل دەكات و زۆر گرێكوێران دەكاتەوە.

خوای زاڵ و کاربەجێ فەرموویەتی: **﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ وَبَرَزُواْ للهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ﴾**[1]، واتە: ئەو ڕۆژەی كە زەوی غەیری ئەم زەوییە دەبێ، وە ئاسمانەکانیش، وە هەموویان بۆ خوای تاکی دەسەڵاتدار هاتنە گۆڕێ.

ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ، كە ئەو گۆڕانکاریی و کارەساتە مەزنەی بەسەر ئاسمانەکان و زەویدا دێت، هیچ پەیوەندی بە دروستکراوەکانی دیکەی خواوە نیە کە لە دەرەوەی جوغزی ئاسمانەکان و زەوی دان، وەك بەهەشت و دۆزەخ و عەرش و درەختی کۆتایی (سدرة المُنْتَهی) و...هتد. كەوا تە ئەو پرسیارەی كە لەسەر ئەم ڕستەیە دروست دەبێ، كە دەفەرموێ: **﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الأَرْضِ إِلاَّ مَن شَاء اللهُ﴾** وە فوو بە كەڕەنادا كراو هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە لە هۆش خۆی چوو (یاخود مرد) مەگەر ئەوەی كە خوا بیەوێ، ئەو پرسیارە كە دەڵێ: ئایا ئەهلی بەهەشتیش دەمرن وەك حۆرییەکان و کوڕان (ولدان، غلمان) كە بۆ خزمەتی بەهەشتییەکان دروستکراون؟! وە ئایا فریشتەکان هەموو دەمرن لە نێویاندا ئەوانەش كە عەرشی خوا هەڵدەگرن؟!

---

1) (ابراهيم- 48).

بەڵێ ئەو پرسیارە هەر لە ئەسڵدا زەمینەی نیە؟! چونکە خوای بەرزو مەزن باسی گۆڕانو تێکچوونو بەسەریەکدا ڕووخانی ئاسمانەکانو زەوی دەکات، بەڵام بەهەشت لە سەرووی ئاسمانەکانو زەوییەوەیە، وەك لە فەرموودەدا هاتوە کە: عەرشی خوا سەربان (سقف)ی بەهەشتە[1]! هەروەها دۆزەخیش لە دەرەوەی جوغزو بازنەی ئاسمانەکانو زەوی دایە. کەواتە: ئەو گۆڕانکاریی‌و کارەساتە بەسەر ئەواندا نایەت، وە بەسەر دروستکراوانێکیشدا کە تێیاندان نایەت.



1) إذا سألتم فاسألوا الفردوس فأنه وسط الجنَة و أعلى الجنّة وفوقه عرش الرحمن و منه تفجر الأنهار الجنّة) ، رواه البخاري برقم : 2790. و رواه أحمد و ابن حبَان والطبري.

## 3/ لە ئەنجامی فووی دووەمدا سەرجەم مردووەکان زیندوو دەبنەوەو کۆدەکرێنەوە:

بە فووی یەکەم کە (ئیسرافیل) بە کەڕەنای دا دەکات، هیچ شتێك وەك خۆی نامێنێ لە ئاسمانەکانو زەویدا، بە فووی دووەمیش بە پێ چەوانەوە هەموو شتێك دووبارە دەبێتەوەو سیستەمی بوون بە شێوەیەك کە خوا دەیەوێو دەزانێ چۆنە، دووبارە دەبێتەوەو شوێنی لێ کۆبوونەوە (محشر)ێك پەیدا دەبێت، کە خەڵك هەمووی لەوێ کۆدەکرێتەوەو پردو ( صراط) ێك پەیدا دەبێت لەنێوان بەهەشتو دۆزەخداو دیارە بەهەشتو دۆزەخیش پێشتر هەبوونو بە کارەساتی قیامەتیش لە بەین نەچوون!

هەروەها هەر لەبارەی قۆناغی دووەمی قیامەتدا کە پاش فووی دووەم دێ، خوا فەرموویەتی: ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ الأَجْدَاثِ إِلَى رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ ۞ قَالُوا يَا وَيْلَنَا مَن بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا هَذَا مَا وَعَدَ الرَّحْمَنُ وَصَدَقَ الْمُرْسَلُونَ ۞ إِن كَانَتْ إِلاَّ صَيْحَةً وَاحِدَةً فَإِذَا هُمْ جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ﴾[1]، واتە: وە فوو بە کەڕەنادا کراو یەکسەر هەموویان لە گۆڕەکانی خۆیان بە ئاسانی هاتنە دەر، گوتیان، هاوار بۆ ئێمە، کێ ئێمەی لەم گۆڕ (و شوێن)انەمان دەرهێنایەوە؟! (ئنجا هەر خۆیان دەڵێن: یاخود فریشتەکان پێیان دەڵێن:) ئەمە گفتی ڕاستی خوای خاوەن بەزەیی‌یە کە بەڵێنی دابوو، وە پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) ڕا ستیان کرد، ئەو (هەڵسانەوەیە)ەش تەنیا یەك هاوارو چریکەیە کە هەموویان لەبەردەستی ئێمە ئامادە دەبن.

---

1) ( يس 51-53 ).

ئنجا چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەریش ﷺ چۆنیەتی ئەو زیندووبوونەوەیەی ئینسانەکانمان بۆ ڕوون دەکەنەوە: لە فەرموودەیەکدا دەفەرمویٚ: **﴿ثم يُرْسِلُ الله (أو قال: يُنْزِلُ الله) مطراً كأنه الطَّلُّ (أو الظِّلُّ) فَتَنْبُتُ مِنْهُ أَجْسادُ النّاسِ﴾**(1)، واتە: پاشان خوا بارانێك دەنێرێ (یان فەرمووی: دەبارێنێ) کە وەك ئاونگ (یاخود سێبەر) وایە، وە جەستەی خەڵکی بە هۆی ئەو بارانەوە دەڕوێتەوەو زیندوو دەبێتەوە.

لە فەرموودەیەکی دیکەدا هاتوە: **(ما بين النفختين أُربعون، ثم ينزل من السماء ماء فَيَنْبِتُون كما يَنْبُتُ البَقْلُ و ليس في الأنسان شيء الاّ بَلِيَ، الاّ عَظْمٌ واحدٌ وهو عَجبُ الذَّنب، منه يُركَّبُ الخَلْقُ يوم القيامة)**(2)، واتە: لە نێوانی دوو فووەکاندا چلە، (نازانین کە ئەو چلە، چ جۆرە پێوەرێکە، (أبو هريرة)ی ڕاوی فەرموودەکەش، نەیزانیوە چەندە، ئایا ساڵە، مانگە، هەفتەیە، ڕۆژە، سەعاتە؟! کەواتە: نازانین)، پاشان ئاوێك لە ئاسمان دێتە خوارێو خەڵك وەك ڕووەك دەڕوێنەوە، وە هیچ شتێك نیە کە لە جەستەی ئینساندا نەڕزێ جگە لە ئێسقانێك، ئەویش بریتیە لە کلێنچە (عَجْب الذَّنْبْ) ﴿کە ئێسقانێکە لە کۆتایی بڕبڕە (فقرات)ی پشت﴾ ئینسانەکان لە ڕۆژی قیامەتدا لەوەوە دووبارە ڕێك دەخرێنەوەو زیندوو دەکرێنەوە.

ئەم فەرموودەیەش هەر هەمان مەبەست دەگەیەنێ: **(كل ابن آدم يَأكُلُهُ التراب الاّ عَجْبُ الذَّنَبِ منه خُلِقُ و فيه يُركَّب)**(3)، واتە: لاشەی ئادەمیزان

1) رواه مسلم عن عبدالله بن عمر برقم: 2940.

2) رواه البخاري ومسلم عن ابي هريرة رضي الله عنه البخاري برقم: 4935، ومسلم برقم: 2955.

3- رواه مسلم عن أبي هريرة رضي الله عنه برقم: 2955، و رواه مالك وأبوداود والنسائي بنفس اللفظ، (الأرض) بدل (التراب).

هەمووی زەوی دەیخوات، بێجگە لە (کۆتایی کلێنچە)، لەوە دروست بووەو هەر لەوەش جارێکی دی پێکدەهێنرێتەوە.

یەکەمین کەسیش کە لە گۆڕە کەی خۆی سەر دەردێنێتو زیندوو دەکرێتەوە، پێغەمبەری کۆتایی (محمد)ە ﷺ، وەك بۆ خۆی دەفەرموێ: **(أنا سيِّد ولَدِ آدم يوم القيامة وأول مَنْ يَنْشَقُّ عنه القَبْرُ وأَوَّلُ شافِعٍ وأَوَّلُ مُشَفَّعٍ)**[1]، واتە: من گەورەی وەچەی ئادەمم لە ڕۆژی دواییدا، یەکەمین کەسیشم کە گۆڕ لە من دەکرێتەوەو دێمە دەرێ وە یەکەمین کەسیشم کە تکا دەکەم، وە یەکەمین کەسیشم کە تکاو شەفاعەتم لێ وەردەگیرێ، (لە لایەن خوای پەروەردگارەوە).



1) رواه مسلم عن أبي هريرة رضي الله عنه برقم: 2278.

## 4/ چۆنیـەتی و شوێنی کۆکردنەوەی دروستکراوەکان:

خوای بەرزو باڵادەست فەرمووویەتی: ﴿...كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ﴾[1] واتە: وەك چۆن یەکەم جار دروستمان کردوە، ئاواش دووبارەی دەکەینەوە، (واتە: دوای ئەوەی کە مراندومانن، دووبارە زیندوویان دەکەینەوە، وەك جاری یەکەم، بە پێی ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایان، تەنیا ئینسانو جند نین کە زیندوو دەکرێنەوە، بەڵکو هەرچی ژیانەوەری سەرزەوییە هەمووی زیندوو دەکرێتەوە، وەك خوای زاناو توانا عزّوجلّ- فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا الْوُحُوشُ حُشِرَتْ﴾[2] واتە: وە کاتێك کە جانەوەران کۆکرانەوە، جا هەرچەندە هەندێ لە زانایان لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا گوتوویانە: کاتێك بوو نەوەر تێکدە چێ جانەوەران هەموویان خڕدەبنەوە سەریەكو گوێیان لەو چریکەیە دەبێ بۆیە کۆدەبنەوە!! بەڵام ئەم ئایەتە ڕێگا لەو جۆرە تەفسیرە دەگرێ، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلاَّ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم مَّا فَرَّطْنَا فِي الكِتَابِ مِن شَيْءٍ ثُمَّ إِلَى رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ﴾[3]، واتە: هیچ جموجۆڵکەرێك لە سەر زەوی نیەو هیچ باڵندەیەك نیە کە بە دوو باڵەکانی بفڕێ، مەگەر هەموویان وەك ئێوە ئۆممەتن، لە کتێبی خۆماندا هیچ شتێکمان بە زایە نەداوە، پاشان بۆ لای پەروەردگاریان کۆدەکرێنەوە (کە مەبەست پێی قیامەتە).

دیارە حیکمەتی یان یەکێك لە حیکمەتەکانی کۆکردنەوەو لێپرسینەوەی ژیاندارانیش ئەوەیە کە دادگەری ڕەها (العدالة المطلقة)ی خوا عزّو جلّ-

1) ( الأنبياء- 104 ).
2) ( التكوير- 5 ).
3) ( الأنعام- 38 ).

بچەسپێ لەنێو سەرجەم کائینات دا!! ئەگەرنا جگە لە مرۆڤ و جند چوونە بەهەشتو دۆزەخیان نییە. بەڵام بۆ ئەوەی دادگەری بێسنووری خوا بە تەواوی بچەسپێ، وەك لەم فەرمایشتەدا دەردەکەوێ: **(لتؤدُّنَّ الحقوقُ الى أهلها يوم القيامة حتى يُقادَ للشاة الجَلْحاءِ من الشّاة القَرْناءِ)**[1]، واتە: مافەکان بۆ خەڵکی خۆیان ڕەت دەکرێنەوە لە ڕۆژی دواییدا، تەنانەت تۆڵە دەکرێتەوە بۆ مەڕی بێ قۆچ لە مەڕی قۆچدار!

شایانی باسیشە یەکێك لەو زانایانەی هاوچەرخمان کە بڕوایان وایە لە ڕۆژی دواییدا ئاژەڵو پەلەوەریش کۆدەکرێنەوە (ناصرالدین الألباني) یە ڕەحمەتی خوای لێبێو زۆر فەرمودەی لەسەر ئەوە هێناوەتەوەو دەڵێ: بەڕاستی زۆر سەیرە کە ئەم هەموو فەرموودانە هەبنو ئایەتەکەش دەلالەت بکات، کەچی کەسانێك هەبن نکوولیی لەو مەسەلەیە بکەن.

دەربارەی چۆنیەتی کۆکرانەوە (حشر)ی خەڵکیش، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **(يُحْشَرُ الناس يوم القيامة حُفاةً عُراةً غُرْلاً)**[2]، واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا خەڵك کۆدەکرێنەوە بە پێخواسیو ڕووتیو بە خەتەنە نەکراویی!

(عائشة) خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا **(الرجالُ و النساء جميعاً ينظر بعضهم الى بعضٍ)** پیاوانو ئافرەتان هەموو پێکەوە بن، تەماشای یەکتری دەکەن!! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **(يا عائشة الأمر أشَدُّ مِنْ أنْ يَنْظُرَ بَعْضُهم الى بعض)**، واتە: ئەی عائیشە کارەکە زۆر لەوە توندترە کە خەڵك بتوانێ سەیری یەکدی بکەن.

1) رواه مسلم عن أبي هريرة رضي الله عنه برقم: 2582.
2) رواه البخاري ومسلم عن عائشة -رضي الله عنها-، البخاري برقم: 6527، ومسلم برقم: 2859.

دەربارەی شوێنی کۆکردنەوە (محشر)یش، پێغەمبەر ﷺ دە فەرموێ: **(يحشر الناس يوم القيامة على أرضٍ بيضاء عَفْراء كقرصة النقيّ....)**[1]، واتە: خەڵك لە ڕۆژی دواییدا کۆدەکرێنەوە لەسەر زەوییەکی سپی زۆر سپی کە ڕەنگی دیکەی لەگەڵدا نەبێو وەك نانێکی سپی کە لە ئاردێکی دابێژراو دروست کرابێ.

بەڵام ئایا ئەو شوێنە کوێیەو لە کوێیە؟! دیارە نازانینو ئەو زانیاریە تەنیا لای خوایە، بەڵام لەوە دڵنیاین کە ئەو شوێنە ئەم زەوییەی ئێستامان نیە بەم شێوەیەی ئێستای، چونکە خوا فەرموویەتی: (**يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ**) جا ئایا ئەو شوێنە هەر لەم سەرزەمینەی ئێستامانەو خوا گۆڕانی بەسەردا دێنێ؟! یاخود خوای کاربەجێو زاڵ شوێنێکی دی کە بۆ ئەو مەبەستە دروست دەکات؟! بەس خوا دەزانێ!



1) رواه البخاري ومسلم عن سهل بن سعد، البخاري برقم: 6521، ومسلم برقم: 2790

## 5/ حاڵ و بـاڵی خراپەکاران و چاکەکاران لەو ڕۆژەدا:

خوای بەرزومەزن فەرموویەتی:﴿يَوْمَ تَرْجُفُ الرَّاجِفَةُ ۞ تَتْبَعُهَا الرَّادِفَةُ ۞ قُلُوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ ۞ أَبْصَارُهَا خَاشِعَةٌ ۞ يَقُولُونَ أَئِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِي الْحَافِرَةِ ۞ أَئِذَا كُنَّا عِظَامًا نَّخِرَةً ۞ قَالُوا تِلْكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ﴾[1]، واتە: ئەو ڕۆژەی کە لەرزینەوە دەلەرزێتەوە، بەدوای ئەودا یەکی دی دێ، (واتە: فووی یەکەم، پاشان فووی دووەم)، چەند دڵێك لەو ڕۆژەدا هەڵپەیانەو زۆر بە خێرایی لێدەدەن، چاوەکانیان زۆر بەترس و لەرزن، دەڵێن ئایا ئێمە گێڕراینەوە بۆ حاڵەتی پێشووو زیندووکراینەوە؟! ئایا دوای ئەوەی کە بووبووین بە ئێسقانی پواو (زیندوو بووینەوە)؟! گوتیان: بەڕاستی ئەم جارەو ئەم گێڕانەوەیەو دووبارە دروستبوونەوەیە بۆ ئێمە شتێکی زیان بەخشەو زۆر مایەی زەرەرە، (چونکە بڕوامان بەم ڕۆژە نەبوو هیچ چاکمان بۆی نەکردوەو پەرێزێکی پیسمان هەیە).

وە لە تەفسیری ئەم ئایەتەشدا کە دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (المطففين- 38)، ئەو ڕۆژەی خەڵك بۆ پەروەردگاری جیهانیەکان هەڵدەستن و ڕادەوەستن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (يقوم أحَدُهُم في رَشْحِهِ الى أنْصافِ أُذُنَيْهِ)[2]، واتە: خراپەکاران و کافرەکان هەیانە هەتا نێوەڕاستی گوێ یەکانی دەکەوێتە نێو ئارەقەی لاشەی خۆیەوە.

لە فەرمودەیەکی دیکەدا فەرموویەتی: (فيكون الناس على قدر أعمالهم في العَرَقِ، فمنهم من يكون الى كَعْبَيةِ، ومنهم من يكون الى رُكْبَتَيه،

1) (النازعات: 6-11).
2) متفق عليه عن ابن عمر-رضي الله عنهما-، البخاري برقم: 4938، ومسلم برقم 2862

**ومنهم من يكون الى حِقْوَيه، ومنهم من يُلْجِمُهُ العرق إلجاماً)**[1]، واتە: جا خەڵکی -کافرو گوناهبار- بە ئەندازەی کردەوە خراپە-کانیان دەکەونە نێو ئارەقەوە، هەیانە هەتا ئەژنۆی دێ، وە هەیانە هەتا کەلەکەکانی دێو هەشیانە ئارەقە جڵەوی دەکات (واتە هەتا زاری دێ).

دیارە چاکەکارانیش لەو ڕۆژەدا بە پێ چەوانەی خراپەکارا نەوەن. وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: **﴿إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا الْحُسْنَى أُوْلَئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ ۞ لاَ يَسْمَعُونَ حَسِيسَهَا وَهُمْ فِي مَا اشْتَهَتْ أَنفُسُهُمْ خَالِدُونَ ۞ لا يَحْزُنُهُمُ الْفَزَعُ الأَكْبَرُ وَتَتَلَقَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ هَذَا يَوْمُكُمُ الَّذِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾**[2]، واتە: ئەوانەی کە لەلایەن ئێمەوە پێ شتر بەڵێنی باشیان پێدراوە (کە ئیمانداران و چاکەکارانن و خوا گفت و بەڵێنی سەلامەتی و چوونە بەهەشتی پێداون)، ئەوانە لە دۆزەخ دوور دەخرێنەوە، دەنگ و قرچەقرچی ئاگرەکە نابیستن (کە کافرو خراپەکاران دەسووتێنێ) لە شوێنێك دان ئەوەی کە ئارەزوویان دەیخوازێ، تێیدایەو بە هەمیشەی دەمێننەوە (کە بەهەشتە). وە ترس و بیمی داچڵەکێنەری گەورە (لە قیامەتدا) ئەوان دڵ تەنگ ناکات، وە فریشتەکان دێنە پێشوازییان (و پێیان دەڵێن): ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە بەڵێنتان پێ درابوو (ترستان نەبێ).

1) رواه مسلم عن المقداد بن الأسود -رضي الله عنه-، برقم: 2864
2) (الأنبياء 101-103).

## 6/ تکا کردنی مەزن (الشفاعة العُظْمى):

ئنجا ئەو خەڵکە هەر هەمووی کۆدەکرێتەوە، لە ئادەمەوە -علیه السلام- تا دوایین رِۆڵەی ئادەم‌و لە ئیبلیسەوە تا دوایین وەچەی ئیبلیس، کافرو مسوڵمان، خراپەکارو چاکەکار، هەمەیان لە گۆڕەپانێکدا ڕادەوەستن کە هەر خوا دەزانێ چەند فراوان‌و گەورەیەو هەر هەموویان ترس‌و بیمیان هەیەو چاوەڕوانی سەرەنجامی خۆیان دەکەن‌و نازانن چی بکەن! پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿أنا سيّدُ الناس يوم القيامة، وهَلْ تدرون بمَ ذاك؟! يَجْمَعُ الله يوم القيامة الأولين والآخرين في صعيدٍ واحدٍ. فَيُسمِعُهُم الراعي ويَنفُذُهُم البصَرُ، و تدنو الشمسُ فيبلُغُ الناس من الغَم و الكربِ ما لا يطيقون وما لا يحتملونَ، فيقول بعض الناس لبعض: الا ترون ما أنتم فيه؟ ألا ترون ما قَد بَلغكم؟ ألا تنظرون مَن يشفعُ لكم الى ربكم؟

فيقول بعض الناس لبعضٍ، أئتوا آدم، فيأتون آدم فيقولون: يا آدم! أنت أبوالبشر خلقك الله بيده ونفخ فيك من روحه وأمَرَ الملائكة فسجدوا لك، إشفع لنا الى ربك. ألا ترى الى ما نحن فيه؟! ألا ترى الى ما قد بَلغنا؟ فيقول آدم: إنَّ ربّي غَضِبَ اليوم غَضباً لِم يَغْضَبْ قبله مِثْلَه ولَن يَغْضَبَ بعده مِثْلَهُ. وإنه نهاني عن الشجرة فَعَصَيْتُهُ. نَفسي نَفْسي، إِذْهبوا الى غيري، إِذهبوا الى نوحٍ.

فيأتون نوحاً فيقولون: يا نوح! أنت أول الرُّسُلِ الى ألأرض، و سّماك الله عبداً شكوراً. إشفع لنا الى رَبّك ألاترى ما نحن فيه؟ ألاترى ما قد بَلَغَنا؟ فيقول لهم: إنَّ ربي قد غَضِبَ اليوم غَضَباً لم يَغضَبْ قبله مثله، ولن يَغْضَب

بعده مِثْلَهُ، وإنَّهُ قد كانت لي دعوة دعوت بِها على قومي، نَفْسي نَفْسِي! إذهبوا الى إبراهيم -عليه الصلاة والسلام-.

فَيَأتون إبراهيم فيقولون: أنت نَبِي الله و خَليله من أهل الأرض، إشْفَعْ لنا الى ربك، ألا ترى الى ما نحن فيه؟ ألاترى الى ما قَدْ بَلَغْنا؟! فيقول لهم إبراهيم: إنَّ ربّي قد غَضِبَ اليوم غَضَباً لم يَغْضَب قبله مِثْلَهُ ولا يَغْضَبُ بعده مثله، وذكر كذباته، نَفْسِي نَفْسي، إذْهَبُوا الى غيري، إذهبوا الى موسى.

فيأتون موسى -عليه الصلاة والسلام-، فيقولون: أنت رسول الله فضلّك الله بِرسالاته وبتكلمه على الناس إشفع لنا الى ربك ألاترى الى ما نحن فيه؟ ألاترى ما قد بَلَغنا؟ فيقول لهم موسى -عليه الصلاة والسلام- إنَّ ربي قد غضب اليوم غضباً لم يَغْضَبْ قبله مِثْلَهُ، ولن يَغْضَب بعده مِثْلَهُ، وإني قتلتُ نفساً لم أُوْمَرْ بِقتْلِها، نَفْسي نَفْسي، إذهبوا الى عيْسى -عليه الصلاة والسلام-.

فيأتون عيسى فيقولون: يا عيسى أنت رسول الله وكلّمت الناس في المهد، وكلمة منه ألْقاها الى مريم و روحٌ منه فآشفعْ لنا الى ربك، ألاترى ما نحن فيه؟ ألاترى الى ما قد بَلَغنا؟ فيقول لهم عيسى -عليه الصلاة والسلام- إن ربّي قد غَضِب اليوم غَضَباً لم يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ و لن يَغْضَبَ بعده مثْلَهُ -ولم يذكر له ذَنْباً- نَفْسي نَفْسي، إذهبوا الى غيري إذهبوا الى محمد ﷺ.

فيأتوني فيقولون: يا محمد! أنت رسولُ الله و خاتم الأنبياء و غفر الله لك ما تَقَدّمَ من ذَنبك وما تأخَّر. إشفعْ لنا ربك ألاترى ما نحن فيه؟ ألاترى ما قد بَلَغْنا؟ فأنْطَلِقُ فآتي تحت العَرش فأَقَعُ ساجِداً لربي، ثم يفتح الله عليَّ و يُلْهِمُني من محامده وحُسْنِ الثناءِ شيئاً لم يَفتَحْهُ لأحدٍ قَبْلي. ثم قال: يا

**محمد إرفع رأسَكَ، سل تعطه، إشْفَع تُشَفَّعْ. فأرفع رأسي فأقول: يارَبِّ أُمَّتي أُمَّتي.**

**فيقالُ: يا محمد أَدْخِلِ الجنة من أمتك مَنْ لا حِسابَ عليه من الباب الأيْمَن من أبواب الجنّة، وهم شركاءُ الناس فيما سوى ذلك من الأبواب.... والّذي نفس محمدٍ بيده إنَّ ما بين المصراعين من مصاريع الجنّة، لكما بين مكة وهَجَرٍ، أو بين مكة وبصرى﴾** رواه البخاري عن أبي هريرة - رضي الله عنه- برقم: 7412، ومسلم برقم 327.

واته: من سەروەری خەڵکیم لە ڕۆژی قیامەتدا، دەزانن ئەوەش لەبەر چییە؟ خوا هەموو خەڵکی بە پێشین و پاشینەوە لە گۆڕەپانێکدا کۆدەکاتەوە کە بانگکەر دەنگی دەیانگاتێ و چاو دەیانبینێ، وە خۆر نزیك دەکەوێتەوە و خەڵکی دەکەونە نێو خەم و تەنگانەیەك کە لە قەرەیاندا نیە و نایتوانن!

جا هەندێك لە خەڵکی بە هەندێکیان دەڵێن: ئایا نابینن لە چ حاڵێك دان و نابینن گەیشتوونە چی؟ ئایا یەکێك نادۆزنەوە کە تکاتان بۆ بکات لە لای پەروەردگارتان (تاکو دەست بە لێپرسینەوە بکرێ)؟!

جا هەندێك لە خەڵکی بە هەندێکیان دەڵێن: بچنە لای ئادەم، ئیدی دەچنە لای ئادەم و دەڵێن: ئەی ئادەم! تۆ بابی مرۆڤانی، خوا بەدەستی خۆی دروستی کردووی و لە گیانی خۆی فووی بەبەردا کردووی، وە فەرمانی بە فریشتەکانی کردوە و کڕنووشیان بۆ بردووی، دەجا تکامان بۆ لە لای پەروەردگارت بۆ بکە! ئایا نابینی لە چی داین و ئایا نابینی چیمان لێ بەسەرهاتوە؟!

ئادەمیش دەڵێ: بەڕاستی پەروەردگارم ئەمڕۆ تووڕەبوونێك تووڕە بووە هەرگیز پێشتر وا تووڕە نەبووەو لە داهاتووشدا وا تووڕە نابێتەوە، وە ئەو درەختەكەی لێ قەدەغەكردمو سەرپێچیم لێ كرد، هەر خۆم (دەرباز بم) خۆم، بچنە لای یەكێكی دیكە بچنە لای نووح.

ئنجا دێنە لای نووحو دەڵێن: ئەی نووح! تۆ یەكەمین ڕەوا نەكراوی (خوای) بۆ (خەڵكی سەر) زەوی، وە خوا ناوی ناوی بەندەی سوپاسگوزار، تكامان بۆ لای پەروەردگارت بكە! سەرنج نادی ئێمە لە چی داین؟ سەرنج نادەی چیمان لێ قەوماوە؟ ئەویش پێیان دەڵێ: بەڕاستی پەروەردگارم ئەمڕۆ تووڕەبوونێك تووڕە بووە، هەرگیز لە ڕابردوودا وا تووڕە نەبووەو لە داهاتووشدا ئاوا تووڕە نابێتەوە، وە من پاڕانەوەیەكم هەبوو كە لە ڕابردوودا لە گەلەكەمم كرد، هەر خۆم هەرخۆم (دەرباز بم!). بڕۆن بۆ لای ئیبراهیم -علیه الصلاة والسلام-.

ئنجا دێنە لای ئیبراهیمو دەڵێن: تۆ پێغەمبەری خواو خۆشەویستی دانستەی وی لە خەڵكی سەر زەوی، دەجا تكامان لەلای پەروەردگارت بۆ بكە! ئایا نابینی لە چی حاڵێك داین؟ ئایا نابینی چیمان لێ هاتووە؟ ئیبراهیمیش پێیان دەڵێ: بەڕاستی ئەمڕۆ پەروەردگارم بە جۆرێك تووڕە بووە كە هەرگیز لە ڕابردوودا وا تووڕە نەبووەو لە داهاتووش ئاوا تووڕە نابێتەوە، وە درۆیەكانی خۆی باسكرد[1] (واتە: ئەو سێ قسەیەی كردە

[1] ئەو سێ قسەیەش وەك (البخاري) لە (إبن عبّاس)ەوە هێناونی ئەمانە بوون:
أ- كە گوتی من نەخۆشم (إني سقيم) تاكو نەچێتە دەرو بتەكان بشكێنێ.
ب- كە گوتی: بتە گەورەكەیان شكاندوونی (بل فعلهُ كبيرهم هذا) پاش ئەوەی بتەو سەنەمەكانی شكاند.

پاساوی تکا نەکردنی کە بە ڕواڵەت وەك درۆ دەچوون)، هەر خۆم هەر خۆم (دەرباز بم!) بچنە لای یەکێکی دیکە، بچنە لای مووسا.

ئنجا دێنە لای مووسا -علیه الصلاة والسلام- و دەڵێن: ئەی مووسا! تۆ پێغەمبەری خوای، خوا بەهۆی پەیامو قسە لە گەڵ کردنتدا بە سەر خەڵکیدا هەڵی بژاردووی! تکامان بۆ لە پەروەردگارت بکە، نابینی لە چ حاڵێك داین؟ جا نابینی چیمان لێ قەوماوە؟ مووساش -علیه الصلاة والسلام- پێیان دەڵێ: بەڕاستی ئەمڕۆ پەروەردگارم وا تووڕە بووە کە هەرگیز پێشتر وا تووڕە نەبووەو لە داهاتووشدا وا تووڕە نابێتەوە، وە من کەسێکم کوشت کە فەرمانم پێ نەکرابوو بیکوژن، هەر خۆم هەر خۆم (دەرباز بم) بڕۆن بۆلای عیسا -علیه الصلاة والسلام-.

ئنجا دەچنە لای عیساو دەڵێن: ئەی عیسا تۆ ڕەوانەکراوی خوای و لە بێشکەشدا قسەت لەگەڵ خەڵکی کردوە، وە تۆ وشەی خوای و گیانێکی لە خواوە کە بۆ مەریەمی نارد، دەجا تکامان بۆ لەلای پەروەردگارت بکە ئایا نابینی لەچی داین؟ ئایا نابینی چیمان لێ هاتوە؟

عیساش -علیه الصلاة والسلام- دەڵێ: بەڕاستی ئەمڕۆ پەروەردگارم بە شێوەیەك تووڕە بووە، کە هەرگیز لە ڕابردوودا وا تووڕە نەبووەو لە داهاتووشدا وا تووڕە نابێتەوە -بەڵام باسی هیچ گوناهێکی نەکرد- هەر خۆم هەر خۆم (دەرباز بم) بچنە لای یەکێکی دیکە، بچنە لای موحەمەد ﷺ ئنجا دێنە لای منو دەڵێن:

---

ج- کە سارای خێزانی بە خوشکی ناوبرد: (إنّها أختي) تاکو دەربازی بکات لە پاشای میسر.

ئەی موحەممەد! تۆ ڕەوانەکراوی خواو کۆتایی پێغەمبەرانی وە خوا لە گوناهی سەرەتاو کۆتاییشت خۆش بووە، وە چا تکا مان بۆ لەلای پەروەردگارت بکە، ئایا سەرنج نادەی لە چی داین؟ ئا یا سەرنج نادەی چیمان لێهاتوە؟

منیش دەڕۆم بۆ ژێر عەرش‌و بۆ پەروەردگارم بە کڕنوو شدا دە کەوم، پاشان خوا دەروونم ڕۆشن دەکاتەوەو لە ستایش کردن‌و چاك پێ هەڵگوتنی خۆی شتی وام فێر دەکات کە پێش من فێری کەسی نەکردوە.

ئنجا دەگوترێ: ئەی موحەممەد سەرت بەرزبکەوە، داوا بکە دە تدرێتێ تکا بکە تکات وەردە گیرێ! م نیش سەرم بەرز دەکە مەوەو دە لێم: پەروەردگارم ئۆمەتەکەم ئۆمەتەکەم!

دەگوترێ: ئەی موحەممەد سەرجەم ئەوانەی کە لێپرسینەوەیان لەسەر نیە لە ئۆممەتت بخە بەهەشتەوە لە دەرگای ڕاست لە دەرگاکانی بەهەشت. وە لە دەرگاکانی دیکەشدا لەگەڵ خەڵکیدا بەشدارن. جا سوێند بەو کە سەی گیانی موحەممەدی بە دە ستە ن ێوان هەرکام لە دوولا شیپانەکانی (دەرگاکانی) بەهەشت هێندەی مەککەو هەجەر، یان ن ێوانی مەک کەو بوصرا دەبێ[1].

شایەنی باسیشە ئەم تکا کرد نە مەز نەی پێغەم بەری کۆ تایی ﷺ یەکێکە لەو ئیمتیازو تایبەتمەندیانەی کە پێیان بەسەر سەرجەم پێغەمبەرانٍ -علیهم السلام-دا بەرزکراوەتەوەو لە قورئانیشدا بە (مقا ما مح موداً) باسکراوە، وەك خوای عزّوجلّ- فەرموویەتی: ﴿عَسَى أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ

1) (هَجَرْ) شارێك بووە لە یەمەن‌و (بُصْرى)ش شارێك بووە لە شام.

مَقَامًا مَّحْمُودًا﴾(الأسراء- 79)، واتە: ئەی پێغەمبەری خوا زۆر نزیکە پەروەردگارت لە پلەو پایەیەکدا تۆ زیندووبکاتەوە کە زۆر ستایشت بکرێ.

چونکە بێگومان سەرجەم مرۆڤ و جند ستایشی پێغەمبەر ﷺ دەکەن کە تکای بۆ کردوونو لەو ڕۆژە ناخۆشە ڕزگاری کردوونو خوا دەستی کردوە بە لێپرسینەوەو سزاو پاداشت دانەوە، تاکو چی دیکە خەڵك چاوەڕوانی نەکات، وە ئەوە هەم پایەی ستایش کراو (المقام المحمود)و هەم تکاکردنی مەزن (الشفاعة العظمى)ی پێ دەڵێن: چونکە پێغەمبەر تکا (شفاعة) بەگشتی بۆ هەموو جندو ئینسانەکان دەکاتو بە تایبەت بۆ ئوممەتی خۆی.

ئنجا دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ تکای کردو خوای بەبەزەییش تکای لێ وەرگرت، دەست دەکرێ بە لێپرسینەوەو دیاریکردنی سزاو پاداشت. وەك پێشەوای توێژەرەوانی قورئان (طبري) لە تەفسیری ئایەتی پێشوودا گوتوویەتی: (قال أكثر أهل التأويل: هو المقام الذي يقومُهُ ﷺ يوم القيامة للشّفاعة للناس ليُرِيحهُم ربُّهم من عظيم ماهم فيه من شدّة ذلك اليوم...)[1]، واتە: زۆربەی توێژەرەوان گوتویانە: ئەوە ئەو پایەیە کە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا دەیبێت بۆ تکاکردن بۆ خەڵك کە پەروەردگاریان لەو حاڵە گەورەیەی کە بە هۆی ناخۆشی ئەو ڕۆژەوە تێی کەوتوون، ڕزگاریان بکاتو بیان حەسێنێتەوە.

1) بڕوانە: (مختصر تفسير الطبري) ص 290.

## 7/ لێپرسینەوەو دادگاییکردنی بەندەکان:

ئنجا بەڕێزان! پاش تکا (شفاعة)کردنی پێغەمبەر ﷺ خوای داد گەر لێپرسینەوەو دادگاییکردنی بەندەکان دەست پ ێدەکات وە مەبە ست لە لێپرسینەوەو دادگاییکردنی خوای کاربەجێ بۆ بە ندەکانی ئەوە یە: کە هەرکام لە ئینسانەکانو جندەکان بە تەنیا دەوە ستێنرێن، وە هەموو کردەوەکانی، ئەوەی کە بە دڵ ئەنجامی داونو ئەوەی بە زمان دەریبڕیونو ئەوەی بە ئەندامە ڕواڵەتییەکانی جێبەجێی کردوون، هەر هەموویان بە تۆ مارکراوی ڕادە نوێنرێنو پێ شانی دەدر ێت، پا شان دەکێ شرێنو هەڵدە سەنگێنرێن ئەمجا لە کۆتای یدا لێ ستەو نا مەی کردەوە کانی وەردەگرێتەوەو بەرەو شوێنی خۆی بەڕێ دەکرێ.

ئەوە بە کورتی مانای لێپرسینەوەو سزاو پاداشت، بەڵام با لە چەند کورتە باسێکدا چۆنیەتی ئەو لێپرسینەوەیە ڕوون بکەینەوە:

أ- کردەوە کانی ئینـ سان چ کردەوە کانی دڵ (أعـ ـمال القـ ـلب) بن، چ دەربڕینەکانی زمان بن یان نووسین،و چ کردەوەی ئەندامە ڕواڵەتی‌یەکان بن، بە هەموو شێوەکانی تۆمارکردن، تۆمار دەکرێن، با سەرنجی هەندێ لە ئایەتەکان بدەین، تاکو مەبەستەکە زیاتر ڕوون بێتەوە، خوای زا نـاو توانا فەرموویەتی: (**وَوُضِعَ الْكِتَابُ فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِـ مَّا فِـ يهِ وَيَقُولُونَ يَا وَيْلَتَنَا مَالِ هَذَا الْكِتَابِ لا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلا كَبِيرَةً إِلاَّ أَحْصَاهَا وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِرًا وَلا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا﴾**[1]، وا تـە: وە کتـ ێب دانرا (ئەو کتێبو لیستەی کە هەموو کردەوە کانی بە ندەکانی تـ ێدا

1) ( الكهف- 47 ).

تۆمارکراوە) جا تاوانباران دەبینی کە دەترسێن لەوەی کە لە لیستەکانیاندا تۆمارکراوەو دەڵێن: ئەی هاوار بۆ ئێمە ئەو کتێبە چییە؟! هیچ گچکەو گەورەیەکی نەبواردوەو هەمووی سەرژمێر کردوە! وە ئەوەی کردبوویان (نەك هەر بە نووسراوی بەڵکو) بە ئامادەیی دەیبینن، وە پەروەردگار (ی پەنهان بین‌و زاناو دادگەر) ستەم لە هیچ کەس ناکات.

ئەم ئایەتە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە وێڕای نووسران‌و تۆمارکردنی کردەوەو هەڵس‌وکەوتەکانی بەندەکان، فیلم بەرداریی (تصویر)یش دەکرێن، بە کامێرایەکی خوایی‌و پاشان بە بەرجەستەیی سەراپای هەڵس‌وکەوتەکانی نیشان دەدرێتەوە!

هەروەها خوای بێوێنە فەرموویەتی: ﴿هَذَا كِتَابُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِالْحَقِّ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[1]، واتە: ئەمە کتێبی نووسراوی ئێمەیە بە هەق لەسەرتان دەدوێ، بێگومان ئێمە هەرچی ئێوە دەتانکرد نوسخە بەرداری (وفتۆکۆپی) مان دەکرد، چونکە لەبەرگرتنەوە (استنساخ) بریتییە لەوەی کە شێوەو وێنەیەك لەو شتەی کراوە لای تۆ نوسخەیەك هەبێت، کەواتە: (نَسْتَنْسِخ) هەر نووسینی ڕووت نییە! بۆیەش کاتی خۆی توێژەرەوانی قورئان وەك پێویست نەیانزانیوەو سەریان لەوە دەرنەچووە کە (استنساخ) واتای چییە، بەڵام ئێستا بۆ ئێمە زۆر ڕوون‌و ئاشکرایە، بۆیە هەتا زانیاری زیاتر بەرەو پێش بچێ، زیاتر لە نهێنییەکانی قورئان حاڵی دەبین‌و تێدەگەین.

هەروەها خوای پاك‌و تاك دەفەرموێ: ﴿يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا أَعْمَالَهُمْ ۞ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ۞ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ

1) (الجاثية- 29).

**ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾**(1)، واتە: ڕۆژی سزاو پادا شت، خەڵك بە پرژوبڵاوی دێنەدەرو دەرِۆن، بۆ ئەوەی کردەوەکانی خۆیانیان پێ نیشان بدرێ، جا هەرکەسێك بە ئەندازەی گەردیلێك چاکەی کردبێت دەیبینێت، وە هەر کەسێك بە ئەندازەی گەردێلێك خراپەی کردبێت دەیبینێت، کەوا تە: کردەوەی بەندەکان چ کردەوەکانی دڵ بن، چ هی زمان‌و نووسین بن، چ هی ئەندامەکانی بن، بە هەموو شێوەکانی تۆ مارکردن‌و کردەوەکانی خۆی دەبینێتەوە، تۆمار دەکرێن، بۆیە لەو ڕۆژەدا هیچ کەس ناتوانێ نکوڵیی بکات.

ب- بەندە چەند شایەدێك شایەدیی لەسەر دەدەن لە قیامەتدا: جاریٚ خوای پەروەردگار خۆی شایەدە، وەك دەفەرمویٚ: **﴿وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُو مِنْهُ مِن قُرْآنٍ وَلاَ تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلاَّ كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ﴾**(2)، واتە: تۆ لە هیچ حاڵێکدا نابی، وە قورئان ناخوێنی، وە هیچ کردەوەیەك ناکەی، مەگەر ئێمە بەسەرتانەوە چاودێرین کە دەیکەن.

هەروەها فەرموویەتی: **﴿..أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ؟!﴾** (فصلت- 53)، واتە: ئایا بەس نیە بۆ پەروەردگارت کە بەسەر هەموو شتێکەوە چاودێرە؟!

هەروەها فریشتەکانیش هەر شایەدو چاودێرن، وەك خوای شارەزا دەفەرمویٚ: **(وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ ۞ كِرَامًا كَاتِبِينَ ۞ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ)**(3) واتە: بێگومان چەند پارێزەرێکتان هەمیشە بەسەرەوەن، زۆر

1) ( الزلزال 6-8 ).
2) ( يونس- 61 ).
3) ( الإنفطار 10-12 ).

بەرێزنو ئەوەی دەیکەن دەینووسن، (وە) هەرچی ئێوە بیکەن ئەوان ئاگادارنو دەیزانن.

هەروەها پێغەمبەرمان ﷺ و هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەریەکەیان شایەدو چاودێرە بەسەر ئوممەتی خۆیەوە، وەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿**فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَـؤُلاء شَهِيدًا**﴾[1] واتە: (موحەمەد!) تۆ چ دەڵێی کە لە هەر ئوممەتێك شایەدێکمان بۆ هێنان (کە بە سەریانەوە چاودێر بێو بەڵگە بێ لەسەریان) وە تۆشمان هێنا تا چاودێر بی بەسەر ئوممەتی خۆتەوە!!

ئنجا سەربارەی ئەم هەموو شایەدو چاودێرانە، بەندە بۆ خۆ شی شایەدیی لەسەر خۆی دەدات، وەك لە چەند شوێنێك لە قورئاندا باسکراوە، لە یەکێ لەو شوێنانە خوای، -عزّوجلّ- دەفەرموێ: ﴿**وَيَوْمَ يُحْشَرُ أَعْدَاء اللَّهِ إِلَى النَّارِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ۞ حَتَّى إِذَا مَا جَاؤُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَارُهُمْ وَجُلُودُهُمْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ۞ وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا قَالُوا أَنطَقَنَا اللَّهُ الَّذِي أَنطَقَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ**﴾[2]، واتە: وە ئەو رۆژە کە دوژمنانی خوا بەرەو ئاگر ڕاپێچ دەکرێنو ئەوانەی پێشەوە ڕادەوەستێنرێن تاوەکو ئەوانەی دوایی پێیان دەگەن، هەتا کاتێك کە هاتن، گوێیانو چاویانو پێستیان، بەسەریانەوە دەبنە چاودێرو شایەد بەوەی کە کردوویانە، ئەوانیش بە جەستەیان دەڵێن: بۆ چی شایەدییمان لە سەر دەدەن؟ ئەوانیش دەڵێن: ئەو خوایە ئێمەی هێناوەتە قسەکردن، کە هەموو

1) ( النساء- 41 ).
2) ( فصلت 19-21 ).

شتێکی هێناوەتە گۆ، وە ئەو یەکەمجار دروستی کردوون و هەر بۆ لای ویش دەگێڕرێنەوە.

ج- ئایا کافرەکانیش لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت، یاخود یەکسەر بۆ دۆزەخ بەرێ دەکرێن؟!

هەندێك لە زانایانی ئەهلی سوننەت گوتوویانە: کافرەکان یەکسەر بۆ دۆزەخ بەرێ دەکرێن و لێیان ناپرسرێتەوە، چونکە حاڵی ئەوان دیارە، لەسەر ئەوەش چەند بەڵگەیەکیان هێناوەتەوە، بۆ وێنە ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿**وَلَا يُسْأَلُ عَن ذُنُوبِهِمُ الْمُجْرِمُونَ**﴾(1)، واتە: کافرەکان لە گوناهەکانیان لێیان ناپرسرێت، وە خوا فەرموویەتی: ﴿**فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْأَلُ عَن ذَنبِهِ إِنسٌ وَلَا جَانٌّ**﴾(2)، واتە: لەو ڕۆژەدا نە مرۆڤ و نە جنۆکە دەربارەی گوناهیان لێیان ناپرسرێ.

بەڵام زۆربەی زانایانی ئەهلی سوننەت ڕایان وایە کە نەخێر هەموو بەندەیەك لێی دەپرسرێتەوە با کافریش بێت، چەندان ئایەت و فەرموودەش لەوبارەوە هەن، ئەو ئایەت و فەرموودانەش کە ئەوە دەگەیەنن کافران لێیان ناپرسرێتەوە، بە دوو شێوە مانا دەکرێن: 1- لێپرسینەوە و دادگاییکردنی خوا لە ڕۆژی دواییدا چەند قۆناغێکە و لە چەند شوێنێك دایە جا لە هەندێك شوێن و قۆناغدا بابای کافر لێی ناپرسرێ، بەڵام لە شوێن و قۆناغی دیکەدا لێی دەپرسرێ، 2-مەبەست لە لێنەپرسینی کافران ئەوەیە کە: بۆیە لێیان ناپرسرێ کە داخۆ دانی پێدا دەنێن یان دانی پێدا ناهێنن، چونکە هەموو شتێك تۆمارکراوە، واتە پرسیاری

1) (القصص- 78).
2) (الرحمن- 39).

ئەوەیان لێ ناکرێ کە ئایا کردووتانە یاخود نەتانکردوە؟ ئەگەرنا پرسیاری دیکەیان لێ دەکرێ، وەك سەرزەنشت کردنو ڕەخنە لێگرتنو شەرمەزارکردنو ڕیسواکردن کە ئەو کارە خراپانەتان بۆچی کرد؟!

بۆ وێنە خوای پەروەردگار لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَائِيَ الَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ﴾[1]، واتە: وە ڕۆژی قیامەت خوا (عزّوجلّ) بانگیان دەکاتو دەفەرموێ: ئەو هاوبەشو هاوەڵانەی من کوان کە پێتان وابوو هاوبەشی منن؟!.

وە لە سووڕەتی (القارعة) کە باسی سەختیو دژواریی ڕۆژی قیامەت دەکات دوایی دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ ۞ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ۞ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ ۞ فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ ۞ وَمَا أَدْرَاكَ مَا هِيَهْ ۞ نَارٌ حَامِيَةٌ﴾[2]، واتە: جا کەسێك کە تەرازووی چاکەکانی گران بێت، لە ژیانێکی پڕ ڕەزامەندیی دایە، وە کەسێك تەرازووی چاکەکانی سووك بێت ئەوە لە (هاویة) دایە جا تۆ چووزانی ئەوە چییە؟ ئاگرێکی زۆر گەرمە، کەواتە: چ ئەوانەی کە کردەوە باشەکانیان قورس بنو بچنە بەهەشتو چ ئەوانەی کردەوەکانیان سووك بنو بچنە دۆزەخ، خوای دادگەر هەموویان وەك یەك دادگایی دەکاتو لێیان دەپرسێتەوە، کردەوەکانیشیان دەکێشێ.

د- بنچینەکانی دادگەری ڕەها (مطلق)ی خوا لە دادگاییو لێپرسینەوەدا:

<u>یەك:</u> هیچ کەس هێندەی گرانایی گەردێك ستەمی لێ ناکرێ، وەك دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ لاَ يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ﴾[3]، واتە: خوا بە ئەندازەی

1) ( القصص- 62 ).
2) ( القارعة 5-10 ).
3) (النساء- 40 ).

گرانایی گەردێك زوڵم لە هیچ كەس ناكات، (هەر چاكەیەكی هەیبێ دەیهێنێتە گۆڕێو خراپەكە شی چەندە بەس بە ئەندازەی خۆی دەخوێندرێتەوە).

**دوو**: هیچ كەس بە تاوانی غەیری خۆی سزا نادرێت، وەك دەفەرموێ: **﴿وَلاَ تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلاَّ عَلَيْهَا وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾**[1]، واتە: هەركەسێك خراپەیەك كە دەیكات بەس بۆ خۆی خراپە، وە هیچ كەسێك گوناهی كەس هەڵناگرێت.

جا لێرەدا پرسیارێك دەكرێ: ئەویش ئەوەیە كە لە چەند شوێنێك لە قورئاندا هاتوە كە ئەوانەی دەبنە پێشڕەو بۆ خەڵك لە خراپەدا گوناهی شوێنكەوتووەكانیشیان هەڵدەگرن، هەر چەندە شوێنكەوتووەكانیان گوناهی خۆیان هەرهەیە، بەڵام سەركردەكانیشیان لە كوفرو خراپەدا لە گوناهی ئەواندا بەشدارن، ئایا ئەوە وەڵامی چییە؟!

بۆ وێنە خوای مەزن دەفەرموێ: **﴿لِيَحْمِلُواْ أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ أَلاَ سَاء مَا يَزِرُونَ﴾**[2]، یان دەفەرموێ: **(وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالاً مَّعَ أَثْقَالِهِمْ)**[3]، هەردوو ئایەتەكان دەفەرموون: گوناهی خۆیان هەڵدەگرنو گوناهی ئەوانەش كە گومڕایان كردوون.

وەڵامی ئەو پرسیارە ئەوەیە كە: ئەو كەسانەی كە ئەوان گومڕایان كردوونو ڕێگایان لێ تێك داون، گومڕابوونی وانیش هەر كردەوەی

1) ( الأنعام- 164 ).
2) ( النحل- 25 ).
3) ( العنكبوت- 13 ).

خۆیانەو کافرانی گومڕاکەرو سەرمەشقو سەرکردە لە خراپەدا کردەوەی غەیری خۆیان نەخراوەتە سەرشان!.

**سێ:** خوای پەروەردگار شایەدو چاودێر لەسەر بەندەکانی دەگرێ، وەك پێشتر باسمان کرد، بۆ وێنە خوای چاودێر فەرموویەتی: ﴿ **مَن جَاء بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا وَمَن جَاء بِالسَّيِّئَةِ فَلاَ يُجْزَى إِلاَّ مِثْلَهَا وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ** ﴾ (الأنعام- 160)، واتە: هەرکەسێك چاکەیەك بکات، یەك بە دەیە، بەڵام هەرکەسێك خراپەیەك بێنێ بەس وەك خۆی سزا دەدرێتەوەو هیچ ستەمیان لێ ناکرێ، (لە فەرموودەی پێغەمبەردا (علیه الصلاة و السلام) هاتوە، وە لەو ئایەتەی سوورەتی (البقرة)شدا ئاماژەی پێدەکات کە دەفەرموێ: ﴿ **كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنبُلَةٍ مِّئَةُ حَبَّةٍ** (261)﴾ کە پاداشتی چاکە هەتا یەك بە حەوت سەد دەڕوات، یانی ئەگەر چاکە بەتایبەتو بە ئیخلاسەوە بۆ خوا بێت لای کەمی یەك بە دەیە، وە هەتا یەك بە حەوسەدیش دەڕوات، بەڵکو لەوەش تێدەپەڕێ[1]، بەڵام خراپە یەك بە یەکە، یەك خراپە بکەی، تەنیا هەر یەك خراپەت بۆ دەنووسرێ.

**چوار:** خستنە بەرچاو و پێشاندرانی گوناهەکان: یەکی دیکە لە پایەکانی دادگەریی ڕەهای خوا لە دادگایی و لێپرسینەوەی دوا ڕۆژدا ئەوەیە کە هەرکەسێك گوناهو خراپەو تاوانی خۆی دەخرێتە بەرچاوی، تا گومانی وانەبێ کە زوڵمی لێکراوە، وە ئەگەر خۆیشی لە بیری چووبێتەوە، بە

1) چونکە پاش: ﴿.... **كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنبُلَةٍ مِّئَةُ حَبَّةٍ**﴾ فەرموویەتی: ﴿ **وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَن يَشَاء** ﴾.

هەموو شێوەکانی تۆمارکرانەوە دەخرێتەوە بەرچاوی، وەك خوای بێوێنە فەرموویەتی: ﴿وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَآئِرَهُ فِي عُنُقِهِ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَابًا يَلْقَاهُ مَنشُورًا ۞ اقْرَأْ كَتَابَكَ كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا﴾[1]،

واتە: وە هەموو ئینسانێك چارەنووسی خۆیمان خستۆتە ئەستۆی خۆی، ڕۆژی قیامەت لیستەیەکی نووسراوی بۆ دەرد ێنین کە لەبەر چاوی بلاّودەکرێتەوەو (پێی دەگوترێ): کتێبی خۆت بخوێنەوە، ئەمڕۆ هەر بۆ خۆت دادگایی خۆت بکەو بزانە چیت کردوە!.

**پێنج**: دەرفەتو بوار پێدران بۆ بەرگری لەخۆکردن:

وەك خوای بێ هاوتا فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَى شَيْءٍ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْكَاذِبُونَ﴾[2]،

واتە: ئەو ڕۆژەی کە خوا تێکڕا زیندوویان دەکاتەوە، جا سوێند بۆ ئێوە دەخۆن (بەتایبەت مونافیقەکان) وە واش گومان دەبەن کە شتێکیان بە دەستەوە هەیە، بەلاّم ئاگاداربن کە هەر ئەوانن درۆزن. (وە لای خواش ناتوانن بەرگریی لە خۆیان بکەنو هیچیان بەدەستەوە نیە).



1) ( الأسراء 13-14 ).
2) ( المجادلة- 17 ).

## 8/ کێشـران و هەڵسـەنگێنران:

بەڵێ بەڕێزان! کردەوەکان وە خاوەنی کردەوەکان، وە لیستی کردەوەکان، هەرسێکیان وێکڕا، یاخود یەکێکیان لە ڕۆژی دواییدا دەکێ شرێ. وە ڕای ڕاستتـر ئەوەیە کە هەر سێکیان دەکێ شرێن، هەم ئیـنـ سانەکە خۆی دەکێشرێو هەم کردەوەکانی دەکێشرێنو هەم ئەو لیستەش کە کردەوەکانی تێدا تۆمارکراون.

خوای پەروەردگار لەوبارەوە دەفەرمویێ: ﴿**فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ فَلَا أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَاءَلُونَ ۞ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ۞ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُولَٰئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ فِي جَهَنَّمَ خَالِدُونَ**﴾(1)، واتە: کاتێك کە فوو بە کەڕەنا ( صور)دا کرا، ڕە چەڵەك (نسب) لە نێوانیاندا نامێنێو کەس لە هاواری کەس نایەت (دیارە بانگی یەکدی دەکەن بەلاَم بێسوودە) جا ئەوەی کردەوە باشەکانی قورس بن، ئەوە سەرفرازە، وە ئەوەی کردەوە باشەکانی سووك بن، ئەوانە کەسانێکن خۆیان دۆڕاندوە، وە لە دۆزەخدا بە هەمیشەیی دەمێننەوە. لێرەدا (موازین)، یان کۆی (میزان)ە، یان کۆ (موزون)ە، جا میزانە کە نازانین بە ندە خۆی دەخرێتە نێوی، یاخود کردەوەکانی، یان هەم خۆیو هەم کردەوەکانیشی بە هەمان شێوە، کەواتە ئیحتمالی هەرسێکیان هەیە.

هەروەها خوای دادگەر هەر لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿**وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَىٰ بِنَا حَاسِبِينَ**﴾(2)، واتە: وە تەرازووەکانی، دادگەری دادەنێین لە

1) ( المؤمنون 101-103 ).
2) ( الأنبياء- 47 ).

ڕۆژی قیامەتدا، هیچ کەسێك هیچ زوڵمی لـێ ناکرێ، ئەگەر بە ئەندازەی گرانایی دەنکە خەرتەلەیەکیش بێت هەر دەیهێنین (چاکە بێت یان خراپە) وە ئێمە بەسین بۆ سەرژمێریی (گوناهو چاکەکان)و لێپرسینەوە. هەروەها خوای کاربەجێ -سبحانه و تعالى- هەر لەوبارەوە فەرمویەتی: ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالأَخْسَرِينَ أَعْمَالاً ۝ الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَ هُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ۝ أُولَئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَلا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا﴾(الکهف 103-105)، واتە: (ئەی موحەمەد!) بڵێ: ئایا هەواڵتان بدەینێ کێ لە هەموو کەس زیاتر کردەوەکانی لە دەست دەداتو دەیا ندۆڕێنێ؟ ئەوانەی هەوڵو کۆششیان هەمووی لە پێناوی ژیانی دونیادا بزر بووەو پێشیان وایە شتی باش دەکەن، ئەوانە کەسانێکن کە بڕوایان بە ئایەتەکانی پەروەردگاریانو بە دیداری نیە، بۆیە کردەوە (چاکەکانیان هەڵوەشاوەتەوەو سەرەنجام لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا هیچ کێشو نرخیان بۆ دانانێین..

کەواتە: بەندەکان خۆشیان بە جۆرێك لە جۆرەکان دەکێشرێن، لە فەرموودەی پێغەمبەری خواش دا ﷺ هاتوە دەربارەی (عبدالله بن مسعود) خوا لـێی ڕازی بێ کە لاقەکانی زۆر باریك بوونو هەندێك لە هاوەڵان پێی پێکەنیون، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: قاچەکانی عبدالله لە ڕۆژی دوایی‌و لە تەرازووی خوادا لە کێوی ئوحود قورسترن[1].

1) (إِنَّهُ ليأتي الرجُلُ العظيم السَّمين يوم القيامة لا يزن عند الله جناح بعوضة، و قال: إقرؤا إنْ شئتم، ﴿فَلا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا﴾(الكهف-115)، رواه البخاري برقم :4729، ومسلم برقم (2785) عن أبي هريرة.

لەو بارەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژی قیامەت دا پیاوی وا دێ کە قەبەو قەڵەوە، بەڵام لە لای خوا هێندەی باڵە مێشوولەیەك قورس نیە، وە فەرمووی: ئەگەر حەز دەکەن ئەم مەبەستە لە قورئان دا ببینن- بخوێننەوە: (لە ڕۆژی دوایی دا کێشیان بۆ دانانێین...)،

## 9/ بەشـرانەوەی نـامـەو لـیسـتی کردەوان:

لیستەو نامەی کردەوان بە دەستی ڕاستو لە پێشەوەڕا، یان بەدە ستی چەپو لە پشتەوە ڕا بەسەر بەندەکاندا دابەش دەکرێن. خوای زاناو توا نا لەوبارەوە فەرمووویەتی: ﴿**يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لا تَخْفَى مِنكُمْ خَافِيَةٌ**﴾(1)، واتە: لەو ڕۆژەدا ڕادەنوێنرێن، هیچ شتێکتان پەنهان نیە ﴿**فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَا بَهُ بِيَمِينِهِ فَيَقُولُ هَاؤُمُ اقْرَؤُوا كِتَابِيهْ**﴾ جا کەسێك بە دەستی ڕا ستی نا مەی کردەوەکانی وەربگرێتەوە دەڵێ: ها وەرن نامەکەم بخوێننەوە ﴿**إِنِّي ظَنَ نتُ أَنِّي مُلاقٍ حِسَابِيهْ**﴾ من یەقینم هەبوو کە تووشی لێپرسینەوەی خۆم د یێم (بۆیە خۆم بۆ ئامادە کردبوو) ﴿**فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ**﴾ جا ئەو کەسە لە ژیانێکی پڕ ڕەزامەندیی دایە (خوا لێی ڕازییە وە ئەویش بەم بەشەی خۆی زۆر دڵخۆشو رازییە).

ئنجا ئەو کەسەش کە نامەکەی بەدەستی چەپی وەردەگرێ تەوە حاڵی ئاوایە: (**وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِشِمَالِهِ فَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَابِيهْ ۞ وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيهْ**)(2) وە ئەو کەسەی کە نامەی کردەوەکانی بە دەستی چەپی وەربگرێتەوە، دەڵێ: خۆزگە هەرگیز ئەم نامەیەمم وەرنەگرتبایەوە، خۆزگە هەر نەمزانیبایە کە لێپرسینەوەم چۆنە! ﴿**يَا لَيْتَهَا كَانَتِ الْقَاضِيَةَ**﴾ بریا کە دەمردم یەکجاریی بووایەو هەر زیندوو نەکرابامایەوە، (بەڵام بێگو مان درەختی خۆزگەو بریا، بەری بۆ کەس نەگرتوە) ئاشکراشە کە ئەو کە سەی بەدەستی ڕاست یاخود لە پێشەوەڕا نامەکەی وەربگرێتەوە، زۆر دڵخۆ شە،

1) (الحاقة 24-26).
2) (الأنشقاق 7-9).

وەك خوای بەبەزەیی دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ ۞ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ۞ وَيَنقَلِبُ إِلَى أَهْلِهِ مَسْرُورًا﴾ واتە: وە ئەو كەسەی كەبە ڕاستەی نامەی كردەوەكانی وەربگرێتەوە، لێپرسینەوەیەكی ئاسانو سووكی لەگەڵدا دەكرێ، وە بە دڵخۆشییەوە دەگەڕێتەوە بۆلای خزمو كەسوكاری.

بەڵام ئەو كەسەی كە بە چەپە یان لە پشتەوەڕا نامەكەی وەربگرێتەوە ئەوە بەشی هەر حەسرەتو خەفەتو پەژارەیە: ﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ وَرَاءَ ظَهْرِهِ ۞ فَسَوْفَ يَدْعُو ثُبُورًا ۞ وَيَصْلَى سَعِيرًا﴾[1]، واتە: بەڵام هەركەسێك كە نامەكەی لە پاش پشتییەوە وەربگرێتەوە ئەوە بە مردن خۆزگە دەخوازێو لە ئاگری بڵێسەداردا دەبرژێنرێ.



1) ( الأنشقاق 10-12 ).

## 10/ بەرەو دۆزەخ بە ڕێکرانی کـافرو خراپەکاران:

ئنجا دوای ئەوەی لێپرسینەوەو کێشرانو ئەنجام وەرگرتنەوەو پەرێز دەرکەوتن تەواوبوون، ئەوانەی کە کافرو هاوبەش دانەر بوونو ئەهلی ئیسلامو ئەهلی قیبلە نەبوون، تێکڕا یەکسەر بەرەو دۆزەخ بەڕێ دەکرێن.

زۆر کەس وادەزانێ کە هەموو کەس بەسەر پردی سەرپەر شتی دۆزەخ (صراط)دا دەڕوات، نەخێر هەموو کەس بەسەر (پرد)دا ناڕوات، بەڵکو تەنیا مسوڵمانانو ئەوانەی ئەهلی ئیسلامو قیبلەن، بەسەریدا ڕەت دەبنو دەڕۆن، ئەوەش ڕای بەهێزتری زانایانە، بەڵکو من پێم وایە کە هەر ئەو ڕایە ڕاستە، چونکە دەقەکانی سوننەت وا دەگەیەنن کە سەرجەم ئەوانەی کافرو بێ دینن‌و ئەهلی ئیسلام نین، ئەگەر بە ڕواڵەتیش بێ وەك مونافیقەکان ئەوانە هەرکات ئەنجامیان وەرگرتەوە، یەکسەر بەرەو دۆزەخ بەڕێ دەکرێن.

بۆ وێنە: با سەرنجی ئەم فەرموودەیە بدەین کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (**اذا كان يوم القيامة أذّنَ مؤذِّنٌ: لَتَتّبِعْ كلَّ أُمةٍ ما كانت تَعبدُ، فلا يبقى أحدٌ كان يعبد غيرالله سبحانه من الأ صنام والأنصاب الاّ يتساقطون في النار حتى اذا لم يبق الاّ من كان يعبد الله من بَرّ و فاجِرٍ و غُبَّرِ أهل الكتاب، فيدعى اليهود فيقال لهم: ماكنتم تعبدون؟ قالوا كنّا نَعْبدُ عُزيراً إبن الله، فيقال لهم: كذبتم ما اتّخذ الله من صاحبةٍ ولا ولدٍ فماذا تَبغون؟ قالوا عَطشنا يا ربنا فاسقِنا فَيُشارُ اليهم: ألا تردون؟ فَيُحشرون الى النار كأنها سرابٌ يَحْطم بَعْضها بَعْضاً فَيَتساقطون في النار، ثم يدعى النصارى، فيقال لهم: ماكنتم تعبدون؟ قالوا: كنّا نعبد المسيح ابن الله: فيقال لهم: كذبتم، مااتخذالله من صاحبةٍ ولا ولد، فيقال لهم: ماذا تبغون؟ فيقولون: عَطشنا يا ربّنا فاسقنا، قال: فيشارُ اليهم: ألا تَرِدون؟**

**فيحشرون الى جهنم كأنها سرابٌ يحطم بعضها بعضاً فيتساقطون في النار....)**[1]، واتە: ڕۆژی قیامەت بانگ کەرێك بانگ دەکات، (دوای ئەوەی کە ئەنجام وەرگیرایەوە، دەڵێ) هەر کۆمەڵێك چ شتێکی پەرستوە (جگە لە خوا) با ئێستا بە دوای بکەوێ (جا هەر طاغووت و پەرستراوێك پێش کۆمەڵەی خۆی دەکەوێ‌و هەر سەرکردەیەکی ڕژێم‌و حیزبێکی کافر پێش ڕژێم‌و حیزب‌و پێڕی خۆی دەکەوێ بەرەو دۆزەخ) وە سەرەنجام هەموو ئەوانەی غەیری خوا یان - سبحانه وتعالى- پەرستوە لە بتەکان‌و پەیکەرەکان، بەسەریەکدا دەکەونە ئاگرەوەو یەکیان نامێنێ کە نەکەوێتە نێوی، هەتا تەنیا ئەوانە دەمێننەوە کە خوایان پەرستوە چ چاکەکار بوون چ گوناهبار (واتە: چ ئەهلی طاعەت بن‌و نەچنە دۆزەخ، بەڵکو یەکسەر بچنە بەهەشت، وەچ گوناهبار بن‌و شایستەی چوونە دۆزەخ بن‌و دوای پاك بوونەوە بچنە بەهەشت)، وە پاشماوەکانی ئەهلی کتێبیش جا سەرەتا جوولەکە بانگ دەکرێن، پێیان دەگوترێ چیتان دەپەرست؟ دەڵێن: (عوزەیری کوڕی خوا) مان دەپەرست، پێیان دەگوترێ: درۆ دەکەن، خوا نە هاوسەری هەبووەو نە ڕۆڵەی هەبووە، (ئنجا پێیان دەگوترێ) ئەدی ئێستا چیتان دەوێ؟ دەڵێن: پەروەردگارمان زۆر مان تینووە ئاو مان بدە یە، ئاماژەیان بۆ لای دۆزەخ بۆ دەکرێ‌و دەگوترێ: ناچنە نێوی؟ پاشان بەرەو دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێن، دۆزەخیش وەك تراویلکە (سراب) دەچێ، (پێیان وایە ئاوە لە دوورەوە، بەڵام دۆزەخە) کە لەنێو خۆیدا یەکدی تێك دەشکێنێ، ئیدی دەکەونە نێو دۆزەخەوە، پاش ئەوانیش نەصرانییەکان بانگ دەکرێن، ئەوانیش بەهەمان شێوە پرسیاریان لێ دەکرێ کە چیتان پەرستوە؟ دەڵێن:

---

1- رواه مسلم عن أبي سعيد الخدري، برقم: 302.

(عیسای کوڕی خوا) پێیان دەگوترێ: درۆ دەکەن، خوا نە هاوسەری هەبووەو نە کوڕی هەبووە، ئنجا پێیان دەگوترێ: ئەدی چیتان دەوێ؟ دەڵێن تینوومانەو پەروەردگارمان ئاومان بدەیە، دەڵێ: بەهەمان شێوە تراویلکە (سراب)ێکیان نیشان دەدرێو دەگوترێ: ناچن بخۆنەوە؟ جا بەرەو دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێن کە لەنێو خۆیدا یەکدی تێك دەشکێنێو بەسەریەکدا دەکەونە نێوی.

چۆنیەتی بەرێکرانو ڕەپێچەك درانی کافرەکانیش بەرەو دۆزەخ بە هەموو شێوەکانیانەوە بەم شێوەیەیە: خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَنَسُوقُ الْمُجْرِمِينَ إِلَى جَهَنَّمَ وِرْدًا﴾[1]، واتە: وە تاوانبارەکان بەرەو دۆزەخ لێ دەخوڕین بە تینوێتی.

هەروەها هەر لەوبارەوە خوای بێوێنە دەفەرموێ: ﴿وَسِيقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى جَهَنَّمَ زُمَرًا حَتَّى إِذَا جَاؤُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِ رَبِّكُمْ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَاء يَوْمِكُمْ هَذَا قَالُوا بَلَى وَلَكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ الْعَذَابِ عَلَى الْكَافِرِينَ ۞ قِيلَ ادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا فَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ﴾[2]، واتە: وە ئەوانەی بێبڕوابوون دەستە دەستە بەرەو دۆزەخ بەرێ کران، تا کاتێك دەگەنە لای دۆزەخ، یەکسەر کتوپڕ دەرگاکانی دۆزەخ بەڕوویاندا دەکرێتەوە، وە دەرگاوانەکانی دۆزەخ پێیان دەڵێن: ئەدی لە خۆتان چەند پێغەمبەرێك نەهاتن بۆ لاتانو ئایەتەکانی پەروەردگاریان بەسەرتاندا نەخوێندەوە، لە دیداری ئەمڕۆتان نەیان ترساندن؟! دەڵێن: با، بەڵام بڕیاری سزاو ئەشکەنجەدان بەسەر کافرەکاندا چەسپیوە. پێیان گوترا: دەبچنە نێو دەرگاکانی دۆزەخەوە، بە هەمیشەیی تێیدا بن، دۆزەخ خراپترین شوێنە بۆ خۆ بەزلگران.

1) ( مريم- 86 ).
2) ( الزمر 71-72 ).

## 11/ تێر ئاو بوونی ئیماندارانی چاکەکار لە حەوزی کەوسەری پێغەمبەر ﷺ:

ئنجا دوای ئەوەی کە باسمان کرد، ئەهلی ئیسلام بەرەو ئاو خوارد نەوە لە حەوزی (کوثر) بەرێ دەکرێن‌و بە ڕای زۆربەی زانایان، حەوزی کەوسەر، لەمبەرەی پردی سەرپەرشتی دۆزەخ ( صراط)ەو هەندێکیشیان دەڵێن: لەوبەرەوەیە، بەڵام من ئەم ڕایەی دووەمم پێ لاوازە، وە ئەوەندەی من لێم کۆڵیوەتەوە فەرموودەکان وا پیشان دەدەن کە حەوزی کەوسەر لەمبەر بێت، واتە: پێش ئەوە بپەڕینەوە بەسەر پشتی دۆزەخدا ئەوەی شایستەبێ لە حەوزی کەوسەر ئاو دەخواتەوە، ئەم فەرموودەیەش ئەوە دەگەیەنێ: **(عن أنس قال: بينما نحن عند رسول الله ﷺ اذْ أغفى إغفائة ثم رفع رأسَهُ مُتَبسِّماً فَقُلْنا: ما أَضْحَكَك يا رسول الله؟ قال: نزَلَتْ عليّ آنفاً سورة فقرأ: (بسم الله الرحمن الرحيم ﴿إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ ﴾ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ ﴾ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ ﴾ ثم قال: أتدرون ما الكوثر؟! قلنا الله ورسوله أعلم، قال: فأُنه نَهَرٌ وعَدنيهِ ربّي عزّوجلّ- عليه خَيْرٌ كثيرٌ، هو حَوضٌ تَرِدُ عليه امتي يوم القيامة آنيَتُهُ عَدَدُ نجومِ السماء، فَيُخْتَلَجُ عَبْدٌ مِنهُ، فأقول: إنَّه مِن أمَّتي، فيُقال: إنَّك لاتدري ما أَحْدَثَ بَعْدَك!)**[1]، واتە: ئەنەس خوای لێ ڕازی بێ دەڵێ: ڕۆژێ ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین، کەمێك خەوت دوایی هەڵسا، سەری بەرزکردەوەو زەردەخەنەیەکی هاتێ، گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا بە چ پێدەکەنی؟! فەرمووی: ئێستا سوورەتێکم بۆ هاتەخوارو سوورەتی (الکوثر)ی خوێندەوە، کە دەفەرموێ: ( بەناوی

1) رواه مسلم، بڕوانە تفسیر القرطبـي، بەرگی 10 لاپەڕە(5573 ـ 5574).

خوای بەبەزەیی بەخشندە* ئێمە بە تۆمان بەخشیوە کەوسەر* نوێژ بۆ پەروەردگارت بکەو قوربانی هەر بۆ ئەو سەر ببڕە* بێگومان ئەو کەسەی رقی لە تۆیە دوا بڕاوو بێ خێرە. دوایی فەرمووی: دەزانن (کەوسەر) چییە گوتمان: خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: ڕووبارێکە پەروەردگاری بەرزومەزنم موژدەی پێ داوم، خێرو نیعمەتێکی زۆری تێدایە، حەوزێکە لە ڕۆژی قیامەتدا ئوممەتی من دەچنە سەری و لێی دەخۆنەوە، ئەو قاپ و پەرداخانەی کە لەسەرینی (بۆ پێ خواردنەوەی ئیمانداران) بە ئەندازەی ئەستێرەکانی ئاسمانن، بەندە یەك دە یەوێ لێی بخواتەوە بەڵام دوور دەخرێتەوەو ناهێڵرێ، منیش دەڵێم: ئەوەش لە ئوممەتی منە! پێم دەگوترێ: تۆ نازانی کە لە دوای تۆ چی کردوە، (واتە: نازانی کە دوای تۆ ڕێ وشوێنی تۆی بەرداوەو شایستەی ئەوە نیە کە لەم حەوزە بخواتەوە، بەڵێ ئوممەتی تۆیە، بەڵام ئەوەندە گوناهبارو تاوانبارە، شایستەی ئەوە نیە کە لێی بخواتەوە، دەشگونجێ ئەوانە موونافیقەکان بن کە بە ڕواڵەت ئوممەتی پێغەمبەرن، بەڵام ئیمانیان نەبووەو شایستە نین کە لێی بخۆنەوە).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ هەر لەوبارەوە فەرموویەتی: **(الكوثر نَهر في الجنة حافتاه من ذَهَبٍ وَمَجْراه على الدُّرِّ والياقوت تربتهُ أطيب مِن المِسكِ وماؤه أحلى من العسل وأبيض من الثَّلج)**[1]، واتە: کەوسەر ڕووبارێکە لە بەهەشت، کە قەراغەکانی لە زێڕ دروست کراون و ئەو شوێنەی کە تێ شیدا دێت ودەچێ گەوهەرو مروارییە،و گڵەکەشی بۆنی لە بۆنی میسك خۆشترە، وە ئاوەکەی لە هەنگوین شیرینترە، وە لە بەفریش سپی ترە.

---

1) رواه الترمذي عن ابن عمر، وقال القرطبي: حديث حسن صحيح، بڕوانە بەرگی10 ل(5573).

هەروەها هەر لەبارەی حەوزی کەوسەرەوە فەرموویەتی: **(حوضي مَسيرَةُ شهرٍ وزواياه سواءٌ وماؤه أبيضُ من الورق و ريحُهُ أطيب من المسك و كيزانه كنجوم السماء فمن شرب منه فلا يظمأ بعده أبداً)**[1]، واتە: حەوزەکەم پانتایی‌یەکەی مانگە ڕێیەکەو گۆشەکانی یەکسانن، وە ئاوەکەی لە زیو سپی ترەو بۆنەکەی لە میسك خۆشترەو پەرداخەکانی وەك ئەستێرەی ئاسمانن‌و هەرکەسێك لێی بخواتەوە هەرگیز دوای ئەوە تینووی نابێتەوە.



1) رواه البخاري برقم: 6579، ومسلم برقم: 2292، عن عبدالله بن عمر وبن العاص رضي الله عنه

## 12/ بەرِێ کەوتنی ئەهلی ئیسلام بەرەو بەهەشت و پەرِینەوەی ئیماندارانی چاکەکار لە (صراط)و بە جێمان و کەوتنە ناو دۆزەخی مونافیقان و گوناهباران:

خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿**وَإِن مِّنكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ۞ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا**﴾[1]، واتە: هیچ کەس لە ئێوە نیە کە نەچێتە سەرانسەری دۆزەخ، ئەوە بڕیارێکی پەروەردگارتە کە دەبێ هەر جێبەجێ بێ، پاشان ئەوانەی پارێزیان کردوە رزگاریان دەکەین (و بەسەر پردەکەدا دەیانپەڕێنینەوە) وە ئەوانەش کە ستەمکارن (چ کافربن، چ مونافیق بن، چ مسولمانی گوناهبار بن) ئەوانە لەپەڕوو لەسەر ئەژنۆیان دەکەون و لە دۆزەخدا بە جێیان دەهێڵین. شایانی باسیشە وشەی (ورود) کەلە (وَرَدَ)ەوە هاتوە بەمانای چوونە ناو نایەت، وەك هەندێك لە زانایان گومانیان بردوە، بەڵکو بە مانای چوونە نزیك و سەرانسوێ کردن دێ، یان بەسەردا رەت بوون، وەك لێرەدا ئەوە مەبەستە، بەڵگەشمان ئەوەیە کە خوای پەروەردگار لەبارەی مووساوە -علیه الصلاة والسلام- فەرموویەتی: ﴿**وَلَمَّا وَرَدَ مَاء مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ النَّاسِ يَسْقُونَ**﴾(القصص-23). دەجا هیچ گومانی تێدا نیە کە مووسا نەچۆتە نێو حەوزو ئاوەکەی مەدیەنەوە! بەڵکو چۆتە سەرسوێ و قەراغی!.

ئەم سێ ئایەتەش باسی حاڵی مونافیقەکان و ئیمانداران دەکەن: ﴿**يَوْمَ تَرَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ يَسْعَى نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِم بُشْرَاكُمُ الْيَوْمَ**

1) ( مريم 71-72 ).

جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ۞ يَوْمَ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ لِلَّذِينَ آمَنُوا انظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ارْجِعُوا وَرَاءكُمْ فَالْتَمِسُوا نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُ بَابٌ بَاطِنُهُ فِيهِ الرَّحْمَةُ وَظَاهِرُهُ مِن قِبَلِهِ الْعَذَابُ ۞ يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ قَالُوا بَلَى وَلَكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَارْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ الْأَمَانِيُّ حَتَّى جَاء أَمْرُ اللَّهِ وَغَرَّكُم بِاللَّهِ الْغَرُورُ ۞ فَالْيَوْمَ لا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلا مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مَأْوَاكُمُ النَّارُ هِيَ مَوْلاكُمْ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾[1]، واتە: ئەو ڕۆژە کە بڕوادارانی پیاوو ئافرەت دەبینی ﴿کە بەرەو (صراط) دەڕۆن﴾ لە پێشیانەوە، وە بە دەستی ڕاستیان ڕۆشنایی هەیە (ڕۆشنایی یەکەیان لە پێشیانەوە دەڕوات‌و بە دەستی ڕاستیانەوەیە، جا تویژەرەوانی قورئان دەڵێن: مەبەست لە پێشیانەوە، ئەوەیە کە نێو چاوانیان ئەو شوێنەی سەجدەیان پێ بردوە وەك چرا دەئایسێ‌و بەردەمیان ڕووناك دەکاتەوەو مەبەست لە دەستی ڕاستیشیان ئەوەیە کە پەنجەی شایەتمانیان تیشك دەدات‌و ڕووناکی دەبەخشێتەوە).

(پێیان دەگوترێ:) موژدەتان لێ بێ، ئەمڕۆ دەچنە نێو ئەو باخانەی کە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە، ئا ئەوە یە سەرکەوتن‌و ڕزگاربوون‌و بە مراد گەیشتنی مەزن.

(پاشان دەربارەی مونافیقەکانی پیاوو ئافرەت دەفەرموێ:) ئەو ڕۆژەی کە پیاوان‌و ئافرەتانی مونافیق بە وانەی ئیمانیان هێناوە دەڵێن: کەمێك چاوەڕێمان بکەن لە ڕووناکی ئێوە وەربگرین (چونکە ئەو ڕۆژە کە بەرێ دەکەون بەرەو (صراط) دەگەن بە شوێنێك کە دەبێت بە تاریکایی، هیچ

1) ( الحديد 12-15 ).

کەسێك ڕووناکی کەسی دە فریا نایەت، مەگەر کەسێك کە خۆی ڕووناکی هەبێت، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتوە، بۆیە موونافیقەکان پێ یان وایە کە قیامەتیش هەروەك دونیا وایە لەژێر باڵی مسوڵماناندا بحەوێنەوە، لەبەرئەوە دەڵێن: تۆزێك چاوەڕێمان بکەن تا لە ڕووناکی ئێوە سوود ببینین‌و شتێك لەو ڕووناکییەتان وەربگرین) پێیان گوترا: بچنەوە بۆ دواوە، لەوێ ڕووناکییەکە وەربگرن، (کە مەبەستیان پێ گۆڕە پانی لێپر سینەوەو دابەشکرانی نامەی کردەوەکانە، یاخود مەبەستیان پێ دونیایە، واتە: ئێمە وەك (ئیماندار) ئەو ڕووناکییەمان بەهۆی ئیمان‌و کردەوە چاکەکانی دونیاوە بەدەست هێناوە، بۆیە بە گاڵتەوە پێیان دەڵێن: بگەڕێنەوە بۆ دونیا، وەك چۆن موونافیق‌و دەغەڵەکان لە دونیادا گاڵتەیان بە ئیمانداران کردوە کە کافر بوون‌و خۆیان بە مسوڵمان‌و ئیماندار نیشان داوە، ئاوا دووبارە ئیمانداران لەو ڕۆژە سەخت‌و دژوارەدا گاڵتەیان پێ دەکەنەوە!).

(دوایی خوای پەروەردگار دەفەرموێ): جا دیوارێکیان لە نێواندا دەکرێ کە دەرگایەکی هەیە، دەرگاکە دیوی ژوورەوەی ڕەحمەتە (کە لای ئیماندارانە) دیوی دەرەوەشی ئەشکەنجەو ئازارە (کە لای موونافیقەکانە) جا لە دەرەوەڕا موونافیقەکان بانگی ئیمانداران دەکەن‌و دەڵێن: ئەدی ئێمەش لەگەڵ ئێوە نەبووین؟! ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ، بەڵام ئێوە بۆ خۆتان خۆتان تووشی ئەم وەزعە تاڵە کرد، ئێوە چاوەڕوانی لەنێوچوونی ئێمەتان دەکرد لە دونیادا، وە ئێوە هەمیشە لە دوودڵیدا بوون‌و بە خۆزگەو بریا خۆتان فریو دەدا، تا فەرمانی خوا هات، ئێوە هەر لە فریو خواردندا بوون بە قسەی شەیطان، ئەمڕۆش هیچ فیدیەو بارمتەیەکتان لێ وەرناگیرێ، وە لە کافرەکانیش هەر وەرناگیرێ، تەنیا ئاگر جێگاو دۆستی ئێوەیەو خراپترین سەرەنجامیش ئاگرە!

دەربارەی ئەو پرد (جسر)ەش کە (صراط)ی پێ دەگوترێ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **(ثم يُؤْتى بالجسر فَيُجْعَلُ بين ظهري جَهَنَّم، قلنا: يا رسول الله وما الجسر؟ قال: مَدْحَضَة مَزَلَّة عليه خطاطيف وكلاليبٌ وحَسَكَةٌ مَفَلْطَحَةٌ لها شوكة عُقَيفاء تكون بِنَجدٍ، يُقالُ لها: السَّعدان، يَمُرُّ المؤمنون عليه كالطَّرف وكالبَرقِ وكالريِّح وكأجاويد الخَيلِ و الرِّكاب فَناجٍ مُسَلَّمٌ وناجٍ مَخدوشٌ ومَكدوسٌ في نار جهنّم حتي يَمُرُّ آخِرهم يُسحَبُ سَحباً)**[1]، واتە: پاشان پرد بەسەر پشتی دۆزەخ ڕادەهێلرێ، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا پرد چییە؟ فەرمووی: ڕێیەکی زۆر خلیسکە، لووسە، قولاپ و دڕکی پان ڕاخراوی پێوەن، دڕکێکی پێوەیە سەری بە قولاپە کە لە (نەجد) دەبێ و (سەعدان)ی پێ دەگوترێ، جا بڕواداران بەسەریدا تێدە پەڕن، هەندێکیان وەك ئەندازەی خێرایی چاو تێدەپەڕن، وە هەندێکیان وەك خێرایی تیشك، وە هەندێکیان وەك بایەکی بەهێز، وە هەندێکیان وەك ئەسپانی باش و خێرا، وە هەندێکیان وەك سواری وڵاخی باربەر، جا هەیانە ڕزگاری دەبێ و سەلامەتە، وە هەیانە ڕزگاری دەبێت بەڵام دەڕوو شێو بریندار دەبێ، هەشیانە سەرەو بن دەکەوێتە نێو دۆزەخەوە، هەتا ئەوەی کە لە کۆتایی هەمووان دادێت بە ڕاکێشران ڕای دەکێشن (واتە: وردە وردە هەر چۆنێك بێت ئەویش ڕزگاری دەبێ و بەسەریدا دەپەڕێتەوە).

---

1) متفق عليه عن ابی سعيد الخدری، بڕوانە معارج القبول، بەرگی(2)، لاپەڕە(853-854)، البخاري برقم: 7439 واللفظ له، ومسلم برقم: 195.

## 13/ نیشتەجێبوونی ئیمانداران لە بەهەشتداو کافرو خراپەکارانیش لە دۆزەخدا:

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ نَحْشُرُ الْمُتَّقِينَ إِلَى الرَّحْمَنِ وَفْدًا﴾(1)، واتە: ئەو ڕۆژەی پارێزکاران بەرێ دەکەین بەرەو (دیداری) خوای بەبەزەیی (بەرەو پاداشتو بەهەشتی خوا) وەك نوێنەر (وەفد) (واتە: بەڕێزو حورمەتو پێشوازییەوە)، بەڵێ: ئیمانداران وەك نوێنەر بەرەو بەهەشت بەرێ دەكرێن، بەڵام لەبارەی چۆنیەتی بەڕێكرانی كافرانەوە بەرەو دۆزەخ، خوای دادگەر ڕایگەیاندوە، كە وەك ماڵاتو ئاژەڵانی تینو لێی دەخوڕرێن بەرەو دۆزەخ، وەك دەفەرموێ: ﴿وَنَسُوقُ الْمُجْرِمِينَ إِلَى جَهَنَّمَ وِرْدًا﴾(2)، واتە: وە كافرەكان بە تینوێتی بەرەو دۆزەخ بەرێ دەكرێن.



1) ( مريم- 80 ).
2) ( ال عمران- 133 ).

## کورتەیەك دەربارەی بەهەشـــت و دۆزەخ

ئەم بابەتە زۆر بە کورتیو گوشراویی لە پێنج کورتەباساندا دەخەینە ڕوو، لەو ڕووەوە کە پەیوەندی بە ئیمانو عەقیدەی ئیسلامییەوە هەیە:

### 1) هەرکـام لە بەهەشتو دۆزەخ ئێسـتاکە هەن:

ئەوە عەقیدەی ئەهلی سوننەتە، یان بەلای کەمەوە: عەقیدەی زۆر بەی هەرەزۆری زانایانی ئەهلی سوننەتە، کە ئێستا بەهەشت هەیەو دۆزەخیش هەیە، وە چەندان ئایەتو فەرموودە لەوبارەوە هەن، بۆ وێنە: خوای زا ناو توانا -سبحانه وتعالى- لەبارەی بەهەشتەوە فەرموویەتی: ﴿**وَسَارِعُواْ إِلَى مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ**﴾[1]، واتە: وە خێرایی بکەن بەرەو لێبوردنێك لە پەروەردگارتانەوە. وە بەرەو بەهەشتێك کە پانایی‌یە کەی بە ئەندازەی ئاسمانەکانو زەوییەو بۆ پارێزکاران ئامادەکراوە. دەربارەی دۆزەخیش، فەرموو یەتی: ﴿**إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا**﴾[2]، واتە: بێگومان دۆزەخ خۆی مەڵاس داوەو لە کەمین دایە. وە هەر دەربارەی دۆزەخ دەفەرمویّ: ﴿**أُعِدَّتْ للكافرين**﴾[3]، واتە: دۆزەخ بۆ کافرەکان ئامادەکراوەو چاوەڕێیان دەکات.

---

1) ( مريم- 81 ).
2) ( النبا‌ء- 21 ).
3) ( البقرة- 24 ).

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: **(إطَّلَعْتُ على الجنة فرأيْتُ أكثر أهلها الفقراءَ واطَّلَعتُ على النار فرأيتُ أكثر أهلها النساءَ)**[1]، واتە: بەهەشتم نیشان درا، سەیرم کرد زۆربەی خەڵکەکەی هەژارەکانن، وە دۆزەخیشم نیشان درا سەیرم کرد زۆربەی خەڵکەکەی ئافرەتانن.

## 2) بەهەشت لە سەرووی ئاسمانەوە یە، بەڵام دۆزەخ، زیاتری زانایان ئەوەیە کە بۆ ئێمە شوێنی دیار نیە:

بۆ بەهەشت خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: **﴿وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى ۞ عِندَ سِدْرَةِ الْمُنتَهَى ۞ عِندَهَا جَنَّةُ الْمَأْوَى﴾**[2]، واتە: پێغەمبەر ﷺ جارێکی دیکە (جبریل)ی بینیوە، لەلای درەختی کۆتایی (سدرة المنتهى) کە لە لای ئەو درەختەیە بەهەشتی شوێنی حەسانەوە، کەواتە: بەهەشت لە دەوروبەری سنوورەکانی ئاسمانو زەوییەو لە لای درەختی کۆتایی ( سدرة المنتهى)یە.

بەڵام بۆ دۆزەخ، هەندێك دەڵێن: لە ژێر زەوی خواری خوارەوە یە. هەندێکیش دەڵێن: شوێنی دیار نیەو نازانینو واباشترە شوێنی بۆ دیاری نەکەین، واش پێدەچێ ئەم ڕایەی دووەمە پەسەندتر بێت مادام دەقێکی ڕوونو ئاشکرا لەوبارەوە نیە.

---

1) رواه البخاري ومسلم عن عمران بن الحصين، البخاري برقم: 3241 واللفظ له، ومسلم برقم: 2737.

2) ( النجم 13-15 ).

## 3) دۆزەخ حەوت دەرگای هەیەو بەهەشت هەشت دەرگای هەیە:

خوای -عزّوجلّ- بۆ دۆزەخ فەرمویەتی: ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ ۞ لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَابٍ لِّكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ﴾(1)، واتە: دۆزەخ شوێنی بەڵێن پێدراوی بێبڕوایانە، کە لەوێدا هەموویان کۆدەکرێنەوە، حەوت دەرگای هەیە، بۆ هەر دەرگایەك بەشێکی دیاریکراوەی بۆ دانراوە کە لێیەوە بچنە ژوورێ.

بۆ بەهەشتیش کە هەشت دەرگای هەیە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **(في الجنة ثمانية أبواب باب منها يُسمَّى الريّان لايدخله الا الصائمون)**(2)، واتە: بەهەشت هەشت دەرگای هەیە، یەکێك لە دەرگاکانی پێی دەگوترێ (الريّان) تەنیا ئەوانەی بەڕۆژوو بوون لەو دەرگایەوە دەچنە نێو بەهەشت.

## 4) دۆزەخ لێی ناخۆشتر نیەو بەهەشتیش لێی خۆشتر نیە:

لەبارەی دۆزەخەوە خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿وَأَصْحَابُ الشِّمَالِ مَا أَصْحَابُ الشِّمَالِ ۞ فِي سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ۞ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ۞ لاَّ بَارِدٍ وَلا كَرِيمٍ﴾(3)، واتە: هاوەڵانی دەستە چەپ، دەزانی هاوەڵانی دەستە چەپ کێن؟ لەنێو گڕە بایەکی زۆر گەرمو سووتێنەر دان، وە لەنێو ئاوی کوڵیوو داغ دان، لەژێر سێبەرێکی دووکەڵاویی زۆر سەخت، ئەو دۆزەخە نە فێنکایەتی تێدایەو نە ڕێزو حورمەتی تێدایە.

---

1) ( الحجر 43-44 ).
2) رواه البخاري ومسلم عن سهل بن سعد رضي الله عنه.
3) ( الواقعة 41-44 ).

باسی خۆشی بەهەشتیش ئەوەندە بەسە کە پێغەمبەر ﷺ لە خوای بەخشەر دەگێڕێتەوە، واتە لە فەرموودەی (قد سي)دا خوای بە بەزەیی فەرموویەتی: (**أعدَدت لعبادي ما لا عين رأتْ، ولا أُذنٌ سَمِعَتْ، ولا خَطَرَ عل قَلبِ بَشَرٍ فاقرأوا إنْ شئتم**)[1]: ﴿**فَلا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاء بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ**﴾[2]، واتە: بۆ بەندەکانی خۆم جێگا یەکم ئامادە کردوە، کە نە هیچ چاوێك بینیو یەتی و نە هیچ گوێ یەك بیستوویەتی و نە بە خەیاڵی هیچ کەسیشدا هاتوە، حەزیش دە کەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە: هیچ کەسێك نازانێ چی بۆ پەنهان کراوە لەوەی کە پێی شادمان دەبێ، لە پاداشتی ئەوەدا کە دەیانکرد.

**5) گەورەترین سزاو مەینەت بۆ دۆزەخییەکان بێبەشبوونیانە لە دیداری خواو گەورەترین نیعمەتی بەهەشتیش بۆ بەهەشتیەکان شادبوونیانە بە دیداری خواو دیتنی ڕووی بێ وێنەی (سبحانه وتعالى):.**

دەربارەی دۆزەخی یەکان ئەم دوو ئایەتە ئەوە دەگەیەنن: (**كَلاَّ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ۞ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُو الْجَحِيمِ**﴾[3]، واتە: نەخێر، ئەو بێبڕوایانە لە ڕۆژی دواییدا لە دیداری پەروەردگاریان بێ بەش دە بن و

1) رواه البخاري ومسلم عن ابي هريرة -رضي الله عنه- البخاري برقم: 3244 والل فظ له، ومسلم برقم: 2824 .
2) ( السجدة- 17 ).
3) ( المطففين 15- 16 ).

پەردەپۆش دەکرێن، کەواتە: چوونە دۆزەخەکەیان سووکترە لە بێبەشبوونیان لە دیداری پەروەردگار -عزّوجلّ-.

دەربارەی ئیماندارانیش دەفەرمویّ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ۞ إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾[1]، واتە: چەند ڕوویەك لە ڕۆژی قیامەتدا گە شاوەن، تەما شای پەروەردگاریان دەکەن

پێغەمبەریش ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: (**إذا دخَلَ أهل الجنَّة الجنَّة، قال: يقولُ الله تبارك وتعالى: تريدون شيئاً أزيدكم؟ فيقولون: ألم تُبيّضْ وجوهنا؟! ألَم تُدخِلنا الجنّة وَتُنَجِّنا من النار؟ قال: فَيَكشفُ الحجابَ، فما أعطوا شيئاً أحبَّ اليهم من النظر الى ربّهم عزّوجلّ**) وفي رواية: ثم تلا هذه الآية: ﴿**لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ**﴾(يونس-26)، واتە: دوای ئەوەی بەهەشتییەکان چوونە بەهەشتو نیشتەجێ بوون، خوای پایەبەرز قسەیان لەگەڵدا دەکاتو دەفەرموێ: چی دیکەتان دەوێ بۆتان زیاد بکەم؟! دەڵێن: ئەدی ڕوومانت گەشو جوان نەکردەوە؟ ئەدی نەتخستووینە بەهەشتەوەو لە ئاگر دەربازت نەکردووین؟! (چیدیکەمان بویّ؟!). ئنجا (خوا) پەردە لادەدات، (جا کە خوای بەرزو بێوێنە دەبینن) دەزانن کە هیچ شتێکیان نەدراوەتێ لەلایان خۆشەویست تربێ لە تەماشاکردنی پەروەردگاریان -عزّوجلّ-.

بێگومان دیتنی خوای پەروەردگاریش لە بەهەشتدا بە چاوی سەر، یەکێکە لە تایبەتمەندیی‌یەکانی عەقیدەی ئەهلی سوننەت، بەڵام زۆرێك لە پێڕەو تاقمە لادەرەکان بڕوایان پێی نیە.

سبحان ربك رب العزة عمَا يصفون وسلام على المرسلين والحمدلله ربّ العالمين.

---

1) رواه مسلم والترمذي عن صهيب الرومي -رضي الله عنه- برقم: 297 ـ (181).




ئەم بەندە لە دوو خاڵی سەرەكی پێكدێ:

خاڵی یەكەم: حەوت كورتە باس دەگرێتە خۆی كە چەند لایەنێكی جیا جیای بابەتی قەزاو قەدەر ڕوون دەكەنەوە.

خاڵی دووەم: پێنج كورتە باسی گرتوونە خۆی كە هەندێكیان لە گەڵ هەندێك لە كورتە باسەكانی خاڵی یەكەم دا لەیەك چوونێكی زۆریان هەیە، بەڵام بە گشتی تیشك دەخەنە سەر چەند لایەنێكی دیكەی بابەتی گەورەو گرنگی قەزاو قەدەرو، سەرجەم ئەو دوازدە كورتە باسە تەواوكەری یەكدین و بەهەموویان تارادەیەكی باش بابەتی قەزاو قەدەر ڕوون دەكەنەوە.

شایەنی باسیشە هۆكاری لە یەك چوونی هەندێك لە كورتەباسەكانی خاڵی یەكەم و دووەم ئەوەیە كە لە دوو هەلو مەرجی جیاوازدا نووسراون.

## خاڵی یەکەم: حەوت کورتە باسی گرنگ دەربارەی قەزاو قەدەر

کە ئەمە ناوو نیشانەکانیانە[1]:

1- قەزاو قەدەر چییە؟!
2- چۆنیەتی بڕوا بوون بە قەزاو قەدەر.
3- ئەنجامی بڕوابوون بە قەزاو قەدەر.
4- ئازادیی مرۆڤ و قەزاو قەدەر.
5- کاریگەریی ئینسان لە ئاقار بەدیهێنەرایەتی خوادا.
6- چەند بەڵگەیەکی دیکە لەسەر ئازادیی مرۆڤ.
7- ئایا بڕوابوون بە قەزاو قەدەر دەبێتە هۆی پاڵدانەوە؟!

ئێستاش تۆو ئەم حەوت کورتە باسە بە ڕیزو یەك لە دوایی یەك، بەڵام پاش دەستپێکێکی ڕێخۆشکەر:

---

1) شایانی باسە ئەم خاڵە هەمووی بەهەر حەوت کورتە با سەکەیەوە لە کتێبی (م سوڵمانی کامڵ) وەرگیراون. بڕوانە: مسوڵمانی کامڵ: بەشی یەکەم: بیرو باوەڕی م سوڵمان) ل (195-224)، چاپی یەکەم: 1997.

# دەستپێك

هاو بڕوای ئازیزو سەنگینم!

مەسەلەی قەزاو قەدەر لەبەر گرنگیی و وردیی و هاڵۆزییانی هەر لە سەرەتای مێژووی ئیسلامەوە کێشەو بەرەو دم بەدمەیەکی زۆری لەسەرەو زانایان پاش بڕوابوون بەخوا لە هەموو مەسەلەیەکی دیکەی پتر لە سەری ڕۆیونو لێیان کۆڵیوەتەوە.

ئنجا ئێستاش کە زۆرێك لە مسوڵمانان لە قورئان دوور کەوتوونەتەوەو زۆربەی زۆری ڕاستییەکانیان لە دڵو مێشکدا گۆڕاوەو گەلێك جاران هەر سەرەو بنیش بووە! مەسەلەی قەزاو قەدەریش لەو گۆڕانو سەرەوبن بوونە بێبەش نەبووە، بگرە پشکێکی گەورەشی پێ بڕاوە.

قەزاو قەدەر -ئەگەر بە شێوەیەکی واقیعیی و لە ڕوانگەیەکی ئیسلامییەوە سەیر بکرێ- باشترین هاندەرو چاکترین پاڵنەرو بەهێزترین بزوێنەری ئینسانە بۆ کارکردنو جووڵانو شۆڕشو لابردنی ستەمو زۆرو نەهێشتنی خراپەو پەشێویو فەساد، وەچاکترین هۆیە بۆ ورە وەبەر ئینسان نانو ئازاکردنیو سڵ نەکردنەوەی لە مردنو پێشهاتە گرچووبڕو بە ئێشو ژانەکان[1] ئێستا ئەو قەزاو قەدەرەی وا کاریگەرو ئەو دینەمۆی وا بەهێزو

1) چونکە بە پێی بڕوابوون بە قەزاو قەدەر هەموو شتێك ئەندازەگیریی کراوەو بڕاوەتەوە، کەواتە: نە ترسنۆکیو پاشەکشەکردنو خۆپەنادان پێشهاتان لە ئینسان وە دوور دەخاتو تەمەنی درێژ دەکات، وە نە ئازایەتیو چوونە پێشو خۆپێدادان کارەساتان وەنزیك دەخاتو تەمەنی مرۆڤ کورت دەکەن.

پڕ وزە بۆ کارکردنو جوولانو شۆڕشو ئازایەتیو بە جەرگیو چاوقا یـمی، بەهۆی خراپ حالی بوونو بڕواکزییەوە بۆ تە بەها نەی دە ست بەخۆدا بەردانەوەو دانیشتنو خۆ نەبزاوتنی زۆربەی خەڵکی مسوڵمانی لە ئی سلام بێ هەوالو، تەنانەت هی وایان هەیە ئەگەر طاغووت ئایینە کەی لەبن بێنیو چاوانی دەرێنێ، لە قەزاو قەدەری گۆرین دە مامکێکی تەن بەلیو پالدانەوەو هەلخزانو نەجوولانو سەر کزکردن دروست دەکاتو بە بەردەم و چاوی خۆیەوە دەگرێو، سەرباری ئەوەی کە بۆ خۆی دە ستەو ئەژنۆ دادەنیشێو هەلدەخزێ، ڕێی جوولانو هەولدان لە خەڵکیش دەگرێو، بە قسەی زادەی مێشکی پڕ نەفامییو دلی پڕ ترسو لەرزی، زۆر کەس دەخەوێنێو بگرە دەشخەسێنێو[1]، دەلێ ئەوە کاری خوایەو خوا ئیرادەی لەسەرەو ئێمەش ئەگەر بەندەی تەوان بینو، بە قەزاو قەدەری خوا ڕازی بین پێویستە شان لەبەر بەلای خودا ڕاگرینو خۆ نەبزێوینو ئارامگرو سوپاسگوزارو شوکرانە بژێر بین!! بێئاگا لەوەی کە هەم سەربەرزییو خۆشحالیو هەم زەبوونیو ژین تالی، بەپێی قەزاو قەدەری خواو بەویستی خوا بە سەر خەڵک یدا دەچە سپێنو، هەل بژاردنی هەرکامێکی شیان دەگەڕێتەوە بۆ خەڵکو، خواش هەمیشە لە خەڵکی بڕوادار داوا دەکات کە هەول دەن بەسەربەرزیو عیززەتو مەردانە بژینو، جگە لە خوا بەندایەتی هیچ کەس نەکەن، وەك خوا -عزّوجلّ- فەرمووویەتی: (**وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ**﴾(المنافقون-8)، واتە: وە عیززەتو سەربەرزی هی خواو هی

---

1) دیارە مەبەست لە خەساندن وا تا مەعنەوییەکە یەتی، بە تەعبیری ڕەوانبێژی مەعنا (مجازی)یەکەی نەك ڕوالەتیو حەقیقییەکەی، واتای مەجازیی و شەی ناوبراویش نەهێ شتنی دەماری جورئەتو جوامێریو غیرەتە.

پێغەمبەرەکەی و هی بڕوادارانە. واتە بابای بڕوادار نابێ بە بێدە سەلاتیو زەبوونیو داماویی ڕازی بێو، پێویستە هەوڵی پا یە بڵ ندییو ع یززەت پەیداکردن بدات: **(لا ینب غي للـ مؤمن ان یُذِلَّ نَفْ سَهُ....)** رواه الـ بزاز والطبراني، یانی: نابێ بابای بڕوادار خۆی زەبوونو ژێردەست بکات.

ئن جا لە هەمووی خە فەت هێ نەرتریش ئەوە یە کە نا حەزو دوژمنانیشمان[1] ئەو واقیعی وا نالەبارو ناپێش چاوی م سوڵمانانی دوور لە ئیسلام دەکەنە بەڵگەی نا تەواویی ئی سلامو، بەتای بەتی مە سەلەی (قەزاو قەدەر) بە لێکدانەوەی ڕۆژهەلات ناسە نەزان - یان خۆگێل کەر-ەکانو بەچکە مسوڵمانە گوێ لەمستو لا ساکەرەوەکانیان، گەورەترین کۆسپی سەر ڕێی ڕزگاریو بەرەو پێش چوونی مسوڵمانانە!

جا بۆیە بە پێویستم زانی لەم باسەدا تیشکی قورئانو سوننەتو عەقڵ بخەینە سەر ئەو مەسەلەیەو، روو نی بکەی نەوە کە مو سڵمانی ژ یرو تێگەیشتوو چۆن لەو مەسەلەیەوە ڕادەمێنێو بڕوای پێ دێنێو لەم حەوت کورتەباسەدا چۆنیەتی بڕوا پێبوونی مسوڵمانی تێرو تەواو بە قەزاو قەدەر بخەینەڕوو.

1) هەرچەندە تێکڕایی خەلکی وشەی ناوبراو هەر بە (دوژمن) گۆ- تلفظ - دەکەن، بەلام وای بۆ دەچم کە ڕاستی یەکەی (دژمن) بێو ئەو (و)ە زیاد بێ.

## (1) قـەزاو قـەدەر چییـە؟

بڕوابوون بە قەزاو قەدەر (القضاء والقدر) یەکێکە لە شەش بنچینەکانی بیروباوەڕی مرۆڤی مسوڵمان، واتە ئینسان بەبێ بڕوا هەبوون بەوە کە خۆشیو ناخۆشی، چاکو خراپ، بە قەزاو قەدەری خوایە، بە مرۆڤێکی مسوڵمانو باوەڕدار دانانرێ وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە کە بە: فەرموودەی جبریل (حدیث جبریل) ناسراوە: **(قال فأخبرني عن الأيمان، قال: أن تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورسله واليوم الآخر، وتؤمن بالقدر خيره وشره)** رواه مسلم عن عمر بن الخطاب (رضي الله عنه)، واتە: جوبرائیل گوتی: هەواڵم پێ بدە دەربارەی بڕوا، پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) گوتی: بڕوا ئەوەیە کە بڕوابێنی بە خواو فریشتەکانی خواو کتێبەکانی خواو پێغەمبەرەکانیو ڕۆژی دوایی، وە بڕوابێنی بەوە کە چاکەو خراپە لەلایەن خواوە ئەندازەگیریی کراوە.

(راغب الأصفهاني) توێژەرەوەی ناوداری زاراوەکانی قورئان دەربارەی وشەی (قەدەر) دەڵێ: (قەدەر) یانی ڕوونکردنەوەی ئەندازەی شت.... ئەوە کە ئەو شتە بگێڕێ بە ئەندازەیەکی تایبەت، چۆنێکی زانیاری دا خوازی کرد(1) وە دەربارەی وشەی (قضاء)یش دەڵێ: (قەزا) یانی جێبەجێکردنی شتێك، جا ئەو شتە قسەبێ یان کردەوە(2)، وە قەزای خوا لە قەدەر تایبەتی ترە، چونکە قەدەر بریتیە لە ئەندازەگیریی (تقدير)، بەڵام قەزا بریتیە لە دابڕینو جێبەجێکردن، وە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: قەدەر

---

1) مفردات ألفاظ القرآن، راغب الاصفهاني، ل 409.
2) هەمان سەرچاوە، 421.

وەکو ئەو شتەوایە کە بۆ پێوان سازکرابێ، وە قەزا وەکو پێوانوایە(1)، (ابن فارس)یش دەربارەی قەدەر دەڵێ: (قَدْرٌ) بەسەر فە تحە- یان زە نە سکون-ی (دال)ەکەی بۆ سنووورو ئە ندازەو نرخو قی مەتی هەر شتێك بەکاردێ(2)، وە دەربارەی قەزا دەڵێ: بۆ هەموو ما نا جۆراو جۆره کانی (قضاء) بەس یەك ڕیشە هەیە، ئەویش بریتە لە (جێبەجێکردنی ئی شێك بە وردەکاریو لێزانییەکی تەواو)(3).

هەڵبەتە باقی زمانەوانەکانی دیکەش لە ئاقارو وشەی قەزاو قەدەردا هەمان هەڵوێستیان هەیە(4)، بەڵام هەندێکیان بە بەراوەژووەوە (قضاء) بە ئەندازەگیریی و (قدر) بەجێبەجێکردن دادەنێن(5).

کەواتە:

کورتەی پێناسەی (قەدەرو قەزا) بەم شێوەیە:

---

1) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل 422. وە بڕوانە (دائرة المعارف القرن العشرين)، ب 7، ل 838، طبعة دار الفكر.

2) بڕوانە (القضاء والقدر في العلم والفلسفة) ل 55 لە (المقايس) ابن فارس.

3) هەمان سەرچاوە، 53، دانراوی (جعفر السبحاني).

4) بۆ وێنە سەرنجی (القاموس المحيط)ی فیروز ئابادی بدە، ب 2، ل 118، وشەی (القدر) وە ب 4، ل 381 وشەی (القضاء).

5) بۆ وێنە سەرنجی (كتاب التعريفات)ی (السيد الشريف علي بن محمد الجرجاني) بدە، ل 75، وشەی (القدر) الطبعة الأولى سنه (1306) هجرية، المطبعة الخيرية. مِصْر، وە دەتوانین بۆ پتر ڕوونکردنەوەی چەمك مەبەستی (قەزاو قەدەر) وێنەیەك بێنینەوە:

هەر کتێبێك کە دادەنرێ بەرلەوەی بنووسرێو چاوی بە دونیا ڕوون هەڵێنێ، خاوەنەکەی واتە: دانەرەکەی-ئەندازەو چییەتیو چۆنییەتی لە خەیاڵو بیروهۆ شی خۆیدا دەچە سپێنێو وێنەیەکی وەهمی بۆ دەکێشێ، ئنجا دواتر دەست دەکات بە نوو سینیو دارِ شتنیو دێ تە جیهانی واقیعەوە، هەڵبەتە بە بیرو خەیاڵ داهێنانی کتێبە کە (قەدەر)ەو، نووسرانیشی (قەزا)یە.

قەدەر یانی: ئەندازەگیریی و نەخشەکێشان و بەرنامەدانانی خوا بۆ هەرچی هەبووە و هەیە و دەبێ، هەر لە ئەزەلەوە هەتا ئەبەد.

وە قەزا یانی: حوکم کردنی خوا بە جێبەجێکردنی ئەو شتانە کە لە ئەزەلەوە زانیاری و ئیرادەی بێسنووری پەیوەندییان پێوە بەستوون لە کات و شوێنی تایبەتیداو بە شێوەو چۆنیەتی دیاریکراویان. کەواتە قەدەر ناوی ئەو نەخشەو بەرنامەیەکە خوا لە ئەزەلەوە بۆ بوونەوەری داناوە، قەزاش یانی جێ بەجێ کردنی ئەو بەرنامەیە بۆ هەر شتێك لەکات و شوێنی دیاریکراوی دا[1].



1) بڕوانە (شرح العقائد النسفية)ی عمر النسفي، ل (140)، ئەویش هەمان هەڵوێستی هەیە لەوبارەوە.

## (2) چۆنیـەتی بـڕوابـوون بە قــەزاو قــەدەر:-

پاش ئەوەی زانیمان چەمكو مەبەستی قەزاو قەدەر لە ڕوانگەی مرۆڤی مسوڵمانەوە چیە، پێویستە بزانین هەڵوێستی ڕاستو دروستی باوەڕداری مسوڵمان سەبارەت بە قەزاو قەدەر چۆنە، وە چۆن چۆنی بڕوای پێی هەیە!

بێگومان مادام (قەدەر) بە مانای بەرنامەڕێژییو نەخشەكێشان بێو (قەزا) بە مانای جێبەجێكردنی ئەو بەرنامەو نەخشەیەو هێنانەدی شتان (الأشیاء) بێ، تاقە هەڵوێستی ڕاستو دروست لەوبارەوە ئەوەیە كە بڵێیـن: هەموو شتێك -ماددی یان نامادی- زانیاریو ئیرادەی خوا لە ئەزەلەوە پەیوەندی یان پێیەوە هەبووە، وە هەرچی هاتۆتەدی یان دێتەدی بەپێی ویستی خوا هاتۆتەدی یان دێتەدیو، بەبێ ئیرادەی خوا هیچ شتێك نایەتەدیو بەرگی بوون ناپۆشێ، ڕوونتـر بڵێین: خوا لە ئەزەلەوە هەموو شتێكی زانیوە، بۆ وێنە: چاكەی چاكەكارانو خراپەی تاوانباران، وە هەرشتێك كە پەیدابووە یان دەبێ، خوا ویستوویەتی دەنا نەدەبوو.

ئەمە تاقە هەڵوێستی ڕاستو بێ گرێیە لە ئاقار قەزاو قەدەردا چونكە:

أ- ناگونجێو ماقووڵ نییە شتێك لە موڵكی خوادا هەبێو ئەو پێی زانا نەبێو لێی بێ ئاگابێ! پاكی بۆ وی.

ب- خوا بۆیە خوایە چونكە بەدیهێنەرو پەیداكەری غەیری خۆیەتی، غەیری ویش هەموو شتێكە وە ئەگەر بڵێین: غەیری وی توانای شتوەدی هێنانی هەیە -وەك موعتەزیلەكان دەڵێن: ئینسان بۆ خۆی كردەوەكانی دەخوڵقێنێ نەك خوا- ئەوە ئەوكاتە هاوبەشو هاوەڵمان بۆ خوا بڕیارداوە، چونكە شت خوڵقاندن تایبەتیترین سیفەتی خوایە.

له تێكڕای دهقهكانی ئیسلامیش ههر ئهوه دهفامرێتهوه، وهك له چهندان ئایهتدا هاتوه بۆ نموونه: ﴿قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا﴾ (الطلاق– 3)، واته: خوا ههموو شتێكی ئهندازهگیریی كردوه.

﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾(القمر– 49)، واته: ئێمه ههموو شتێكمان به ئهندازه دروست كردوه.

﴿وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُ بِمِقْدَارٍ﴾(الرعد– 8)، واته: وه ههمووشتێك لهلای وی به ئهندازهیه.

﴿كَانَ أَمْرُ اللهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا﴾(الأحزاب– 38)، واته: وه ئیشی خوا نهخشهیهكی ئهندازهگیریی بۆ دانراوه.

﴿الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى ۞ وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَى﴾(الأعلى: 2–3)، واته: ئهوهی كه شتی خولْقاندوهو جارێكی خستوه، وه ئهوهی نهخشهی بۆ ههموو شتێك كێشاوهو ئنجا رێڕوونی كردوه.

﴿وَإِذَا قَضَى أَمْراً فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾(البقرة– 117)، واته: وه ئهگهر شتێكی كرد بهس پێی بلّێ ببه ئهوه دهبێ.

﴿فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ﴾(فصلت–12)، واته: حهوت ئاسمانی هێنانهدی.

﴿وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِالْحَقِّ﴾(الزمر–69)، واته: وه بهحهق حوكمیان له نێواندا كرا.

وهك دهبینین (قدر) بۆ ئهندازهگیرییهو (قضاء) بۆ حوكم كردنو جێبهجێكردنی به كرداره.

## (3) ئەنجامی بڕوابوون بە قـەزاو قـەدەر:

دوای ئەوەی زانیمان قەزاو قەدەر لە ڕوانگەی مرۆڤی موسوڵمانەوە چییەو، چۆنی باوەڕ پێیە، با بزانین داخوا بڕوا بوون بە قەزاو قەدەر چ ئەنجامێکی هەیەو، چ شوێنەوارێك لە دڵو دەروونو واقیعی ژیانی مرۆڤی مسوڵماندا پەیدا دەکات؟

دەتوانین لە چەند خاڵێکدا ئەنجامو شوێنەواری بڕوابوون بە قەزاو قەدەر بخەینەڕوو:

**یەکەم:** خۆڕاگرتن لە ئاقار بەڵاو تەنگانەداو بێزاری دەرنەبڕینو خەفەت نەخواردن بەهۆی لەدەستچوونی بەرژەوەندیو قازانجی دنیایی، چونکە کەسێك بڕوای وابێ کە هەرچی دەقەومێ بە ئیرادەی خوایەو، حەتمەن دەبوو هەر ڕووی دابایە، زۆر خۆی تێك نایەنێو نایەڵێ بەڵایەکەی لێ دوو چەندانە ببێتو، ناڵێ ئەگەر وابا وانەدەبووو، ئەگەر وانەبا وادەبوو، بەڵکو دڵی خۆی بەوە دەداتەوە کە ئەوەی ڕووی داوە نەدەکرا ڕوونەداتو دەبوو هەر هاتبایە، دیسان کە دەزانێ ئەو بەڵاو ناخۆشییە ویستی خوای لەسەرەو خواشی لە هەموو شتێك خۆشتر دەوێ، ئەویش دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ئێشو ژانی ئەو بەڵایە چونکە: (هەر چی لەلای خۆشەویستەوە بێ خۆشە).

**دووەم:** سەرخۆش نەبوونو لەخۆبایی نەبوون بەهۆی وەدەستهێنانی قازانجو بەرژەوەندییەك، چونکە لەسەر بنچینەی بڕوابوون بەقەزاو قەدەر دەزانێ کە ئەو خێرو بەرژەوەندییە حەتمەن دەبوو هەر بێتەدی، هەڵبەتە هەڵوێستی دوو کەسیش لە بەرانبەر پێشهاتێکی خۆشدا کە یەکێکیان

بڕوای وایە ئەو شتە مادام بڕیاری خوای لەسەر بووە، دەبوو هەربیی‌و یەکیشیان پێی وایە بە هەڵکەوت ڕێی لەو نیعمەتە کەوتوە، هێندەی ئاسمان‌و ڕێسمان لێك دوورن. ئەم دوو بەرهەمەش ئەم دوو ئایەتە دەلالەتیان لەسەر دەکەن: ﴿**مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي الأَرْضِ وَلا فِي أَنفُسِكُمْ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللهِ يَسِيرٌ ۞ لِكَيْلا تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ...**﴾ (الحديد:22-23)، واتە: هیچ بەڵایەکتان تووش نابێ نە لە زەوی‌و ماڵ و نە لەخۆتاندا مەگەر پێش خوڵقاندنی نووسرابێ، ئەوەش بۆ خوا ئاسانە، بۆ ئەوەی نە بۆ شتێك کە لە دەستتان دەچێ دڵتەنگ بن، وە نە بۆ شتێك کە دەتانداتێ دڵخۆش بن، (واتە: بۆیە ئەمەمان پێگوتن لەدەمی هات ونەهاتی دا خۆڕاگرو نەلەخشاو بن).

**سێیەم:** نەترسان لە مردن‌و نەسڵەمینەوە لەو ڕووداوو کارەساتانەی کە دژوارن‌و دەردەسەریی‌و ئەرك‌و ئازاریان بە دواوەیە، لە کاتێکدا کە هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا داخوازی بکات، چونکە بابایەك بڕوای جەزم بێ لەسەر ئەوەی کە هەرچی خوا بڕیارو ویستی لەسەر نەبێ نابێ‌و، ئەوەی خوا نەیکات نابێ، مەحاڵە و شەی (ترس)، (سڵەمینەوە)، (پاشەکشە کردن)، (پاڕانەوە لە ترسی مردن) لە فەرهەنگی مێشکی ویدا هەبن، بەڵێ کەسێك بڕوای وابێ نە ئازایەتی مردنی لێ وەنزیك دەخات، نە ترسنۆکی تەمەنی درێژ دەکات، وە بڕوای وابێ ئەگەر هەموو خەڵکی دونیا خڕبنەوە نە توانای قازانج نە زیان گەیاندنیان نیە بەبێ ویستی خوا، مەحاڵ‌و چاوەڕوان نەکراوە کە بترسێ‌و بلەرزێ، خوای کاربەجێ لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿**قُل لَّن يُصِيبَنَا إِلاَّ مَا كَتَبَ اللهُ لَنَا**﴾

(التوبة- 51)، واتە: بڵێ تووشمان نابێ ئەوە نەبێ کە خوا بۆی نووسیوین، (ئەوەش کە نووسیویەتی هەردەبێ ببێ، کەوا تە ترس و لەرزی ناوێ).

**چوارەم:** یەکی دیکە لە ئەنجامەکانی بڕوابوون بە قەزاو قەدەر بریتییە لە نائومێد نەبوون بە هۆی تاوانبارییەوە و، لە خۆبایی بوون بە هۆی چاکەکارییەوە، چونکە وەك لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا -علیە الصلاة والسلام- هاتوە: (بابای واهەیە کردەوەی دۆزەخییانی لێ دەپشکوێتەوە هەتا باسکێکی دەمێنێ بگاتە دۆزەخێ - یان باڵێك- بەڵام نووسراوی قەدەری خوا پێ شی لێ دەگرێتەوەو کردەوەی بەهەشتیان دەکات و دە چێتە بەهەشتێ، وە هی واهە یە کردەوەی بەهەشتییان دەکات هەتا باسکێك یان دوو باسکی دەمێنێ بیگاتێ، بەڵام نوسراوی ئەزەل پێشی دەکەوێتەوەو کردەوەی دۆزەخییان دەکات و دەچێتە نێوی)، ئەمەش دەقی فەرمایشتەکەیە: **(فو الله إن أحدكم أو الرجل ليعمل بعمل أهل النّار حتى ما يكون بينه وبينها إلا ذراع أو باع فيسبق عليه الكتاب فيعمل بعمل أهل الجنّة فيدخلها، و إن الرجل ليعمل بعمل أهل الجنّة حتى ما يكون بينه وبينها غير ذراع أو ذراعين فيسبق عليه الكتاب فيعمل بعمل أهل النّار فيدخلها)** رواه البخاري و مسلم (زاد المسلم فيما اتفق عليه البخاري ومسلم) ب 1، ل (69-70).

جا بێگومان کەسێك ئاوا بیر بکاتەوە -واتە ئاوا بڕوای بە قەزاو قەدەری خوا بێ- ئەگەر تاوانبارترین و بەدفەڕترین کەسیش بێ ئیحتمالی ئەوەی هەر لەلا دەمێنێ کە خوا لە ئەزەلدا بەهەشتی بۆ دیاری کردبێ، کەواتە هیوا بڕاو و نائومێد نابێ و، وا هەست ناکات کە

دەرگای گەڕانەوەی لەسەر پێوە دراوەو دەرفەتی تۆبەو پەشیمانی و چاکەکاریی نەماوە، دیسان کەسێك ئاوا بیر بکاتەوە لە کاتێکدا کە چاکەکارترین و پارێزکارترین بەندەبێ، ئیحتمالی ئەوەی هەر لە دڵدا دەمێنێ کە خوا لە ئەزەلدا دۆزەخی بۆ دیاری کردبێ، کەوا تە: قەت لەخۆبایی نابێ و بە هۆی کردەوەی چاکیەوە لووتی ناچێتە عاسمانێ و وا هەست ناکات کە تازە چۆتە بەهەشتێ و لە چوونە دۆزەخێ قوتاربووە!

کەواتە بڕوا بوون بە قەزاو قەدەر تروو سکەی ئومێدو هیواو موژدەدەری تاوانبارانەو، باشترین هۆی دڵخۆشکردن و گێڕانەوەیانە بۆ بن باڵی بەزەیی خواو سێبەری درەختی خوانا سی و چاکەکاریی و فەرمانبەریی، دیسان چاکترین پێشگر (مانع)ی خواناس و چاکەکارانە لە خۆپەسەندیی (عُجْب)و لەخۆبایی بوون (غرور)و هێشتنەوەیان لە نێوان ترس و ئومێد (الخوف والرجاء)دا، کە دوو شاباڵی بەرەو خوا چوونن.

**پێنجەم:** یەکی دی لەو شوێنەوارانەی کە بڕوابوون بە قەزاو قەدەر لە دەروونی مرۆڤی خواناس و بڕواداردا پەیدای دەکات، بریتییە لە خۆیەکلاکردنەوە بۆ خواو پشت بە خوا بەستن، چونکە مرۆڤ کە دڵنیاو دڵ دامەزراو بوو لەوبارەوە کە هەرچی ڕوودەدات لە خۆشی و ناخۆشی و تاڵی و شیرینی، هەمووی بە ئیرادەی خوایەو بڕیارو حوکمی وی لەسەرەو، زیان و قازانجیش بەس بەدەست وی یەو، هیچ شتێك نیە کە لە ژێر ڕکێف و دەسەڵاتی وی بەدەربێ، حەتمەن ڕووی نیازو مەبەستەکانی دڵی دەکاتە خواو، پشتی پێ دەبەستێ و بێجگە لە خوا چاوی لە دەستی کەس نابێ و، بە هەویا بەخششی کەس نابێ، هەڵبەتە کەسێکیش پشت بە خوا ببەستێ لە هەموو کەس خۆڕاگرترو بەهێزتر دەبێ، وەك

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **(مَنْ أحب أن يكون أقوى الناس فليتوكل على الله)**. رواه ابن أبي حاتم. ئەو کەسەش کە خۆی بە خوا دە سپێرێ خوای بەسەو زایەی ناکات، وەك خوای بەخشەر فەرموو یەتی: **﴿وَ مَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللهِ فَهُوَ حَسْبُهُ﴾** (الطلاق- 3)، واتە: وە هەرچی پشت بە خوا ببەستێ ئەوی بەسە.

**شەشەم:** دیسان هەر لە بەرهەم و میوەی درەختی سەربەخێری بڕوابوون بە قەزاو قەدەرە کە ئینسانی بڕوادار هەموو وزەو توانایەکی دەخاتەکار بۆ چاکەکاریی و پەسەندکاریی تاکو لە خوا نزیك ببێتەوەو شایستەی چوونە بەهەشت و چەپاڵەدران بێ لە دۆزەخ، چونکە وە کو سەدان ئا یەت و فەرمـوودە ڕایانگەیاندوە ئینسان بە هۆی کردارو ڕەفتاری مـ سوڵمانانەو پەسەند نەبێ ڕێی چوونە بەهەشتی نیە، لەوبارەوە دەقی قورئان زۆرن بۆ نموونە:

- **﴿وَأَمَّا مَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَهُ جَزَاء الْحُسْنَى﴾**(الكهف- 88)، واتە: وە بەڵام هەر کەس بڕوا بێنێ و کردەوەی چاك بکات ئەوە پاداشتی زۆر چاکی هەیە.

- **﴿مَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُ وَمَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ﴾**(الروم- 44)، واتە: هەرچی کافر بێ زیانی کوفرەکەی بۆ خۆیەتی، وە ئەوەی چاکە بکات ئەوە ڕێ و جێ بۆ خۆیان ئامادە دەکەن.

وە دیسان پێغەمبەر ﷺ بێپەردە فەرموو یەتی: کردەوەی چاك بکەن، چونکە هەموو ئینسانێك بۆ جۆرە کردەوە یەك یار یدەی دەدرێ کە لەو جێیە بوەشێتەوە کە بۆی دروست کراوە، کە ئە مەش دە قی فەرمایشتەکەیەتی: **(إعملوا فكلٌ مُيَسَّر لما خُلِقَ له)** رواه الطبراني عن

ابن عباس، كشف الخفاء، ب1، ل165، واته: (ئیش بكەن -مەبەست كاری چاكە- چونكە هەموو كەسێك ئامادە دەكرێ بۆ ئەو شوێنەی كە بۆی خولقێنراوە). (كەواتە ئەوەی كرداری چاكی نەبن دیارە بۆ شوێنی چاك -بەهەشت- دروست نەكراوە).

واتە: مرۆڤ بە هۆی كردەوەو كارەكانی چارەنووسی نووسراوی ئەزەلی خۆی بۆ ئاشكرا دەبێ، كەوابێ كێ حەز لە چارەنووسێكی چاكو پەسەند دەكات با كردەوەی چاكو پەسەند رەچاو بكاتو، كێش سواری كەری شەیتانی بووەو كەیفی بە دۆزەخ دێو پێی خۆشەو چارەنووسی بەدی بۆ نووسرابێ، با لە جلێتاوی رەفتارو ئاكاری بەدو ناپەسندا نوقم بێ، بەڵام با دواییش جگە لەخۆی لۆمەی هیچ كەس نەكات!

ئنجا بێگومان بابای بڕوادار بە قەزاو قەدەر، هەوڵ دەدا بۆ كردەوەو ئاكاری چاك لێ ببڕێو خۆی بۆ تەرخان بكات، چونكە سوور سوور دەزانێ كە چارەنووسی چاك لە زانیاری بێسنوورو ئەزەلیی خواوەندا بۆ ئەو كەسە دیاریكراوە كە لە ژیانی دنیایدا دڵی بەرەو چاكەكاریی كەمەندكێش دەكرێو، كەسێك خوا بەهەشتو رەزامەندیی خۆی پێ رەوا دیبێ لەبەر ئەوەیە كە زانیویەتی بە چاكەكارییو پەسند ئاكاریی دەژی، راستتر بڵێم:

كەسێك خوای بەخشندەو دادگەر بەهەشتو رەزامەندیی خۆی لە ئەزەلەوە بۆ بڕیار دابێ بە كردەوەو ئاكاری چاكو مسوڵمانانەش بەهرەمەندی دەكاتو، هەربۆیەش لە ئەزەلەوە ئەو چارەنووسە چاكەی بۆ بڕیارداوە، چونكە زانیویەتی كە لە ماوەی ژیانی دونیایدا بە كردەوەو رەفتاری ئازادانەی خۆی ئیسپاتی ئامادەییو لێوەشاوەیی خۆی بۆ ئەوە سەرەنجامە چاكە دەكات.

## (4) ئـازادیی مرۆڤ و قـەزاو قـەدەر:-

دوای ئەوەی زانیمان قەزاو قەدەر چی‌یەو مرۆڤی مسوڵمان چۆن بڕوای پێیەتی‌و، ئەنجامی بڕوابوون بە قەزاو قەدەر لە دڵو دەروونی مرۆڤ و واقیعی ژیانیدا چی‌یە، بە پشتیوانی خوا دەست دەکەین بە توێژینەوەی گرنگترین‌و سەرەکیترین بابەتی ئەم باسە کە بریتییە لە مەسەلەی (ئازادیی‌و نائازادیی ئینسان لە ئاقار قەزاو قەدەری ئەزەلیی خوادا).

پێویستە پێشەکی هەرکەسێك خۆی بە مسوڵمان بزانێ سێ قەزییەی گرنگ لەبەر چاوبگرێ‌و، بڕوایەکی پتەوی دوور لە دوودڵیی پێیان هەبێ، چونکە دەقەکانی قورئانی بەپێزو خاوەن ڕێز بێ پەردە دانیان پێدا هێناون وێڕای حوکمی عەقڵ:

**یەکەم: هیچ شتێك نیە مومکین بێ هەبێ‌و لەژێر ڕکێفی زانیاریی‌و ویستی خوادا نەبێ:**

بەڵێ هەرچی هەبووەو هەیەو دەگونجێ پەیدابێ لە ئەزەلەوە - لەو دەمەیدا کە جگە لە خوا هیچ شتێك نەبووە- خوا زانیاری هەبووە لە سەر پەیدابوونی، بێگومان ئەم یاسایەش حوکمێکی گشتی‌یەو ڕیزپەڕ (شاذ)ی نیە، ئنجا دەبێ هەرواش بێ چونکە بەس خوا بەدیهێنەرەو غەیری وی هەمووی وەدیهێنراو (مخلوق)ە، کەواتە: دەبێ حەتمەن هەموو شتێك بە گوێرەی زانیاری‌و بە حوکمی ئیرادەی خوا خوڵقابێ، چونکە ئەگەر بڵێین شتێك هەیە خوا نەیزانیوەو نەیویستوە، مانای وایە وێڕای هاوبەش بۆ خوا پەیداکردن، سیفەتی نەزانیی‌و دەستەوستانییشمان پاڵ داوەتە لای خوا! دیارە دەقی قورئانیش دەربارەی ئەوە کە هەموو شتێك بەپێی زانیاری‌و بە حوکمی ویستی ئەزەلیی خوا دروست دەبێ، زۆر زۆرن بۆ نموونە:

- ﴿وَيَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ﴾(آل عمران- 29) وە خوا هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە دەیزانێ.
- ﴿وَعِندَهُ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ هُوَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ﴾(الأنعام- 59) وە خوا کلیلەکانی نهێنی یانی لەلان، جگە لەوی کەس نایانزانێ، وە هەرچی لە وشکانیو دەریادا هەیە دەیزانێ.
- ﴿أَلا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾(الملك- 14) ئایا ئەو زاتەی کە شتی دروست کردوە پێی زانانیە، وە ئەو وردبینو شارەزایە؟!
- ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ وهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾(الأنعام- 101) وە خوا هەموو شتێکی خولقاندوە وە بە هەموو شتێکیش زانایە.
- ﴿وَمَا تَشَاؤُونَ إِلاَّ أَن يَشَاء اللَّهُ﴾ (الأنسان-30)، وە ناتوانن ئیرادە بکەن مەگەر خوا بیەوێ.
- ﴿وَلَوْ شَاء اللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلكِن يُضِلُّ مَن يَشَاء وَيَهْدِي مَن يَشَاء﴾(النحل- 93) وە ئەگەر خوا ویستبای دەیگێڕاین بە یەك کۆمەڵ -واتە یەك کۆمەڵی بڕوادار- بەڵام هەرکەسێکی بیەوێ سەری لێ دەشێوێنێو هەر کەسێکی بشیەوێ ڕێڕوونی دەکات.
- ﴿وَيَفْعَلُ اللَّهُ مَا يَشَاء﴾(ابراهيم- 27) وە خودا هەرچی بیەوێ دەیکات.
- ﴿إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ﴾(هود- 107) بەڕاستی پەروەردگارت هەرچی بیەوێ دەیکات.
- ﴿يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ﴾(المائدة-1)، بێگومان خودا چۆنی بوێ وا حوکم دەکات.

**دووەم: خوای پەروەردگار دادگەرو کاربەجێیە:**

بەڵێ پێویستە هەموو مسوڵمانێك بڕوای جەزم بێ لەسەر ئەوە کە خوا هەتا بڵێی دادگەرو کاربەجێ یەو، ستەمو زۆرو کاری بێجێ لەودا نییە، چونکە ئەمە کەموکوڕییەو خوای بەدیهێنەریش -وەکو پێشتر خرایەڕوو- پاكو بێ خەوشەو لە هەموو لەکەو ناتەواوییەك بەرییە، ئنجا دادگەریو کاربەجێیی خوا سەرەڕای ئەوەی کە حوکمو بڕیاری ژیرییە لەدەیان ئایەتی قورئانیشدا ڕاگەیەنراوە، بۆ نموونە خوا عزّو جلّ- فەرموویەتی:

- ﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ﴾ (التين- 8) ئایا خوا دادگەرترین حوکمگێڕو فەرمانڕەوا نیە؟
- ﴿وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (المائدة- 38) وە خوا دەسەڵاتدارو کاربەجێ یە.
- ﴿وَكَانَ اللَّهُ عَلِيماً حَكِيماً﴾ (النساء- 92) وە خوا زاناو کارزانە.
- ﴿وَمَا اللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعَالَمِينَ﴾(آل عمران- 108) وە خوا نایەوێ ستەم لە جیهانی یان بکات.
- ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أَسَاء فَعَلَيْهَا وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ﴾ (فصلت- 46) ئەوەی کردەوەی چاك بکات بۆ خۆیەتی و، ئەوەش کە خراپە بکات لەسەر خۆیەتی، وە پەروەردگارت ستەمکار نیە دەربارەی بەندان.

**سـێیەم: ئینسـان ئـازادەو بە ویستی خـۆی دەژی:**

ئازادیی مرۆڤ و بەڕێوە چوونیشی بەپێی ئیرادەی خۆی، یەکی دیکە یە لەو سێ قەزیە سەلمێنراوانەی کە پێویستە بابای مسولْمان لە دلْی خۆ یدا بیان چەسپێنێو بڕوایەکی پتەوو قوولْی پێ هەبن. ئنجا بێگومان هەر ئەو خەسلْەتە تایبەتی‌یەشە کەوای لە ئینسان کردوە ببێتە شیاوی هەلْ بژێرران بۆ هەلْگرتنی ئەرکی جێنشینایەتیو تاقیکرانەوە لە بوو نەوەردا، دی سان ئەنجامی سروشتی بڕوابوون بەوەی کە هەرچی مرۆڤ دەیکات لە چاکەو خراپە بەویستی ئازادو هەلْبژاردنی خۆیان ئەو چاکەو خراپانەیان کردوون، دەنا ئەگەر وانەباو خوا بە تۆبزی پێی کردبان ئەوە کاربەجێییو دادگەریی خوا لێی نەدەوەشایەوە کە مرۆڤ بە کردەوەیەك سزا بدات کە بەتۆبزی پێی کراوەو ئەو دەستی تێدا نەبووە، ئنجا ئەوەی کە گوتمان سەرەڕای ئەوەی کە بڕیاری عـەقلْە، دەیان دەقی قورئانی بێ هەلْەش فەرمووبانە، بۆ نموونە:

- ﴿**فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ**﴾ (الكهف- 29) جا كێ دەیەوێ با بڕوابێنێو كێش دەیەوێ با بڕوانەیەنێ و كافربێ-
- ﴿**فَمَن شَاء اتَّخَذَ إِلَى رَبِّهِ سَبِيلاً**﴾(المزمل- 19) جا هەركەس بیەوێ بەرەو پەروەردگاری ڕێ دەگرێتەبەر.
- ﴿**....فَهَدَيْنَاهُمْ فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَى عَلَى الْهُدَى**﴾(فصلت- 17)...جا ئێمە ڕێڕوونیمان كردن بەلاّم ئەوان گومڕایی یان بەسەر ڕێنماییدا هەلْبژارد.
- ﴿**وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ۝ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا**﴾(الشمس: 7-8)، واتە: سوێند بەنەفسو بە ڕێكخەرەكەی، ئن جا خرا پەكردنو چاكەكردنی فێركـرد.

ئێستاش پاش ڕوونکردنەوەی ئەو سێ مەسەلەیەی کە مرۆڤ هەتا بڕوایان پێ نەیەنێ ناتوانێ بڵێ: هەموو سیفەتێکی چاك‌و پەسەندم بۆ خوا بڕیارداوەو لە هەموو سیفەتێکی خراپ‌ونە گونجاوم بە پاك گرتوە، دە چینە سەر کاکڵ‌و نێوەڕۆکی مەسەلەی هەرە گرنگی ئەم باسە کە بریتییە لە ئازادیی، یان نائازادیی ئینسان لە ڕاست قەزاو قەدەری خوادا:

یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: باشە مادام هەر کردەوەو هەڵوێستێکی کە مرۆڤ بەرهەمی دێنێ لە ئەزەلەوە خوا پێی زانا بووبێ‌و ویستی لە سەر بووبێ، کوا ئازادیی‌و هەڵبژاردن‌و ویستی ئینسان‌و چۆن دەتوانین بڵێین، مرۆڤ بۆ خۆی ڕێی چاك یان خراپ هەڵدەبژێرێ‌و بە ئیرادەی خۆی چارەنووس‌و پاشەڕۆژێکی باش یان بەد بۆ خۆی دیاری دەکات؟!

ئایا ئەو تاوان‌و خراپانە کە لە ئەزەلەوە خوا پێیان زانیار بووەو ویستی وابووە کە لە یەکێك لە بەندەکانیدا بێنەدی، ئەو بەندەیە دەتوانێ ئەو تاوان‌و خراپانە نەکات؟ ئەگەر بگوترێ نەخێر کەواتە دان بەوەدا هێنرا کە مرۆڤ لەبەردەم ئەو نەخشەیەدا کە خوا لە ئەزەلەوە بۆی کێشاوە دا ماوو دەستەوستانەو چاری ناچارە دەبێ خوا لە ئەزەلەوە چی دەربارە زانیوەو چی لێ ویستوە، بیکات، کەواتە مرۆڤ لە ئاقار قەزاو قەدەردا زۆر لەو کۆلکەدارە بێچارەترە کە دەکەوێتە بەرڕکێفی ڕێژەن (تەییار)و قەڵبەزەی ڕووبارێکی بێڕەزا، وە ئەگەر بگوترێ: بەڵێ -بەندە دەتوانێ ئەو تاوان‌و خراپانە نەکات کە خوا لەڕۆژی بەرێ وە لێی زانیون‌و ویستون- مانای وایە زانیاری خودا (پاکی بۆ وی) ڕاست نەبووو وەدرۆ گەڕاو ئیرادەشی لە ئاقار ئیرادەی مرۆڤ دا دەستەپاچەو داماو بوو!! جا هەر لە کۆنەوە لە ئاقار ئەم پرسیارەدا سێ جۆرە وەڵام سازکراون:

**1**- **وەلامی موعتەزیلەکان (القدرية)**: دەڵێین نەخێر خوا ویستی لە سەر تاوان‌و خراپەی تاوانباران نەبووەو بەدیهێنەری کردەوەکانی مرۆڤیش نیە، بەڵکو خوا بەس بڕواو چاکەی لە بەندەکانی ویستوەو مرۆڤیش خۆی خالیقی کردەوەکانی خۆیەتی، ئاواش نەبێ دادگەریی خوا ناچەسپێ.

**2**- **وەلامی جەبری یەکان (الجبرية)**: دەڵێین بەڵێ خوا هەر لە ئەزەلەوە کوفرو خراپەی لە کافرو خراپەکاران زانیوەو ویستوەو هەر بۆ خۆشی ئەو کوفرو خراپانەی تێدا خوڵقاندوون‌و، مرۆڤ لە دەست توانا و ویستی خوادا وەکو قەڵەمێك وایە لە چنگ نووسەرداو هەرچی دەیکات‌و لێی وەدی دێت لە چاکەو خراپە بۆ خۆی هیچ دەستی تێدا نیە، بەلام خوا ستەم لە بەندەکانی ناکات کە تاوان‌و خراپەیان پێدەکات‌و سزاشیان دەدات، چونکە ئێمە سەرمان لە کاری خوا دەرنا چێ دیسان خواش خاوەنی بەندەکانییەتی‌و هەرچی لەگەڵیان بکات ڕەوایەو ستەم نیە.

خوێنەری خۆشەویست! بەرلەوەی بچینە سەر خستنەڕووی وەلامی سێیەم کە بە بڕوای ئێمە تاقە وەلامی ڕاستەقینەی پرسیاری گۆرینە، وای بە چاك دەزانم وەلامی هەرکام لە موعتەزیلەو جەبری یەکان لەمەحەك بدەین:

### پێشەکی دەربارەی ڕای موعتەزیلەکان دەڵێین:

- ناگونجێ بگوترێ خوا ویستی لەسەر تاوان‌و خراپەی تاوانباران نەبووە، چونکە ماقوولٚ نیە شتێك لە موڵکی خوادا ڕووبدات بەبێ ئیرادەی وی، دیسان ئەگەر بڵێین: هەرچەند خوا نەیویستوە بابای کافر کافربێ‌و خراپە بکات، بەلام ئەو بە پێچەوانەی ویستی خواوە کافربوو و خراپەی کرد،

مانای وایە ویستی بەندەیەکمان بەسەر ویستی خوادا، زاڵ کرد. کەچی خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَشَاؤُونَ إِلاَّ أَن يَشَاءَ اللَّهُ﴾(التكوير-29)، وا تە: ئیرادە ناکەن تا خوا ئیرادە نەکات.

ب- وە ناگونجێ بگوترێ: خوا کردەوەکانی مرۆڤی نەخولقاندوون و مرۆ ڤ خۆی خالقی کردەوەکانییەتی، چونکە ئەگەر وابڵێین وێڕای ئەوەی کە هەندێك لە دروستکراوەکانی خوامان لەژێر ڕکێفی خوادا دەرهێناوە، بەڵام خوا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾(البقرة-20). بێگومان خوا بەسەر هەموو شتێکدا دەستەڵاتی هەیە. (هەڵبەتە کردەوەی بەندەکانیش "شتن" و لەژێر ڕکێفی خوادان). هاوبەشیشمان بۆ خوا بڕیار داوە، چونکە وێڕای وی ئینسانیشمان بە خالیق و بەدیهێنەر لە قەڵەم داوە کە دیارە ئەوەش شتێکی هەڵەیە چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ﴾(الزمر- 62)، خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە. (واتە هەر چی هەیە خوا خولقاندوویەتی). وە فەرموویەتی: ﴿أَفَمَن يَخْلُقُ كَمَن لاَّ يَخْلُقُ ...﴾(النحل- 17)، ئایا ئەوەی شت دەخولقێنێ وەك ئەوە وایە کە هیچ ناخولقێنێ!

ج- ئنجا ئەوەی کە پاڵی بە موعتەزیلانەوە ناوە کە ئاوا لە تەسك کردنەوەی توانای خوا وەخۆ کەون بریتی بووە لە چەسپاندن و سەلماندنی دادگەری خوا، بەڵام وەك لەوەڵامی سێیەمدا ڕوونی دەکەینەوە بۆ ئەوەی بەرگری لە دادگەری خوا بکەین حەوجێمان بەوەی نا کات لەویست و توانای خوا کەم بکەینەوە!!

**وە دەربارەی ڕای جەبری یـەكان دەڵێیـن:**

أ/ ڕاستە خوا لە ئەزەلەوە كوفرو خراپەی لە كافرو خراپەكاران زانیوەو ویستوە، وە ڕاستە خوا بەدیهێنەری هەموو شتێكە تەنانەت كردەوەی بەندەكانیش، بەڵام ڕاست نیە كە هەرچی مرۆڤ دەیكات خوا پێی دەكاتو بۆ خۆی هیچ دەستی تێدا نیە، بەڵكو وێڕای ئەوەی كە خوا یارمەتی مرۆڤ دەدات بۆ بەدیهێنانی كردەوەكانی، مرۆڤیش بۆ خۆی بە ئیرادەی خۆی كردەوەكانی هەڵدەبژێرێو دیارییان دەكات.

ب/ وە ڕاست نیە كە خوا هەر بۆخۆی تاوانو خراپە بە بەندەكانی دەكاتو سزاشیان دەدات! چونكە مرۆڤ بۆ خۆی بە ئیرادەو هەڵبژاردنی خۆی ئەنجامیان دەدات، وە خوا لە قورئانێدا هەموو دەمێ كردەوەی بەندەكان چ چاك چ خراپ پاڵ دەداتە لای خۆیان، بۆ نموونە فەرموویەتی: ﴿**لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ**﴾ (البقرة– 286)، ﴿ **جَزَاء بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ**﴾ (الواقعة– 24).

ج/ ئنجا ئەوەی كەوای لە جەبری یەكان كردوە كە خۆیان دوو چاری پرسیارێكی بێ وەڵام بكەنو سیفەتی ستەم (ظلم)و بێدادی پاڵدەنە لای خوای پاك، ئەوە یە كە ویستوویانە لە كاردانەوە (رد فعل)ی موعتەزیلاندا بەرگری لە زانیاریی و ئیرادەو دەستەڵاتی خوا بكەن، بەڵام وەك لەوەڵامی سێ یەم دا دەیسەلمێنین بەبێ لەنێو بردنی دادگەریی و كاربەجێ یی خواش دەتوانین زانیاریو تواناو ویستی بێ سنووری خوا ئیسپات بكەین.

ئێستاش كاتی خستنە ڕووی سێیەمین وەڵامی پرسیاری گۆرین هاتوە:

3- وەڵامی جەماوەری مسوڵمان (جمهور المسلمين) کە لە کۆنەوە بە (أهل السنة والجماعة) ناسراون: بێگومان وەڵامی پر سیاری ناوبراو -واتە سەلماندنی ئازادیی مرۆڤ بەبێ زیان گەیاندن بە هیچ کام لە ئیرادەو دەسەڵات یان دادگەریی خوا- لە سەر چاوەی جۆراو جۆری (اهل السنة)دا بە شێوازی جۆراو جۆر خراوەتەڕوو[1]، بەڵام ئێمە لێرەدا بێ لاساکردنەوە (تقليد)ی هیچ کام لەو سەرچاوانە بە شێوازی تایبەتی خۆمان ئەو مەسەلەیە دەتوێژینەوەو وەڵامی پر سیاری ناوبراو دەدەینەوە، ئنجا دوای وەڵامدانەوەش لە چەند خاڵێك دا پتر وەڵامەکە بەهێز دەکەین.

**وەڵامی ئێمە لە ڕوانگەی جەماوەری مسوڵمانانەوە ئاوایە، دەڵێین:**

شتێکی ئاشکرایە کە ئەم بوونەوەرەی تێیدا دەژین سێ جۆرە دروستکراو (مخلوق)ی تێدا هەن:

أ- تۆبزی لێکراوی نائاگا، کە ماددەی بێگیانو ڕووەکە، بۆ وێنە خۆر هەموو کاتێك دەبێ لە سووڕانەوە دابێ، بێ ئەوەی هەست بکاتو ئاگاداری ئەو کارکردنەی خۆی بێ.

1) بۆ نموونە سەیری (شرح العقائد النسفية)ی عمر النسفي بکە، ل (73-134)، هەروەها سەیری (المواقف في علم الكلام) بکە، ل (148-157)، نووسراوی القاضي عبدالرحمن بن أحمد الأيجي، چاپی بەیروت.

تێبینی: مسوڵمانانی (شیعە) مەزەبیش بە تایبەتی دوازدە ئیمامی یەکان کە بە (الشيعة الأثنا عشرية) ناسراون، هەمان هەڵوێستو بیروڕایان لەوبارەوە هەیە، بۆ وێنە سەرنجی (عدل الهي) نووسراوی (مرتضى مطهري) بدە کە بە زمانی فارسی دایناوە، بەڵام بە زمانی عارەبیش وەرگێڕاوە، هەروەها لە تەفسیری (الميزان)ی طباطبائيدا لە چەندان جێگادا ئەو مەسەلەیە باسکراوە.

ب- تۆبزی لێکراوی ئاگا، کە گیا ندارانن[1]، بۆ وێنە: مێ شەنگوینە (هەنگ) بەپێی سروشتو غەریزەیەکی خوارِسك شیلەی گوڵان دەمژێو هەنگوین دروست دەکات، هەرچەندە هەستیش بە کردەوەی خۆی دەکات، بەڵام بە ناچاریو تۆبزی لێکراو (مجبور)یی.

ج- ئازادی ئاگا: کە ئینسانەو هەزارەهاکردەوەو ڕەفتاری چاكو خراپی لێ دەپشکوێتەوە بە ئاگاداریو ویستی خۆی.

کەواتە بە شێوەیەکی گشتی هەرچی لە بوونەوەردا هەیە دوو بەشە:

یەکەم: تۆبزی لێکراو (مجبور)ەو هیچ ئازادییەکی نیە لەو جووڵانەوەیدا کە پێی هەڵدەستێ، جا یان وێرِای تۆبزی لێکراوی بێئاگاشە یان ئاگادار.

دووەم: تۆبزی لێ نەکراو (غير مجبور)ەو لە جووڵانو کارکرد ندا هەم ئازادەو هەم ئاگادار.

ئنجا ئەگەر بە وردی سەرنج بدەین، ئازادیی ئینسان لە ئا قار قەزاو قەدەری خوادا بە جوانی دەبینرێ، واتە ئەگەر بە وردی تێفکرین دە توانین بە ئاسانی لە هەمان کاتدا کە بڕوا بەبێ سنووریی زانیاریو ویستی خوا دێنین، بڕوا بە ئازادیی ئینسانو دادگەرییو کار بەجێیی خواش ب ێنین، بێئەوەی یەکێك لە سیفەتە بەرزو پەسەندەکانی خوا گچکە بکەینەوە لە پێناوی سیفەتێکی دیکەدا، وەك موعتەزیلەو جەبەرییەکان دەیانکرد، با بزانین چۆن!

---

1) لە فریشتەو شەیتانەکانیشدا زانایان ڕای جوێ جوێیان هەیە، بەڵام جند (جن) وە کو مرۆ ڤ وان، چونکە ئەوانیش (مکلف)ن، وەك خوا فەرموویەتی: **﴿وما خل قت ا لجنَّ والأ نس إلا ليعبدون﴾** (الذاريات- 56).

ڕاستە هەموو شتێك لە بوونەوەردا حەتمەن لەژێر ڕكێفی زانیاری و ویستی خوا دایەو زانیاری و ئیرادەی خوا لە ئەزەلەوە پەیوەندییان بە هەموو شتێکەوە هەبووەو هەرچی هەیە بەپێی زانیاری و ویستی ئەزەلیی خوا دروست بووە، بەڵام گرنگ ئەوەیە سەرنج بدەین دا خۆ زانیاری و ئیرادەی خوا چۆن و بە چ جۆرێك پەیوەندییان بەو شتانەوە بەستوە! با چاك وردبینەوە! خوا لە ئەزەلەوە بە پێی زانیاری و ویستی خۆی بڕیاری وا بووە کە خۆر هەموو ڕۆژێ لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵبێ و لە ئێوارانیدا لە لای ڕۆژئاوا ئاوابێ بە جۆرێکی حەتمی و تۆبزی لێکراوو بێئاگا. وە خوا لە ئەزەلەوە بە پێی زانیاری و ویستی خۆی بڕیاری وابووە کە مێشەنگوینە شیلەی گوڵان بمژێ و، مێروولە دانەوێڵە کۆبکاتەوەو، کرمی ئاورێشم (دودە القز) ئاوریشم دروست بکات، و.... هتد، بەڵام بێئەوەی ئازادو سەربەخۆبن لە کردن و نەکردنی ئەو کارانەیان دا، ئەوەندە هەیە هەست بەو کارانەی خۆیان دەکەن و ئاگادارن.

وە خوا لە ڕۆژی بەرێ وە بەپێی زانیاری و ویستی خۆی بڕیاری وا بووە مرۆڤ بژی و هەستێ و دانیشێ و کردەوان ئەنجام بدات، بەڵام بە ویستی ئازادانەی خۆی و بە ئاگادارییەوە، بە واتایەکی دی کە خوای کاربەجێ ویستی وابووە کە ئینسان بخولقێنێ و لەو خولقێنرانەیدا ناچار بێ و هیچ ئازادییەکی نەبێ، هەروەها لە هەڵبژاردنی نیشتمان و زمان و قەدو قیافەو ڕەنگدا هیچ ئازادییەکی نەبێ، بەڵام لە هەمان کاتدا ویستوویەتی کە بە ئیرادەو ویستی خۆی بژی و بجووڵێتەوە نەك بە تۆبزی و زۆرلێکراویی.

مادام وابێ ئیرادەو زانیاری خوا نەبوونە هۆی لابردنی ئازادیی‌و ئیرادەی ئینسان، چونکە زانیاری‌و ئیرادەی خوا بەڵێ ڕاستە پەیوەندییان بە هەموو شتێکەوە هەیەو هیچ شتێك -تەنانەت چاکەی چاکەکاران‌و خراپەی تاوانبارانیش- بەبێ زانیاری‌و ئیرادەی وی نایەتەدی، بەڵام پەیوەندی بەستنی زانیاری‌و ویستی خوا بە دروستبوونی هەرشتێکەوە لە دوو حاڵان بەولاوە نیە:

1- یان پەیوەندییەکە لەسەر بنچینەی ناچاریی‌و تۆبزیی کاری.

2- یان پەیوەندییەکە لەسەر بنچینەی ویستێکی ئازاد.

جا ئەگەر پەیدابوونی ئەو شتە بەهۆی پەیوەندی بەستنی زانیاری‌و ویستی خواوەبێ بە شێوەیەکی حەتمی‌و تۆبزیی ئەوە دیارە ئەو شتە پەیدا دەبێ بە شێوەیەکی ناچاریی‌و بە زۆر لێ کران، وەك جووڵان‌و گێڕان‌و سووڕانی ئەستێرەو خڕۆکەکان‌و چالاکی‌و جم‌وجوڵی ڕووەك‌و زیندەوەران.

وە ئەگەر پەیدابوونی ئەو شتە بەهۆی پەیوەندی بەستنی زانیاری‌و ویستی خواوەبێ بەشێوەیەکی ویستیارانەی ئازاد، ئەوە دیارە ئەو شتە بە شێوەیەکی ئازادانە پەیدا دەبێ، وەك کردارو ڕەفتاری مرۆڤەکان چ چاك چ خراپ.

پوختەی مەبەست: ئێمە نابێ بەس بیر لە پەیوەندی بەستنی زانیاری‌و ویستی خوا بە پەیدابوونی شتەکانەوە بکەینەوە، بەڵکو پێویستە بشزانین داخۆ ئەو پەیوەندی بەستنە لەسەر بنچینەیەکی حەتمی‌و تۆبزیی بووە یان لەسەر بنچینەیەکی ویستیارانەی ئازاد.

کەواتە: بەڵێ خوا لە ئەزەلەوە زانیاری‌و ئیرادەی وابووە کە فلان کەس بڕوادار بێ‌و کردەوەی چاك بکات، وە فیسار کەس بێبڕوا بێ‌و کاری نارەوا

بکات، بەڵام خوا ویستی وابووە کە هەرکامێکیان بە ئیرادەو هەڵبژاردنی خۆی ئەو شتە بکات کە زانیاریو ویستی خوا لە ئەزەلەوە پەیوەندیی پێوە بەستوە، بۆ وێنە: دوو برا لە سەعات حەوتی بەیانی لە ماڵێ دە چنە دەرێ، بەڵام دوای کەمێك یەکیان بابا یەکی بێ تاوان دە کوژێو ئەوی دیکەشیان دەچێتە مزگەوتێو دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگاوێ دە کات، دیارە خوا لە ئەزەلدا زانیویەتی کە لە فلان کاتدا یەکێك لەو دوو برا یە (قەتل)ێك دەکاتو یەکیشیان دوو ڕکات نوێژ دەکات، وە ئیرادەشی لەسەر کردنی هەردووك کردەوەکان هەبووە، بەڵام هەر لە ئەزەلیشەوە زانیو یەتی کە هەر کام لەو دوو برایە لە فلان کاتەدا بەویستو هەڵبژاردنی ئازادانەی خۆیان ئەو دوو کارەدەکەن، وە ویستیشی وابووە.

کەواتە: ئێستا ڕوون بۆوەکە قەزاو قەدەری خوا دژی ئازادیی مرۆ ڤـ نیەو، بڕواهێنان بە زانیاریو ئیرادەی ئەزەلیو بێسنووری خوا نابێتە هۆی تێچوونی ئیرادەی مرۆڤ و دەستەپاچەبوونی، وە دیسان ڕوون بۆوە کە ئێمە ناچارنین بۆ بڕوا هێنان بەدادگەرییو کاربەجێ یی خوا لەتەسك کرد نەوەی زانیاریو دەستەڵاتی خوا وەخۆبکەوین وەك (القدرية) کان دەیانکرد، یان بۆ بڕواهێنان بەزانیاریو دە ستەڵاتی بێ سنووری خوا، داد گەریی و کاربەجێیی خوا بخەینە مەترسی یەوە وەك (الجبرية)کان دەیانکرد، بەڵکو لەیەك کاتدا بڕوا بە هەموو سیفەتە بەرزو تەواوەکانی خوای پەروەردگار دێنین بێجیاوازی.

ئێستاش دەچینە سەروکاری مەسەلەیەکی دیکەی یەکجار گرنگ کە پەیوەندییەکی پتەوی بە مەسەلەی قەزاو قەدەرەوە هەیە.

## (5) کاریگەریی مرۆڤ لە ئاقار بەدیهێنەرایەتی خوادا:-

وەك پێشتر گوتمان لە ڕوانگەی مرۆڤی مسوڵمانەوە خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە، بەڵام ئایا ئیرادەو توانای ئینسان چ جۆرە کاریگەریی و شوێنەوارێکی هەیە لەڕاست بەدیهێنەردا!!

هەڵبەتە وەك پێشتر سەلماندمان هەڵوێستی موعتەزیلان سەبارەت بە کاریگەریی تواناو ویستی مرۆڤ زیادەڕەوی (افراط)یەکی ئاشکرای تێدا بوو، ئاکامی یەکجار بەدیشی لێ پەیدا دەبوو، چونکە ئەوان ئینسانیان بە خالیقی کردەوەکانی خۆی لە قەڵەم دەدا، لە ئەنجامی ئەوەشدا هەم لە تواناو دەستەڵاتی خوا دادە شکێنرێ، هەم مرۆڤیش دەکرا یە نیمچە هاوبەش و هاوتایەکی خوای بێهاوتا، لە بەدیهێنەرایەتیدا.

وە بە پێچەوانەوە هەڵوێستی جەبرییانیش سەبارەت بە کەمدەستیی و بێ توانایی ئینسان کەمتەرخی (تفریط)ێکی زۆر ناقۆڵای تێدابوو، بەرهەمی زۆر ناماقووڵیشی لێ وەدی دەهات، چونکە ئەوان پێیان وابوو مرۆڤ هەرچی لێ دەپشکوێتەوە چ چاك چ خراپ، یەك تۆز بۆخۆی دەستی تێدا نیەو، بەس خوا دەیجووڵێنێ و ئیشی پێدەکات، لە ئاکامی ئەوەشدا هەم ئینسان بێ ئیرادەو دەستەپاچە دەکەوتە گۆڕێ و، هەم دادگەریی و کاربەجێیی خواش تێ دەچوو!!

جا ئێمە لێرەدا خوا پشتیوان بێ ڕاستترین و تەواوترین هەڵوێست لەوبارەوە پێشان دەدەین کە هەڵوێستی جەماوەری مسوڵمان (جمهور المسلمین)ە، بەڵام ئێمە بە شێوازی خۆمان دایدەڕێژین و نموونەیەکی بۆ دێنینەوە:

یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: باشە کە کەسێك کەسێکی دی دەکوژێ لە دوو حاڵان بەولاوە نیە: یان بەدیهێنەرو بەڕێوەبەری ئەو کوشتنە خوایە یان بابای کوژەرە، جا ئەگەر خوا بەدیهێنەری کو شتنەکە بێ ئەوە قسەی جەبرییەکان ڕاست دەرچوو، کە دەیانگوت هەرچی بەڕواڵەت ئینسان دەیکات لەڕاستیدا خوا پێی دەکات‌و، مرۆڤ هەر هێندە پەیوەندی بە کردەوەکانییەوە هەیە کە کۆڵکەداری ئێو ڕێژەنی ڕوو باریکی گەورە پەیوەندی بە جووڵانەوەی خۆیەوە هەیە.

وە ئەگەر بەدیهێنەرو پەیداکەری کوشتنەکە بابای کوژەر بێ، ئەوە مانای وایە قسەی موعتەزیلەکان ڕاست دەرچووو ئینسان بۆ خۆی خالیقی کردەوەکانییەتی، کەواتە ئێوە چۆن دەتوانن بڵێن نە ڕای جەبرییان ڕاستەو نە ڕای موعتەزیلان؟!!

لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر نەواشەو نەواش، نەبەس خوا بە تەنێ ئەو کارەی ئەنجام داوە، تاکو قسەی جەبرییان ڕاست دەرچێ، وە نە مرۆڤیش بە تەنێ ئەنجامی داوە، تاکو قسەی موعتەزیلان ڕاست دەرچێ، بەڵکو لەڕاستیدا هەم خواو هەم مرۆڤیش کاریگەریی‌یان هەبووە لە هێنانەدی ئەو کارانەدا، بزانین چۆن؟

**بەڵام سەرەتا پێویستە دوو مەسەلە ڕوون بکرێتەوە:**

1- زانیاری‌و ویست‌و توانا (قدرة)ی خوا وەکو سێ ئاڵقەی زنجیرێك پێکەوە پەیوەستن‌و لێك جوێ نابنەوە، چونکە هەرچی زانیاری خوا پەیوەندیی پێوە بەست ئیرادەشی پەیوەندی پێوە دەبەستێ‌و هەرچی ئیرادەشی ڕووی تێکرد تواناشی ڕووی تێدەکات بۆ بەدیهێنانی، کەواتە هەر چی لە

ئەزەلەوە زانیاری‌و ویستی خوا پەیوەندییان پێوە بەستبێ حەتمەن بە تواناو دەسەڵاتی ویش پەیدا دەبێ.

2 ـ ویست (إرادة)و ڕەزامەندی (رضاء)ی خوا لێك جودان، چونکە هەرچی ئینسان‌و غەیری ئینسانیش ئەنجامی دەدات، خێربێ یان شەڕ، حەتمەن بەپێی ئیرادەی خوایەو، ئەوی خوا ویستی لەسەر نەبێ نابێ، بەڵام مەرج نیە هەرچی بە پێی ویستی خوا دێتەدی پێشی ڕازی بێ، چونکە خوا بەس بە چاکە ڕازییەو فەرمانی پێدەکات‌و، بە خراپە ناڕازییەو پێشگیریشی لێ کردوە، وەك فەرموویەتی: ﴿**وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ وَإِن تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ**﴾(الزمر-7) وە خوا ڕازی نیە بەندەکانی کافر بن، وە ئەگەر سوپاسی بکەن لێتان ڕازی دەبێ‌و بۆتان قبووڵ دەکات.

(ئەم مەسەلەیە تا ڕادەیەکی چاك لە بەرگی سێیەمدا تۆێژراوەتەوەو ڕوونکراوەتە).

**ئێستاش با بچینە سەر وەڵامدانەوەی پرسیارەکە:**

دەڵێیـن بەڵێ ئەو کوشتنە -کە نموونەیەکە بۆ کردەوەکانی ئینسان- هەم خواش هەم مرۆڤیش بەشدارن لە وەدیهێنانیدا، چونکە جارێ لەو لایەنەوە کە هەر لە ئەزەلەوە زانیاری‌و ویستی خوا پەیوەندییان بەو کارەوە بەستوەو، بە توانای خواش هاتۆتەدی، ئەوە خوا تێیدا بەشدارە، دیسان لەو لایەنەشەوە کە بابای کوژەر بەویست‌و هەڵبژاردنی خۆی و، بەو ئەندامە تایبەتییانەی خۆی ئەو کارەی ئەنجام داوە، مانای وایە ئەویش تێیدا بەشدارە، کەواتە هەرچەندە بابای کوژەر بەتەنێ‌و بەبێ هاوکاری‌و یاریدەی خوا ئەو کارەی نەکردوە، بەڵام ئەگەر ئەویش نەبا ئەو کارە نەدەکرا، چونکە خوا بۆ

خۆی ویستی وابووە، کە ڕاستەوخۆ ئەو کارەنەکاتو ئیرادەو توانایە کەی سەبارەت بەوکارە لە ڕێی وە بە هۆی ئیرادەو توانای مرۆڤەوە بێتەدی.

کەواتە خوا چونکە نەیویستوە کە ئەوکارە بە تەنێ بکاتو ویستوویەتی لە ڕێی بابای کوژەرەوە ئەنجامی بدات، مانای وایە ئەگەر بابای کوژەر نەبووایەو ویستی لەسەر جێبەجێکردنی ئەو کارە نەبوایە ئەو کارە نەدەهاتە دی.

ئاشکراتر بڵێم: لەو لایەنەوە کە ئەو ئیرادەیەی کابرای کوژەر تواناو هێزی خۆی پێ ئاراستە (توجیە)ی کو شتنی کوژراوە کە کردوەو، ئەو ئەندامانەو ئەو ئامرازەی کە کارە کەی پێ جێبەجێ کردوونو، ئەو هەلومەرجەو بارودۆخەی کە ڕەخساوە بۆ کردنی کارە کە، ئەمانە هەموویان دروستکراوی خوان، لەو لایەنەوە خوا بەدیهێنەری ڕاستەقینەی کارەکەیە، بەڵام لەو لایەنەشەوە کە کابرای کوژەر بۆ خۆی ئەندامەکانی خۆی ڕەکار خستوون بۆ جێبەجێکردنی ئەو کارە، بێئەوەی هیچ کەسێك تۆبزی لێ بکات، ئەوە لەو لایەنەشەوە کابرای کوژەر سەر چاوەی سەرهەڵدانی کارەکەیەو ئەگەر ئەو نەبا کارەکە جێبەجێ نەدەکرا، بەڵام لەبەرئەوەی نا کە خوا نەتوانێ بە تەنیا بیکات - پاکی بۆ وی- بەڵکو لەبەرئەوەی کە بۆ خۆی ویستی وابووە ڕاستەوخۆ بۆ خۆی نەیکات[1] .

---

1) لە کتێبی (الأسلام كما يَتَجلَّى في كتاب الله)دا بە جۆرێکی دیکە چارەسەری ئەم مە سەلەیەم کردوەو پوختەکەی ئەوەیە: کە کردەوەکانی مرۆڤ شتی (جعلي)و (کسبـي)ینو (خلق) نین تاکو پێویستی یان بە بەدیهێنەر (خالق) بێ کە تەنیا خوایە، بەڵکو بەس پەکیان لەسەر پەیدا کەرو ئەنجامدەر (کاسب)و (فاعل) کەوتوەو ئەویش مرۆڤە! شایانی باسیشە ئەم مەسەلەیە پێشتر لە کتێبان دا نە دیوەو بەرهەمی لێوردبوونەوەی قورئانە لە زینداندا.

ئنجا با بۆ زیاتر ڕوونبونەوەی مەبەست، وێنە یەك بێنینەوە: گریمان کورسی یەك کارەبایی هەیە کە جێی مرۆڤێك دەبێ تێیدا دانیشێ‌و، کابرای دانیشتوو بۆ کوێی بوێ بۆ وێ بچێ، بۆ مەی خواردنەوە، یان بۆ جیهاد، وە ئەو کورسی‌یە بەهۆی دینەمۆیەکەوە کار بکات‌و بجوولێ، کە مرۆڤێکی بێدار چاودێری بکات‌و بەسەری ڕابگات، وە کابرای دانیشتوو بۆ کوێی بوێ یارمەتی بدات‌و کورسییەکەی بۆ بئاژوێ‌و جارجارەش ئاگاداری بکاتەوەو پێی بڵێ: کوڕە هەرچی بکەی‌و بۆ کوێ ئیرادە بکەی من یارمەتیت دەدەم‌و دەستت ناگرم، بەڵام فلان کارە مەکە خراپەو سزای لەسەرەو فیساری ئیشە بکە چاکەو پاداشتی لەدوایە.

بێگومان کابرای نێو کورسی دیارە بە ویستی خۆی‌و بە ئارەزوی خۆی چاکەو خراپەکانی دەکات، بەڵام نەك بە تەنیاو سەربەخۆ، بەڵکو بە یارمەتی‌و هاوکاری ئەو کەسەی کە لەسەر دینەمۆیەکەیەو کورسییەکەی بۆ دەگێڕێ.

ئنجا دیارە کابرای نێو کورسییەکە ناتوانێ بڵێ: من بۆ خۆم بەتەنێ بێ یارمەتی هیچ کەس چاکەو خراپەکانم کردوون، وە ناشتوانێ بڵێ: من بە تۆبزیی ئەو کردەوانەم پێ کراون‌و هیچ دەستم تێیاندا نەبووە.

دەجا مەسەلەی کاریگەریی مرۆڤیش سەبارەت بە کردەوەکانی بەهەمان شێوەیەو بە پێویستیشی نازانم لەم ئەندازەیە زیاتر وەدوای ئەم باسە بکەوم.

## (6) چەنــد بەڵگــەیەکی دیکــە لەســەر ئــازادیی مرۆڤـ

هەرچەندە هەرکەس بە وردی سەرنج لەوە بدات کە را بردرد، دوود لێی نامێنێ لەوەدا کە ئینسان ئازادەو بە ئیرادەی خۆی دەژی، بەڵام بۆ زیدە دڵنیاییو پتر ڕوونبوونەوەی مەبەست چەند بەڵگەیەکی دیکەش دەخەینەڕوو:

**یەکەم:** لە قورئانیدا وێڕای ئیسپاتکردنی ئیرادەی خوا ئیرادەی مرۆڤیش ئیسپات کراوە، بۆ وێنە دەفەرموێ: **﴿إِنْ هُوَ إِلاَّ ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ۞ لِمَن شَاء مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ۞ وَمَا تَشَاؤُونَ إِلاَّ أَن يَشَاء اللهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾** **(التكوير– 27–29)**، واتە: ئەم قورئانە جگە لە ئامۆژگاری بۆ هەموو خەڵکی جیهانیان چیدی نیە، بۆ هەرکەسێك لە ئێوە کە بیەوێ ڕاست بێ، وە ناتانەوێ مەگەر خوای پەروەردگاری جیهانیان بیەوێ. وەك دەبینین خوای دادگەرو زانا وێڕای خۆی، ئیرادەی ئینسانیشی باس کردوە.

دیسان خوا دەفەرموێ: **﴿فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ﴾** **(الكهف– 29)**، واتە: جا کێ دەیەوێ با بڕوا بێنێو کێ دەیەوێ با کافربێ. کەواتە دیارە مرۆڤ توانای چاك بوون و خراپ بوونی هەیە.

ئنجا کە هەندێك جاریش دەبینین بەس باسی ئیرادەی موتڵەقی خوا کراوە بۆ وێنە: **﴿وَيَفْعَلُ اللهُ مَا يَشَاء﴾(ابراهيم–27)**، (خوا هەرچی بیەوێ دەیکات)، یان **﴿فَيُضِلُّ اللهُ مَن يَشَاء وَيَهْدِي مَن يَشَاء﴾(إبراهيم–4)** (خوا هەر کەسێکی بیەوێ گومڕای دەکاتو هەرکەسێکی بیەوێ ڕێ ڕوونی دەکات)، یان **﴿وَلا تَقُولَنَّ لِشَيْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَلِكَ غَدًا ۞ إِلاَّ أَن يَشَاء اللهُ...﴾(الكهف–24)** (وە بە هیچ شتێك مەڵێ بەیانی دەیکەم مەگەر

بلێی- ئەگەر خوا بیەوێ)... ئەوە لەبەر ئەوە یە کە لە ڕا ستیدا ئیرادەی خوا بێسنوورەو ئەو بڕە ئیرادە (الأختيار الجزئي)یەش کە بە مرۆڤ بەخ شراوە، بۆ ئەوەی بتوا نێ ئەرکی جێ نشینایەتی پێ بەڕێوەبەرێ، ئەویش هەر بە ویستی خوا بووە، کەواتە هەرچی ئینسان بیکات چاکە بێ یان خراپە ئیرادەی خوای هەر لەگەڵ دا یە، هەڵبە تە ئەگەر خوا ویستباشی ئیرادە بە مرۆڤ نەبەخشێ وای لێ دە کرد بە تۆبزی چاکەکار بێو بە زۆرلێکراو یی بەڕێوەبـ چێ، وەك دە فەرموێ: ﴿**وَلَوْ شَاء اللهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً**﴾ (**النحل- 2**) (وە ئەگەر خوا ویستبای ئێوەی دەکردە یەك کۆمەڵ - ی بڕوادار-).

**دووەم:** خوای قسە لەجێ هەرجارێك باسی کردەوەی ئینسانەکان بـ کات چ چاك چ خراپ، پاڵی دەداتە لای خۆیانو بە بەرهەمی وانی دادەنێ، بۆ وێنە: ﴿**مَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ وَ مَنْ أَ سَاء فَعَلَيْ هَا**﴾ (**الجاث یة- 15**) (هەرچی کردەوەی چاك بکات بۆ خۆیەتیو ئەوی خراپیش بکات لەسەر خۆیەتی)، وە ﴿**وَوُفِّ يَتْ كُلُّ نَ فْسٍ مَّا عَمِ لَتْ وَ هُوَ أَعْ لَمُ بِ مَا يَفْعَلُونَ**﴾(**الزمر-70**)، (وە هەموو کە سێك بەپێی کردەوەی خۆی پاداشتی درایەوەو هەر ئەویش زا ناترە بەوەی کردوویا نە)، دی سان فەرموویەتی: ﴿**أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاء مَّحْيَاهُم وَمَمَاتُهُمْ ...**﴾(**الجاث یة- 21**)، (ئایا ئەوانەی کە خراپەیان کردوە پێیان وایە ژیانو مردن یان یەک سان بکەین لەگەڵ ئەوانەدا کە بڕوایان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردوون؟!).

وەك دەبینین خوای زاناو دادگەر کردەوەو ڕەفتاری چاکەکاران‌و بەدکاران بە بەرهەم‌و زادەی خۆیان لە قەڵەم دەدات، ئنجا هەڵبەت خوا قسەی ناڕاستی لێ ناوەشێتەوەو ئەگەر ئەو کردەوانە هی مرۆڤەکان نەبان پاڵی نەدەدانە لایان‌و نەیدەفەرموو ئێوە ئەو کردەوانەتان کردوون.

**سێیەم:** ئەگەر ئینسان ئازاد نەباو خاوەنی ئیرادە نەبایەو خوا -وەك جەبرییەکان دەڵێن- بە تۆبزی تاوان‌و خراپەی بەتاوانباران کردبا، پێویستی نەدەکرد بە پێغەمبەراندا -علیهم الصلاة والسلام- بەرنامەو ئایینیان بۆ بنێرێ‌و پێیان بفەرموێ: وا بکەن‌و وامەکەن! چونکە مادام بۆ خۆی بە تۆبزی خراپەیان پێبکات چ حەوجێ بەوەی دەکات پێغەمبەرانیان پێوە ماندوو بکات!!

ئنجا ئەگەر ئینسانێکیش بە زۆری کردەوەیەك بە یەکێك بکات‌و دوایی هەر بۆ خۆیشی لەسەر ئەو کارە خۆی لێ تووڕە بکات، هەموو کەس بە بەزانی دادەنێ‌و لۆمەی دەکەن، کەواتە چۆن خوای بەخشندە بە زۆر کردەوە بە خەڵك دەکاو لەسەر ئەو کردەوەیەش سزایان دەدات!

(سبحان ربّك رب العزة عما يصفون).

**چوارەم:** ئەگەر سەرنج بدەینە قورئانی بەهێزو پیرۆز دەبینین زۆربەی زۆری کافرو هاوبەش پەرست‌و لاڕێبووان لەپێش هەموانیشدا شەیتان (جەبری)ین‌و تاوان‌و خراپەی خۆیان پاڵ دەدەنە لای خواو خۆیان بەبێ تاوان دەزانن‌و ئیرادەی بێسنووری خوا دەکەنە بەڵگەی دەستەپاچەیی‌و هیچ لەدەست نەهاتوویی خۆیان، بەڵام خوای دادگەرو قسەلەجێ بەرپەرچیان دەداتەوەو زۆر بەتوندیی تاوانباریان دەکات‌و ئەم

ڕەفتارەیان -واتە قەزاو قەدەرو ئیرادەی خوا کردنە بەهانەی تاوانبارییی- بە زادەی نەفامییی‌و نەزانییی یان لە قەڵەم دەدات، بۆ وێنە: ﴿قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِي لأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي الأَرْضِ وَلأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ (الحجر- 39) (شەیتان گوتی: ئەی پەروەردگارم چونکە گومڕات کردم، تاوان‌و خراپەیان لەسەر زەوی بۆ دەڕازێنمەوە، وە تێکڕایان گومڕا دەکەم).

وەك دەبینین شەیتانی بەد گومڕابوونی خۆی لە خوا دەزانێ‌و دەڵێ تۆ گومڕات کردم!

دیسان خوای زانا دەربارەی هاوبەش پەرست (مشرك)ەکان دەفەرموێ: ﴿سَيَقُولُ الَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَاء اللّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلاَ آبَاؤُنَا وَلاَ حَرَّمْنَا مِن شَيْءٍ كَذَلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِم حَتَّى ذَاقُواْ بَأْسَنَا قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَا إِن تَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إَلاَّ تَخْرُصُونَ ۞ قُلْ فَلِلّهِ الْحُجَّةُ الْبَالِغَةُ فَلَوْ شَاء لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ (الأنعام: 148-149)، واتە: (ئەوانەی هاوبەش پەرستن لەمەودوا دەڵێن: ئەگەر خوا ویستبای نە ئێمەو نەباب‌و باپیرانمان هاوبەشمان پەیدا نەدەکردو هیچ شتێکمان حەرام نەدەکرد، ئەوانەی پێشووشیان هەر ئاوا بە درۆزان بوون هەتا سزای ئێمەیان چێشت، بڵێ ئایا لەوبارەوە- هیچ زانیاریتان هەیە پێشانمان بدەن! بەڵکو بێجگە لە شوێنکەوتنی گومان چیدیتان بەدەستەوە نیەو بێجگە لە درۆکردن چیدی ناکەن، بڵێ: خوا بەڵگەی هەرە بەهێزی بەدەستەوەیە، خۆ ئەگەر ویستبای -تۆبزیتان لێ بکات- هەمووتانی دەخستە سەری ڕێی ڕاست).

وەك دیتمان خوای بەخشندەو دادگەر زۆر بە ڕوونی ڕای دەگەیەنێ کە ئەوانەی پێیان وایە خوا بە زۆر تووشی هاوبەش پەرستی‌و تاوان‌و

سەرپێچیی کردوون، تووشی سزای خوا دەبن‌و ئەوانە کە سانێکن هیچ زانیارییان لەوبارەوە نیەو کەوتوونەتە شوێن خولیاو خەیاڵ‌و گو مانی بێ‌جێ.

بەڵێ کەس بۆی نیە تاوان‌و خراپەی خۆی لەملی قەزاو قەدەری خوا بئالێنێ، چونکە ئەوە ڕچەو عادەتی شەیتان‌و شوێن کەووتوانییەتی، وە ئەگەر خوا ویستبای زۆر لە خەڵکی بکات، هەموو بە تۆبزی دەخستنە سەر ڕێی خواناسی، بەڵام ویستی وابووە کە خەڵکی بە ویستو هەڵبژاردنی خۆیان ڕێی ڕاست یان چەوت بگرنە بەر، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿لِمَن شَاء مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ﴾(المدثر– 3)، واتە (بۆ هەرکامێکتان کە بیەوێ پێش بکەوێ یان دوا بکەوێ.

**پێنجەم:** ئەگەر تەماشای مێژووی گەلان بکەین هەر لە کۆنەوەو ئێستاش دەبینین لە هەموو جێ یەك کە ئاوەدانی لێ بووبێ داد گا (محكمة)ی لێ بووە بۆ دادپرسی‌و سزادانی تاوانباران‌و لە سەر کردنەوەی زۆر لێکراوان، ئنجا ئەو دیاردەی دادگا هەبوونە لە هەموو ئاوەدانی‌یەکدا خۆی پتەوترین بەڵگەی کرداری (عملي)یە لەسەر ئەوە کە مرۆڤایەتی تێکڕا بڕوای بەئازادیی ئینسان هەبووەو هەیە، دیسان ئەگەر مرۆڤایەتی لە سەرەتای مێژووەوەو تا ئێستاش مەزەبی (جبر)یان پێ هەڵە نەبایە قەت نەدەگونجا هیچ تاوانبارێك دادپرسی لەگەڵ بکرێ، چونکە بە هەر تاوانبارێکت گوتبا: بۆچی فلان کارەت کردوە؟! وەڵامێکی حازر بەدەستی پێ‌دەبووو دەیگوت: (خوا ویستی لەسەربوو، دەبوو هەروابێ!).

**شەشەم:** بەڵگەيەكی ديكە لەسەر ئەوەی كە ئينسان ئازادەو ويستێكی سەربەخۆی هەيە ئەوەيە كە خوای بەخشندەو ميهرەبان لەو حاڵانەدا كە ئينسان لە سۆنگەی هەر شتێكەوەبێ ئەو ئازادييەی نامێنێو ئيرادەی لەدەست دەردەچێ، يان لە كاتێكدا كە ئيرادەكەی كامڵ نيەو ناتەواوە، باری تەكليفو فەرمانبەرايەتی لەسەر لادەبات، بۆ وێنە پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتی: **(إن الله وضع عن أمتيّ الخطأ والنسيان وما ا ستكرهوا عليه)**. رواه ابن ماجه عن ابن عباس، و رواه ابن حبان وكذا ا لحاكم و قال صحيح على شرط الشيخين، وأخرجه الطبراني والدار قطني والحاكم بلفظ (تجاوز) بدل (وضع) وقال النووي إنه حسن، واته: (بێگومان خوا سزای ئەو تاوانانەی لەسەر ئوممەتم لا بردوە كە بە هەڵە يان لە بيرچوونەوە يان بە تۆبزيی لێكران دەيانكەن).

ديسان فەرموويەتی: **(رفع القلم عن ثلاثة: عن المجنون المغلوب على عقله حتى يبرأ، و عن النائم حتى يستيقظ، وعن الصبيٍّ حتى يحتلم)** رواه احمد و ابو داوود والحاكم عن عائشة، و رواه النسائي و ابن ما جة باختلاف يسير، بڕوانە (كشف الخلفا ومزيل الألباس) ب1، ل522 - 523. واتە: (قەڵەم ی سزا بۆ نووسين- لەسەر سێيان هەڵگيراوە، لەسەر شێتێك كە هۆشی لانەماوە، تا چاك دەبێتەوە، وە لە سەر نووستوو تا بێدار دەبێتەوە، وە لەسەر منداڵ تا باڵغ دەبێ).

**حەوتەم:** وە لە كۆتاييدا دەڵێم: ئاشكراترين بەڵگە لەسەر ئەوە كە ئينسان مەخلووقێكی دەستەپاچەو بێئيرادە نيەو خاوەنی ويستێكی ئازادەو بە هەڵبژاردنی خۆی دەژیو بەڕێوەدەچێ، ئەوەيە كە مرۆڤ زۆر بە ئا سانی

هەست بە جوودایی جوولانی خۆی دە کات لە کاتێکی نا چارییو بێئیرادەیی یەوە بۆ کاتێکی ئازادانەی خاوەن هەست، بۆ وێنە کێ هەیە نەتوانێ هەست بە جیاوازی لێدانی دڵیو جوولانی زمانی نەکات؟! بێگومان لێدانی دڵ کارێکە لەژێر ئیرادەی مرۆڤدا نییە، بەڵام جوولاندنی زمان بۆ قسەکردن یان نەکردن لەژێر ڕکێفی ویستی مرۆڤدایە، ئنجا هەر بۆیەش هەموو ئەو شتانەی کە مرۆڤ ویستی بەسەریاندا نیەو لە توانایدا نیین خوا لێیی داوا نا کاتو لەوبارەوە لێپر سینەوەی لە گەڵ نا کات، وەك جوانییو دزێوییو لەڕییو قەڵەوییو... هتد. بەڵام ئەو شتانەی کە دەکەونە بەر قەڵەمڕەوی ئیرادەی ئینسانەوە خوا لە مرۆڤ یان داوا دە کات، وەك دڵو دەروون پاکییو زمان ڕاستییو ڕەفتار چاکییو. . . هتد.

شایانی باسیشە ئەوانەی کە پێیان وایە ئایەتەکانی قورئان پشتگیریی ڕای موعتەزیلان دەکەن ئەوە بەس ئەو ئایەتانەیان لەبەرچاو گرتوون کە باسی ئازادییو سەربەخۆیی ئیرادەی ئینسان دەکەن، وە ئەوانەی کە پێیان وایە قورئان لایەنگریی لە هەڵوێستی جەبرییان دەکات ئەوە بەس چاویان لەسەر ئەو دەقانە چڕ داگرتوە کە دەربارەی بێ سنوورییو هەمەلایەنی ویستو توانای خوا دەدوێن، بەڵام ئەگەر بێتو تێکڕای ئایەتەکانی قورئان لەوبارەوە لەبەرچاو بگرن بەبێ جیاوازی ئەوە حەتمەن سەریان بەو هەڵوێستە مام نێوەندی (وسط)ە دەگات کە ئێمە پێی گەیشتینو هەڵمان بژاردو وەك گوتمان ڕاو هەڵوێستی تێکڕای جەماوەری مسوڵمانانە بە سوننیو شیعەوە.

## (7) ئایا بڕوابوون بە قەزاو قەدەر دەبێتە هۆی پاڵدانەوە؟!

هەرچەندە کەسێك بە وردیو تێگەیشتنەوە ئەو باسانەی خوێندبێتەوە کەڕابردن، وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەی بە (نەء) لەلا بۆتە شتێکی بەڵگە نەویستو، دەڵێ بە پێچەوانەوە بەڵکو بڕوا هەبوون بە قەزاو قەدەر مایەی جووڵانو کارکردنو خەباتو ڕەنج دانە، بەڵام لەبەر زێدە گرنگیو بایەخی ئەم باسە بە پێویستی دەزانم لە چەند خاڵێکدا پتر ڕوونی بکەمەوە کە بڕوابوون بە قەزاو قەدەر -بەڵام بەو شێوە ڕاستەی کە پێشتر خستمانەڕوو- بەهیچ جۆرێك نابێتە بیانووی کارنەکردن و پاڵدانەوەو نەجووڵان، بەڵکو ڕاست بە بەراوەژووەوە دەبێتە هۆی چالاکیو جم وجۆڵ.

**یەکەم:** لەساڵی (17)ی کۆچیدا عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ چوو بۆ (شام)، جا کاتێك گەیشتە ناو چەی ( سَرْغ) سەرکردەکانی گەیشتنیو هەواڵیان پێدا کە نەخۆشیو دەرد بڵاوبۆتەوەو خەڵك لەنێودەچێ، عومەر خوای لێ ڕازی بێ فەرمووی: (خەڵکینە من دەگەڕێمەوە ئێوەش بگەڕێنەوە! ئەبوو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح خوالێی ڕازی بێ پێی وت: ئایا لەقەزاو قەدەری خوا ڕادەکەی؟ گوتی: بەڵێ لە قەزاو قەدەری خوا ڕادەکەم بۆ لای قەزاو قەدەری خوا! ئایا نابینی ئەگەر کەسێك بچێتە دۆڵێکەوە کە دوو لاپاڵی هەبن، یەکیان پڕ لەوەڕو یەکیان بێ لەوەڕ بێ، ئایا ئەگەر لەلایە پڕ لەوەڕەکەدا مەڕەکانی بلەوەڕێنێ، هەر بە قەزاو قەدەری خوا نیەو ئەگەر لەلای بێ لەوەڕو قاقڕەکەدا بیانلەوەڕێنێ هەر بە قەزاو قەدەری خوا نییە؟! وای ئەگەر

کەسێکی دیکە ئەو قسەیەی دەکرد ئەی ئەباعوبەیدە؟! (واتە: ئە گەر یەکێکی دیکە ئەو قسەیەی کردبا وام لێ قبووڵ نەدەکرد)[1].

بەڵێ خوێنەری بەڕێزم ئەمەیە تێگەیشتنی ڕاستەقینە لە چەمك‌و واتای قەزاو قەدەر، چونکە تۆ هەرچی بیکەی چاك بێ یان خراپ حەتمەن هەر بە قەزاو قەدەری خوا یەو، مەحالە هیچ شتێك لەم بوونەوەرەدا بکرێ بەبێ زانیاری‌و ویستی خوا، بەڵام گرنگ ئەوە یە مرۆڤ هەوڵ بدات بەس کردەوەو ڕەفتاری چاك‌و خوانا سانەی لێ بپشکوونەوە، دەنا قەزاو قەدەری خوا وەکو ئاسمان چوار دەوری مرۆڤی گرتوەو هەروەك چۆن چاکە بکەی یان تاوان هەر لە ژێربالی ئاسمان دای‌و توانای چوونەدەرت نیەی، قەزاو قەدەریش ئاوا دەوری گرتووی‌و لێی قوتار نابی، بەڵام هەڵبژاردنی چاك یان خراپی ئەو قەزاو قەدەرە بەدەست خۆتە.

**دووەم:** من نازانم لەم سەعاتەدا قەزاو قەدەری خوا چی بۆ بڕیار داوم، بەڵکو دوای ئەوەی سەعاتەکە بەسەرچوو ئەوجار دەزانم چیم بۆ بڕیار درابوو، ئەمەی گوتم شتێکی ڕوونە، بەڵام ئایا بەڕێکردنی سەعاتەکە بەدەست خۆم بوو یان نا؟! دیارە بەدەست خۆمە، جگە لە چەند حاڵەتێکی هەڵاوێرراو (استثنائي)و ڕیزپەڕ (شاذ)، کەواتە: من بەپێی بڕیارو کردەوەکانی خۆم جۆری قەزاو قەدەری خوام بۆ ئاشکرا دەبێ، جا کەیفی خۆمە دەتوانم کارێکی وابکەم هەر چاکە بکەم بۆ ئەوەی هەر قەزاو قەدەری چاك‌و دڵگیرم بۆ ئاشکرابن، وە دەشتوانم هەر خراپە

1) لە (صحيح البخاري)دا هاتوە.

بکەم، بەڵام کە هەر قەزاو قەدەری ناخۆش‌و نابەدڵیشم لێ ئاشکرابوون نابێ بێجگە لەخۆم ڕووی ڕەخنەو گلەیی لەکەس بکەم، ئێستا لەدەمی ئەم نووسینەدا وێنەیەکم بەدڵدا هات:

قەزاو قەدەری خوا کت‌و مت وەکو ئاوێنەیە چی لەئاقاردا ڕابگیرێ هەرئەوەی تێدا دەردەکەوێ، بابایەکی ڕێك‌و پێك‌و دیمەن جوان ئەگەر بچێتە بەرانبەر ئاوێنە بێگومان شێوەو بیچمێکی جوان لە ئاوێنەکەدا دەبینێ، بەڵام بابایەکی دزێوو قرژو قۆڵ و ناجوان کە بچێتە بەرانبەر هەمان ئاوێنە، ئاوێنەکە ناتوانێ شێوەو ڕوخساری ناقۆڵاو نابەرچاوی جوان‌و لەبار بکات، بەڵکو هەروای پێ شان دەدات، دە جا قەزاو قەدەری خواش بێ‌کەم‌و زیاد وەکو ئاوێنە کە وایە، مرۆڤ دەتوانێ وابکات کە بەجوانترین‌و پەسەندترین شێوە لە ئاوێنەی قەزاو قەدەری خوادا دەربکەوێ بەهۆی بڕواداریی‌و کردار چاکی یەوە، وە دەشتوانێ بەهۆی بێبڕوایی‌و تاوانبارییەوە چۆن دزێوو بەدفەڕە ئاوا لە ئاوێنەی قەزاو قەدەری خوادا ببینرێ.

**سێیەم:** ئێمە نازانین لە زانیاری ئەزەلی (لوح المحفوظ)[1]ی خوادا چ جۆرە چارەنووسێکمان بۆ دیاریکراوە، بەڵام خوا بەرنامەیەکی بۆ ڕەوان کردووین کە بەپێی ئەو بەرنامەیە دەتوانین بزانین چین‌و چۆنین‌و دەچینە کوێ‌و پاشەڕۆژمان چۆن دەبێ، چونکە ئەو بەرنامەیە بە ئاشکرا پێمان دەڵێ: مرۆڤی چاکەکارو ئیماندار خۆشەویستی خوایەو جێ‌و ماوای

1) هەندێك لە زانایانی پێشین (لوح المحفوظ) بەزانیاری خۆ دادەنێن‌و هەندێکیشیان دەڵێن شتێکە خوا هەموو شتێکی تێدا تۆمار کردوە بەڵام نازانین چۆن چۆنی یە.

بەهەشتی بەرینو ڕەنگینو ڕازاوەو نەبڕاوەیە وەبابای بێبڕواو بەدکار ناحەزی خوایەو جێگەی نێو ئاگری دۆزەخی بە ئازاری پڕ شینو هاوارە، وەك فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلاً﴾(الكهف- 107)، واتە: بێگومان ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە مەنزڵگایان باغەکانی فیردەوسە، ﴿فَأَمَّا مَن طَغَى ۞ وَآثَرَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا ۞ فَإِنَّ الْجَحِيمَ هِيَ الْمَأْوَى﴾(النازعات: 38-39)، واتە: جا هەرکەس یاخی بێو ژیانی دنیا هەڵبژێرێ ئەوە بێ شك بڵێسەی دۆزەخ جێیەتی.

جا ئێمە بە بەراوردکردنی بڕیارو کردەوەکانمان لە گەڵ بەرنامەی پەیڕەوی خوادا زۆر بە سێنایی دەتوانین بزانین چ کەسینو بۆ کوێ دەچینو چارەنووسمان چییەو چۆنە!

کەواتە ئێمە بۆچی گرنە لە شتێك بئاڵێنین کە نازانین چی تێدا نووسراوەو چ بڕیارێکی تێدا دراوە، وە بۆچی سەرنجی ئەو بەرنامەیە نەدەین کە دەزانین چی تێدایەو پێشمان دەڵێ: چینو چۆنینو بۆ کوێ دەچین؟!!

**چوارەم:** ئایا هیچ کەس هەیە لە کاروباری ژیانیدا پشت بە قەزاو قەدەری خوا ببەستێو بەتەمای ئەو بڕیارەی کە خوا لە ئەزەلدا بۆی داناوە پاڵی لێ بداتەوەو پشتێندی لێ بکاتەوە! وە بڵێ: پێویست ناکات کارو کاسبی بکەم چونکە ئەگەر قەزاو قەدەری خوا لە ئەزەلەوە وابووبێ کە من هەژارو کەمدەست بم کاریش بکەم هەروا دەبمو ئەگەر قەزاو قەدەریش وابووبێ کە من نەدارو تەنگ دەست نەبم کاریش نەکەم هەروا نابم؟!

یان ئایا کەس هەیە کە تینووو برسی بوو نەچێ خۆی تێر ئاوو نان بکاتو بڵێ: ئەگەر قەزاو قەدەری خوا وابووبێ کەمن تێردەبم، بەبێ خواردنو خواردنەوەش هەر تێر دەبمو ئەگەرنا خواردنو خواردنەوە دادم نادات، بخۆمو بشخۆمەوە هەر برسیو تینوو دەبم؟! یان کەس هەیە کە برینێکی تێبوو حەواڵەی قەزاو قەدەری خوای بکاتو بڵێ: ئەگەر خوا لە ئەزەلەوە زانیبیو ویستبی ئەم برینەم چاك بێتەوە، ئەگەر دەرمانیشی نەکەم چاك دەبێو ئەگەرنا تیمارکردن بێسوودە؟!

کەواتە هەروەك چۆن بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ژیانی دونیای، چاوان لەسەر قەزاو قەدەری هەربووی خوا چڕ داناگرێو پشت بە هۆیەکان (الأسباب) دەبەستێو هەر شتە لە دەرگای خۆیەوە بۆی دەچێ، ئەگەر هێندەی بڕوای بە ژیانی دنیای هەیە، هێندەش بڕوای بە دوارۆژ هەیە با بۆ بەڕێوەبردنی فەرمانەکانی خواش بەتەما قەزاو قەدەری خوا لێ نەگەڕێو پشتێندی بێخەمی لێ نەکاتەوەو مەردانە مل داتێو هەوڵ بدات.

**پێنجەم:** یەکێك لە یاساکانی ئاینو بەرنامەی خوا ئەوەیە کە بەبێ هەوڵو ڕەنجدان هیچ بۆ ئینسان نایەتەدی، وە لە پێناوی چیدا ڕەنج بدات حەتمەن کەم یان زۆر هەر پێی دەگات، وەك خوا فەرمووویەتی: ﴿**وَأَن لَّيْسَ لِلإِنسَانِ إِلاَّ مَا سَعَى**﴾ (النجم- 28)، واتە: وە هیچ شتێك بۆ مرۆڤ نیە جگە لەوەی کە هەوڵی بۆ دەدات. کەواتە هەرکامێکمان با لە ژیانی خۆمان وردبینەوە ئەگەر ژیانی دنیامان کردۆتە دەستەواژەی وەدەستهێنانی بەهەشتی بەرینو گەیشتن بە ڕەزامەندی خوای

پەروەردگار ئەوە با سوور بزانین بەپێی یاسای خوا بە حوكمی قەزاو قەدەری خوا ئەگەر هەر وا بمێنینەوە بەو ئامانجە دەگەین كە ژیا نمانی بۆ تەرخان دەكەینو هەوڵو ڕەنجی بۆ دەدەین.

بەڵام ئە گەر خوانەخوا ستە- ژ یانی دونیاو زەرقو بەرقو ئارەزووەكانمان كردۆتە بتێكو دەیپەرستینو هەموو كردو كۆشێكمان لە پێناوی نەفسو داخوازییەكانی دایە، ئەوە با چاك بزانین ئەگەر هەروا بڕۆینو ژیوان نەبینەوە، بە حوكمی یاسای خوا لە قەزاو قەدەری ئەزەلییدا چوونە دۆزەخمان بۆ بڕیار دراوە!.

ئنجا كۆتایی ئەم باسە بە فەرموودە یەكی پێغەمبەرمان - علیە الصلاة والسلام - دێنین كە دەفەرموێ: **(كل شيء بقدر حتى العَجزُ والكيّس)** رواه مسلم و احمد عن ابن عمر، واتە: هەموو شتێك بە قەزاو قەدەرە، تەنانەت كارنەكردنو دەستەپاچەییو چالاكییو كارزانییش).

كەواتە ئەگەر بە تەنبەڵیو تەوەزەلی پاڵی لێ بدەیەوەو خۆت بۆ خوا ماندوو نەكەی هەر بە قەزاو قەدەری خوایەو، ئە گەر خۆ شت گورج بكەوىو هەستیە پێو خۆت بۆ خوا تەرخان بكەی، دیسان هەر بە قەزاو قەدەری خوایە، بەڵام ڕیشمەی هەڵبژاردنێ بەدەستی ئیرادەی خۆتەوەیەو هەرلایەكیشیان هەڵبژێری پاش هەڵبژاردنەكە ئن جا دەزانی خوا چ بڕیارێكی بۆ داوی.

## ئێستاش خوێنەری بەڕێزا

ئەگەر ئەوەی ڕابرد لە هەمووی حاڵی بیءو وەری بگری زۆر بە سێنایی دەتوانی دەمکوتی ئەوانە بکەی کە بە نەزانی دەم لە قەزاو قەدەر وەردەدەن‌و، هەر کە پێشیان گوترا: چما پابەندی ئایین نین‌و ئەر کەکانتان بەڕێوە نابەن؟ بە فیزەوە چوارینەیەکت لەو شیعرانە بۆ دێننەوە کە پاڵ(*) دەدرێنە لای (عمر الخيام)، وە پێیان وایە کە هەر چوارینەیەکی ( خەییام) طەلسمێکەو هەموو گرێ کوێرەیەکیان پێ دەکرێتەوەو هەموو پرسیارێکیان پێ وەڵام دەدرێتەوە!!

ئنجا ئەوا بۆ نموونە دوو دانە لەو چوارینە دارینانە دێنینەوەو بەپێی ئەو یاسایانەی کە پێشتر خستماننە ڕوو لە مەحەکیان دەدەین:

خەییام لە چوارینەیەکیدا بە پێی وەرگێڕانی (هەژار موکریانی) دەڵێ:

ئەی خوایە لە کارت سەری زانا گێژە
شیرنایی دەنێیە دەم دەڵێی مەیچێژە
خۆت جوانی دروست دەکەی دەڵێی مەیبینە
پیاڵێکی پڕاوە لاری کەوەو مەیڕێژە

---

*) بۆیە وا دەڵێم چونکە زۆر لە زاناو لێکۆڵەرەوان ڕایان وایە کە (عمر بن ابراهيم الخيام) بابایەکی زاناو خواناس‌و فەیلەسوف بووەو، ئەو شیعرو هەڵبەستانەی کە بۆنی لەززەت پەرستی‌و دونیاویستی‌و بێ‌دینییان لێ دێ، هی خۆی نین و، بەدەمیانەوە هەڵبەستوون، بۆ وێنە بڕوانە کتێبی (تحليل شخصيت خيام- بررسى آراء فلسفى، أدبي، مذهبي وعلمي عمر بن ابراهيم خيام) نووسراوی (محمد تقي جعفرى)، کە پێم وایە چاکترین و فراوانترین لێکۆڵینەوەیە دەربارەی خەییام.

لێرەدا (خەییام) کەوتۆتە هەڵەیەکی زەقەوە، (شیرنایی نێوزار نەچێژتن)و (جوانی نەدیتن) کە دوو شتی (مومکین)ن واتە مرۆڤ دەتوانێ نەیانکات: شیرنایی یەکەی بتفێنێتەوەو لە ڕاست جوانییەکە چاو بقوو چێنێ، بەراوردی پێکردوون لەگەڵ (پیاڵەی پڕاو لارکردنو نەڕشتن) کە شتێکی مەحالەو ناگونجێ، چونکە کەس ناتوانێ: پیاڵەی پڕ ئاو خواربکاتەوەو نەڕژێ!

کەواتە لێرەدا (خەییام) قیاسی کەشکێی لە مەشکێ کردوەو ساتمەی بردوە، واتە ئەو مەبەستەی کە (خەییام) شیعرەکەی بۆ گوتوە - کە بریتیە لەوەی بیسەلمێنێ: خوا شتی مەحالی لە بەندەکانی داخواز کردوە  نەهاتە دی، چونکە بەڵێ پیاڵەی پڕاو لارکردنو نەڕژاندنی ئاوەکەی مەحالە، بەڵام حەرام نەخواردنو نەزەر نەکردن مەحال نین، ئەوەتا لە واقیعی ژیانیشدا دەیبینین مسوڵمانە ڕاستەقینەکان نە حەرام دەخۆنو نە بە حەرامیش سەیری ئافرەتی بێگانە دەکەن، کەواتە وێ چواندنەکەی کە (خەییام) هەڵەیەو شتێکی مومکینی تەشبیهـ کردوە بە شتێکی مەحاڵەوە.

لە جێیەکی دیکەدا دەڵێ:

دەسکاری خودایە خۆم و ئاکاریشم
بۆ هەرچی دەچم لە دەستی ئەودا ڕیشم
هیچ کارێ بەدەستی خۆم نیە هەرچی دەیکەم
ئەو پێمی دەکا هێشتە گوناهباریشم

منیش لە وەڵامیدا دەڵێم:

بەڵێ دەسکاری ئەوە خــۆت و ئاکــــــارت
بۆ هەرچی بچی لە دەســت ویدا ئەوســارت
بەڵام ئەوەی دەیکەی زادەو بەرهــەمی خۆتــە
ئەم زمان درێژی یەش بەڵگەیە بۆ ئیختیارت

بەڵێ لە ڕاستیدا لارێ بوونو مل نەدانی ئەو جۆرە کەسانە بۆ فەرمانەکانی خوا، چاکترین بەڵگەی هەبوونی ئازادیو ئیرادەیە لە ئینساندا، چونکە ئەگەر خوا ویستبای خەڵکی ناچار بکات لە سەر خواپەرستیو چاکەکاریی، تۆبزی لێ دەکردنو ناچاری دەکردن، چونکە خوا چاکەکاریی دەحوبێنێو خراپەکاریی دەبوغزێنێ.

کەواتە: هەبوونی خراپەو تاوان بەڵگەی هەبوونی ئازادییو ئیختیارە لە مرۆڤدا، ئەو زمان درێژییو ڕەخنەی بێجێ لە خواگرتنەی خەییامیش تاوانو خراپەیەکە لە ڕیزی ئەو تاوانو خراپانەی کە هەرچەندە خوا پێی ناخۆشن، بەڵام بە ویستیو پەستی خۆی هەڵی بژاردوونو کردوونی!!

## پوختەی مەبەســت لە چەند خاڵێکدا

1- بڕوابوون بەوە کە هەرچی ڕوودەدات لە خێرو شەڕ، خۆشیو ناخۆشی، بە قەزاو قەدەری خوایە، یەکێکە لە بنچینەکانی بیروباوەڕی ئیسلامی.

2- قەدەر یانی نەخشەکێشانو ئەندازەگیریی کردنو سنوور دانان، وە قەزا یانی حوکمکردنی خوا بە جێبەجێکردنی ئەو نەخشەو بەرنامەیەو هێنانەدی ئەوشتانەی کە لە ئەزەلەوە دیاریکراونو نەخشەیان بۆ دانراوە.

3- تاقە شێوەی ڕاستی بڕوابوون بەقەزاو قەدەر ئەوەیە کە بڕوامان وابێ کە هەرچی هەبووەو هەیەو دەبێ، خوا لە ئەزەلەوە زانیویەتیو ویستوویەتیو بە تواناو هێزی وی سەری لە دەریای نەبوون دەرێناوە.

4- بڕوابوون بە قەزاوقەدەر چەند ئەنجامو شوێنەوارێکی یەکجار گرنگی هەن وەك: خۆڕاگریی لە ڕاست بەڵاو تەنگانەدا، لەخۆبایی نەبوون بە هۆی وەدەست هێنانی قازانجو بەرژەوەندییەکانەوە، لە مردن نەترسانو نەسڵەمینەوە لە ڕووداوە دژوارو بە ئازارو گرچوو بڕەکانی ژیانی دنیا، مانەوە لە نێوان ترسو ئومێددا، بۆ خوا یەکلابوونەوەو پشت پێ بەستنی، لێبڕانو خۆتەرخان کردن بۆ کرداری چاكو مسوڵمانانە.

5- قەزاو قەدەری خوا نابێتە هۆی بێئیرادەییو دەستەپاچەیی مرۆڤ، چونکە بەڵێ خوا لە ڕۆژی بەرێ وە زانیویەتی ئینسان چ دەکاو هەر چی دەشیکات بە ئیرادەو توانای خوا دەیکات، بەڵام خوا زانیاریو ویستی

وابووە کە مرۆڤ هەرچی دەیکات بە ویست و هەڵبژاردنی خۆی بیکات نەك بە تۆبزی.

6- هەرچەندە خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە، بەڵام ئینسانیش لە وەدەست هێنان (کسب)ی کردەوەکانیدا کاریگەرەو خوا بەس یارمەتیدەی دەدات بۆ دروستکردنی کردەوەکانی، بەڵام هەڵبژاردنی کردەوەکانو دیاریکردنیان دەگەڕێتەوە بۆ ئیرادەو خواستی ئینسان، کەواتە: هەرچەندە مرۆڤ بەدیهێنەری کردەوەکانی نییە، بەڵام وەدەستخەر (کاسب)یانە!!

7- بڕوابوون بە قەزاو قەدەر نابێتە هۆی پاڵدانەوەو کارنەکردن، بەڵکو بە پێچەوانەوە مایەی ڕەنج دانو کردو کۆششو تەقەللایە بە مەرجێك بە هەڵە لێی حاڵی نەبین.

## خـالّی دووەم: قــەزاو قەدەری خوا لە پێنج کورتە باســدا

خوێنەری سەنگین!

ئەم خاڵی دووەمە[1] پێنج کورتە باسی گرتوونە خۆی لەبارەی قەزاو قەدەرەوە کە ڕاستتر وایە بگوترێ: (قەدەرو قەزا) کە ئەمە ناوو نیشانەکەیانە:

1- ئیمان بە قەزاو قەدەری خوا یەکێکە لە شەش پایەکانی ئیمان.

2- پێناسەی قەزاو قەدەر.

3- مەسەلەی قەدەر یەکێکە لە مەسەلە وردو ئاڵۆزەکانو زۆر پێدا قووڵبوونەوەی پەسەند نیە.

4- پایەکانی ئیمان بە قەزاوقەدەر.

5- هەڵوێستی ڕاستو دروست لە بەرانبەر (قەدەر)دا لە نێوان تێپەڕاندن (إِفراط)و بە زایەدان (تفریط) دایە.

ئێستاش با بەڕێز بەو پێنج کورتەباسەدا بچینە خوارێ:

---

1) ئەم خاڵی دووەمەش بریتیە لە دەقی دەرسی ژمارە (41) لە زنجیرە دەرسی: ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی....) بەڵام ئێمە لێرەدا خستوومانەتە شوێنی دەرسی ژمارە (46)و جێگۆڕکەمان پێیان کردوە.

## 1- ئیمان بە قەزاو قەدەری خوا یەکێکە لە شەش پایەکانی ئیمان:-

بەڵێ بەڕێزان!

ئیمان بە قەدەر (الأيمان بالقدر) یان ئیمان بە قەزاو قەدەر یەکێکە لە شەش پایەو بنەڕەتەکانی ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی، چونکە لەو فەرمایشتەی پێغەمبەردا ﷺ کە بە فەرموودەی: جبریل (حديث جبريل) ناسراوە ئیمان بە خێرو شەڕی قەدەر بە یەکێك لە شەش پایەکانی (ئیمان) دانراوە لەکاتی پێناسەکرانی (ئیمان)دا، وەك فەرموویەتی: **(قال فأخبرني عن الأيمان؟ قال: أن تؤمن بالله و ملائكة و كُتُبه و رُسْلِهِ و اليوم الآخر، و تؤمن بالقدر خيره وشره، قال: صدقت)**[1]، کەواتە: ئیمان بە قەزاو قەدەر یەکێکە لە شەش پایەو کۆڵەکەکانی ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیو بەبێ ئیمان بە قەدەر، ئیمانو عەقیدەی ئیسلامی بە ئیمانو عەقیدەیەکی تەواو دانانرێت، واتە کەسێك ئیمانی بە قەدەر نەبێ، دەڵێین: ئیمانی نیە، نەك هەر ئیمانەکەی تەواو نیە.

وە خوای پەروەردگار لە چەندین ئایەتدا باسی قەدەر (القدر)ی کردوە، بۆ وێنە فەرموویەتی: **﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾**[2]، واتە: ئێمە هەموو

---

1) رواه مسلم عن عمر بن الخطاب -رضي الله عنه- برقم: 1 ـ (8)، كتاب الأيمان.
2) ( القمر- 49 ).

شتێكمان بە ئەندازەگیریی دروست كردوە، وە فەرموویەتی: ﴿وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا﴾[1]، واتە: وە فەرمانی خوا ئەندازەیەكی ئەندازە بۆ كێشراوو نەخشە بۆ كێشراوە.

وە فەرموویەتی: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا﴾[2]، واتە: وە خوا هەموو شتێكی دروست كردوەو بە ئەندازەگیریی ئەندازەی بۆ داناوە. وە لە فەرموودەیەكیشدا هاتوە: (جاءَ مُشْرِكوا قُرَيْشٍ يُخاصِمونَ رسولَ الله ﷺ في القدر، فَنَزَلَتْ: ﴿يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ ۞ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾[3]، واتە: هاوبەش پەیداكەرانی قورەیش هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی (قەدەر) مشتومڕو وتوو یژیان لەگەڵیدا كرد، لەوەڵامی ئەواندا ئەم دوو ئایەتە هاتنە خوارێ: ﴿يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ ۞ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾، واتە: ئەو ڕۆژەی كە لە ئاگردا لەسەر ڕوویان ڕادەكێشرێن * پێیان دەگوترێ: بیچێژن ئاگری دۆزەخی بەتینو سووتێنەر، بێگومان ئێمە هەموو شتێكمان بە ئەندازە دروست كردوە.

(طاووسی یەمانی) كە یەكێكە لە زانایانی پایە بەرزی جێ ـلی شوێنكەوتووان (تابعين) دەڵێ: (أَدْرَكْتُ ناساً من أصحابِ رسولِ الله ﷺ يقولون: كلُّ شيء بقدر، قال: وسَمِعْتُ عبدالله بن عمر يقول: كلُّ شيء بقدر حتى العَجْزُ والكَيْس، أو الكَيِّسُ والعَجْز)[4]، واتە: كۆمەڵێك لە هاوەڵانی

1) (الأحزاب 38).
2) (الفرقان- 2).
3) رواه مسلم و الترمذي عن أبي هريرة -رضي الله عنه- برقم: 2656.
4) رواه مسلم عن مالك بن أنس، برقم: 2655

پێغەمبەرم ﷺ بینیوە، هەموو ئەوانەی کە بینیومن دەیانگوت: هەموو شتێك لە لایەن خوا ئەندازەگیریی کراوە، وە لە (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر)یشم بیست کە دەیگوت: هەموو شتێك بە ئەندازەگیریی یە لە لایەن خواوە، تەنانەت کەودەنیی و زیرەکییش، یاخود زیرەکی و کەودەنییش، (الكَيْس) واتە: زیرەکی و وریایی، (العَجْز) واتە: کەودەنیی و بێئاگایی و تەمبەڵیی.

## 2- پێناسـەی قـەدەرو قـەزا:

دیارە هەرکام لەوشەی (قەدر)و (قضاء) وشەی عەرەبیین و بۆ واتاکەیان دەبێ سەرنجی زمانی عەرەبیو فەرهەنگەکانی بدرێ:

جا وشەی (قدر) لە ئەسڵی زماندا بەم شێوەیەیە، دەگوترێ: (قَدَرْتُ الشَّيء أقْدِرُهُ وَ أقْدُرُهُ قَدْراً و قَدَراً، إذا أحَطْتَ بِمقدارِه، والقَدَرُ: القضاءُ و الحُكْمُ، وَمبلغ الشيء والتَّقدير: التروية والتفكّر في تسوية الأمر)[1]، واتە: شتێکم (قَدَرْ) کرد، کە بزانی ئەندازەکەی چەندەو چۆنییەتەکەی چۆنە، وە (قَدَرْ) بریتیە لە بڕیاردان لەسەر شتێك، وە حوکمدان بەسەر شتێکدا، وە بە ئەندازەی شتێك دەگوترێ، (تقدير)یش واتە: بیرکردنەوەو ڕامان لە ڕێکخستنی شتێکدا.

ئەوە مانای (قَدَرْ)ە کە بە مانای نەخشە کێشانو ئەندازەی شت دێت.

لەبارەی وشەی (قضاء)یشەوە گوتراوە: (القضاء: الفَصْلُ والحُكم، وأَصْله: القَطْع والفَصْلُ، يقالُ: قَضى يَقْضي قضاءاً، فهو قاضٍ، إذا حَكَم وفَصَل، وقَضاءُ الشَّيء: إحْكامُهُ وإِقضاءه والفَراَغ منه. فيكون بِمَعْنى الخَلْق، وقال الأزْهريُّ: القضاء في اللغة على وجوه، مَرْجِعُها الى انْقضاء الشيء وتَمامِه، وكلّ ما أُحْكِمَ عَمَلُهُ، أو أُتِمَّ أو أُدِّي أَو أُوجِبَ أو عُلِمَ أو نُفِّذَ أو أُمْضي، فَقَدْ قُضِيَ)[2]، (قضاء) یانی: بڕیار لە سەردانو جێبەجێکردنو جیاکردنەوە، وە ئەسڵی مانای وشەی (قضاء) یانی: بڕین و

1) (لسان العرب) وە (القاموس المحيط) وە (مفردات ألفاظ القرآن)ی (راغب الأصفهاني) وە (النهاية في غريب الحديث- والأثر)ی (ابن الأثير) وە باقی فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبی، ئاوا باسی (قدر)یان کردوە.
2) هەمان سەرچاوەکانی پێشوو.

لەیەك جیاكردنەوە (القطع والفصل) بۆیەش بە دادوەر دەگوترێ: (قاضي)، چونكە بڕیار دەدات‌و دوو كەس كە بەیەكەوە ناكۆكی‌و مشت‌و مڕیان هەیە، لە یەكیان جیادەكاتەوەو بڕیاریان لە نێواندا دەدات، وە خەتێكیان بە نێواندا دێنێت، وە (ئەزهەریی) گوتوویەتی: وشەی (قضاء) لە زماندا چەند واتایەكی هەیە كە دەگەڕێنەوە بۆ تێك پەڕاندن‌و ئەنجامدانی كارێك‌و لێبوونەوە لە شتێك‌و تەواوكردنی‌و جێبەجێ‌كردنی.

بۆ زیاتر تیشك خستنە سەر چەمك‌و واتای هەركام لە قەدەر (قدر)‌و قەزا (قضاء) دەتوانین وێنەیەك بهێنینەوە: كەسێك كە دەیەوێت كۆشك‌و خانووێك دروست بكات، سەرەتا لە مێشكی خۆیدا، یان لە سەر كاغەز نەخشەی دەكێشێت، كە ئەوەندە ژوورەی هەبێ‌و ئەوەندە سالۆنی هەبێ‌و نهۆمەكان ئەوەندە بن‌و ئاواوئاوا بێ، پاشان ئەگەر كابرا ئەندازیارێكی پسپۆڕ بێ، ئەوەش لەبەرچاو دەگرێ كە ئەوەندە چیمەنتۆی تێدە چێ، چونكە ئەوەندە مەترەیە، هەر مەترەی ئەوەندەی چیمەنتۆی تێدە چێ‌و ئەوەندە لم‌و چەوو گەچەی تێدەچێ‌و....هتد، ئاوا لە مێشكی خۆیدا یان لەسەر كاغەز، ئەندازەی دەگرێ‌و نەخشەی دەكێشێ‌و هەموو شتەكانی ئەندازەگیریی كردوە.

ئنجا پاش ئەوە لە قۆناغێكی دیكـــەدا هەڵدەستێ دەست دەكات بە دروستكردنی‌و تەواوی دەكات، بە پێی ئەو نەخشەیەی كە پێشتر دایناببوو!

جا ئەوەی قۆناغی یەكەم (قَدَر)ە‌و، ئەوەی قۆناغی دواییش (قضاء)ە، لە پێشدا ئەندازەگیریی‌و نەخشەكێشان بوو، دوا‌ییش جێ بەجێ‌كردن‌و تەواوكردن بوو، بە پێی ئەو نەخشەو ئەندازگیریی‌یەی كە پێشتر هەبووە.

وه دەربارەی ئەوە کە ئایا (قدر)و (قضاء) جیاوازی یان چییە؟! زۆربەی زانایان ئاوا وەك من گوتم دەڵێن: (قدر) ئەندازەگیریی و نەخشەكێشانەو (قضاء)یش بڕیاردان و جێبەجێکردن و لێك جیاکردنەوەی شتەکانە.

هەندێکیشیان گوتوویانە: بە پێچەوانەوە (قضاء) نەخشەکێشان و بەرنامە ڕێژیی یەو (قدر)یش بریتیە لە جێبەجێکردن و هێنانەدی شتەکە لە واقیعدا.

بەڵام ئەگەر تەماشای ئایەتەکانی قورئان بکەین، بۆمان دەردەکەوێ کە ڕای یەکەمیان ڕاستەو (قدر)، واتە: ئەندازەگیریی و نەخشەكێشان، (قضاء)یش واتە: جێبەجێکردن و بڕیار لەسەر دان و تەواوکردنی کارە کە بەپێی ئەو نەخشەیەی کە پێشتر کێشراوە.

بۆ نمونە: با سەرنجی ئەم چەند ئایەتە بدەین تاکو جیاوازی نێوان چەمك و واتای (قضاء)و (قدر)مان بۆ ڕۆشنتر بێتەوە: خوا بۆ دروستکردنی ئاسمانەکان فەرموویەتی: ﴿**فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَى فِي كُلِّ سَمَاء أَمْرَ هَا...**﴾[1]، واتە: جێبەجێکرد حەوت ئاسمان لە دوو ڕۆژدا.. (واتە بەدوو قۆناغ حەوت ئاسمانەکانی دروست کردن)، بەڵام بۆ (قدر) دەفەرموێ: ﴿**وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا**﴾ (**الفرقان ـ 2**)، یان: ﴿**إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ**﴾ (**القمر**-49). کەواتە: هەموو شتێك بە ئەندازەگیریی دروست کراوەو پێش هاتنەدی ئەندازەگیریی کراوە، بەڵام وشەی (قضی) بۆ تێك پەڕاندن و دروستکردن بەکارهێنراوە: ﴿**فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ....**﴾، واتە: دروستی کردن و ئەنجامی دان.

---

1) (فصلت- 12) .

هەروەها خوا فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا قَضَى أَمْراً فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾[1]، واتە: کاتێك خوا فەرمانێك دەربکات و بیەوێ شتێك جێ بەجێ بکات، پێی دەفەرموێ: ببە ئەویش یەکسەر دەبێ.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وكان أمْراً مَقْضيّاً﴾[2]، واتە: ئەو کارە ﴿ کە بریتیە لەوەی خوا بڕیاری داوە مەریەم منداڵێکی ببێ بە ناوی (عیسا) بێ باب﴾ ئەوە بڕیارێکە دراوە تێپەڕیوە.

وە لەوبارەوە کە دەبێ هەموو کەس دۆزەخ ببینێ، خوا عزّو جلّ- فەرموویەتی: ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْماً مَّقْضِيّاً﴾[3]، واتە: وە هیچ کام لە ئێوە نیە، حەتمەن دەبێ بچێتە لای دۆزەخ، ئەوە لە لایەن پەروەردگارتەوە بڕیارێکی پێویستەو دراوە.

جا چوونە لای دۆزەخ دوو جۆرە چوونە: چوونێك کە بچێ و تێیدا بسووتێ، چوونێکیش کە بچێتە سەرانسوێی و بە سەری دا ڕەت ببێ کە لێرەدا ئەمەی دووەم مەبەستە، چونکە وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە و شەی (ورود) جیایە لە (دخول) کەواتە سەرجەم بە شەر بە چاك و خراپەوەو تەنانەت پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) بە پێی ئەم ئایەتە دەبێ هەموویان بچنە سەرانسوێی دۆزەخ و بەسەریدا ڕەت ببن.

جا ئەوەی کە لێرەدا مەبەستمانە ئەوەیە کە ڕستەی: ﴿كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا﴾ ئەوە دەگەیەنێ کە مەسەلەی بەلای دۆزەخدا ڕەت بوونی هەموو بەشەر شتێکی براوەو بڕیار لەسەر دراوەو تەواو بووە.

---

1) ( البقرة- 116 ).
2) ( مريم- 21 ).
3) ( مريم- 71 ).

کەواتە: بۆ پوخت کردنەوەی پێناسەی (قەدەرو قەزا) دەڵێین: قەدەرو قەزای خوا ئەوەیە کە خوا لە زانیاری بێ سەرەتای خۆیدا ئەندازەی هەموو شتێکی کێشاوەو هەموو شتێکی زانیوە، بۆ وێنە: ئیمانی ئیماندارانو چاکەی چاکەکارانو کوفری کافرانو خراپەی خراپەکاران، هەر هەمووی زانیوەو ئەندازەگیریی کردوە، وە بۆ هەر کەسێکیشی دیاری کردوە کە ئەمیان ئیمان دێنێو چاکە دەکات، بەهۆی ئەو ئیمانو چاکەیەوە دەچێتە بەهەشتو، ئەویشیان کافر دەبێو خراپە دەکاتو بەهۆی کوفرو خراپەکەیەوە دەچێتە دۆزەخ، پاشان خوای زاناو توانا تبارك وتعالی هەموو ئەو شتانەی کە لە ئەزەلەوە زانیبونیو نەخشەو بەرنامەی هێنانەدیو پەیداکردنیانی داناوە، لەو کاتەدا کە حیکمەتی دەیخوازێ بە ویستو توانای بێ سنووری ئەنجامیان دەداتو دەیانهێنێتە دی.

## 3- مەسەلەی قەدەر یەکێکە لە مەسەلە وردو ئاڵۆزەکان و زۆر پێدا قووڵبوونەوەی پەسەند نیە:

زانایانی ئیسلام هەموویان یان زۆربەیان لەسەر ئەوەیەك دەنگن کە بە ڕاستی مەسەلەی قەدەرو قەزا شتێکی زۆر وردو ئاڵۆزەو هەموو لایەنەکانی لە مێشکی ئینساندا جێگایان نابێتەوە، بەڵکو دەبێ ئینسان لە بەرانبەریدا تەسلیم بێت و ئەوەندەی کە لە عەقڵیدا جێی دەبێتەوەو دەتوانێ بیزانێ بابیزانێ، بەڵام ئەوەی کە لە توانایدا نیە، نابێ بەدوای بکەوێ. هەیە زیاتر دەتوانێ بەدوای بکەوێ و تێیدا قووڵ ببێتەوەو هەیە کەمتر، جا کە زانیت کەم دەتوانی، کەمی بە دوا بکەوە، بەڵام کە زانیت زیاتر دەتوانی ئەوە مەجال هەیە، بەڵام لە سنووری توانای خۆت مە چۆ دەرێ، چونکە مەسەلەکە لەوە گەورەترە کە لە عەقڵی ئینساندا جێگای ببێتەوە.

وە لە ڕاستیدا عەقڵی ئینسان بۆ دەرك و پەیپێبردنی هەموو شتەکان دروست نەکراوە، بەڵکو دەتوانین بڵێین: عەقڵی ئینسان حەقیقەتی هیچ کام لە شتەکان نازانێ! تەنانەت حەقیقەتی ئەو ماددەیەی کە ڕۆژانە هەڵس و کەوتی لەگەڵدا دەکات، ئەویش بە تەواوی نازانێ، وەك پسپۆڕانی بواری فیزیاو کیمیا دانیان پێدا هێناوەو ڕایانگەیاندوە، چ جای سەریان لە قەزاو قەدەری خوا دەربچێ، کە پەیوەندی بە زانیاری بێسنووری خواوە هەیەو پەیوەندی بە دەستەڵاتی بێسنووری خواوە هەیەو پەیوەندی بە ویستی بێسنووری خواوە هەیەو، دیارە عەقڵی ئینسانیش ئەو سیفەتە ڕەها (مطلق)و بێ سنوورانەی خوای پەروەردگاری تێدا جێ نابێتەوە، وەك چۆن

پەرداخێك ناتوانێ ئاوی دەریایەكی تێدا جێ بكرێتەوە! (ولله المثل الأعلى).

زانایانیش گوتوویانە: (قد يأتي الوحي بمحارات العقول، ولكن لا يأتي بمحالات العقول) واتە: (وحي)ی خوا شتی وای تێدایە كە عەقڵ تێیدا سەرسامە، بەڵام شتی وای تێدا نیە كە عەقڵ بە مەحاڵی بزانێ.

جا لە حاڵێكی وادا كە عەقڵ سەری لە شتێك دەرناچێو ناتوانێ لە خۆیدا جێی بكاتەوە نابێ ڕەفزی بكاتو بڵێ: ئەو شتە هەڵەیە، بەڵام دەتوانێ بڵێ: من تێی ناگەمو لە مندا جێگای نابێتەوە، ئەوەش ڕاستە.

شایانی باسیشە كە لە چەند فەرمایشتێكی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە كە شتێكی پەسەند نیە زۆر بە دوای گلۆڵەی ئاڵۆزی مەسەلەی قەدەر بكەوین، هەڵبەتە بۆ زۆربەی خەڵك، ئەگەرنا بۆ هەموو كەسێك هەروا نیە، چونكە زۆرێك لە زانایان بە تەواویی پێیدا قوڵ بوونەتەوە، بەڵام دیسانیش هیچ كەس لە هەموو لایەنەكانیدا هەر ناگاتە بنجو بناوانو هیچ كەس هەموو لایەنەكانی قەزاو قەدەری لە عەقڵیدا بۆ جێگا نابێتەوە بە پێی ئەوە كە من زۆرم لێ كۆڵیوەتەوەو سەرنجم داوە ئەویش وەك پێشتر گوتم: لە سۆنگەی ئەوەوە كە پەیوەستە بە سیفەتە بێ وێنەو بێ سنوورەكانی خوای بێ وێنەوە.

ئەمەش بۆ وێنە یەكێك لە فەرمایشتەكانە لەوبارەوە: **(عن عمرو بن شعيب عن أبيه عن جدّه قال: خرج رسول الله ﷺ ذات يوم والناس يتكلّمون في القدر فكأنَّما تَفَقَّأَ في وجهه حَبُّ الرُّمّان مِنِ الغَضَب، قال: فقال: مالكم تَضْرِبون كتابَ الله بَعْضَهُ بِبَعْضٍ؟! بهذا هَلَك مَنْ كان قبلكم)[1]**،

1) رواه احمد وغيره بسند جيّد وهو صحيح، بڕوانە: (تهذيب شرح العقيدة الطحاوية) لاپەڕە (169).

واتە: ڕۆژێك پێغەمبەر -صەڵات و سەلامی خوای لەسەربێ- چوو بۆ لای کۆمەڵێك لە هاوەڵانی بەڕێزی کە با سی قەزاو قەدەریان دە کرد، پێغەمبەریش وەك کە هەنارێك ڕوو بەدەمو چاوی بگوو شرێ (ئاوا دەمو چاوی سوور هەڵگەڕا) لە بەر تووڕە بوون، (د یارە تێبینی کردوە کە هەندێکیان هەندێك لە ئایەتەکان دێنن و بە هەندێکی دیکەیدا دەدەن، لە جیاتی ئەوەی کە ئایەتەکان کۆبکە نەوە، پێک یان دا دەدەن، کە ئەوە نیشانەی کەسانی کەم زانیارییە، دیارە ئەو کۆمەڵە لە هاوەڵانی بەڕێز موناقەشەیەکی حەکیمانەیان نەکردوە لەبارەی قەدەرەوە بۆیە پێغەمبەری خوا تووڕە بووە) وە فەرمووی: بۆچی کتێبی خوا هەندێکی بە هەندێک یدا دەدەن؟! (کتێبی خوا هەمووی یەکدی تەواو دەکات، بەڵام بە مەرجێك ئینسان لە بارەیەوە شارەزایی یەکی قووڵی هەبێت و لە هەموو بوارەکان دا هەموو ئایەتەکان بێنێت، ئەوکاتە دەبینی کە ئایە تەکان وەك ئاڵ قەی زنجیرو چینی دیوار یەکدی مەحکەم دەکەن، بەڵام کە لە مە سەلەیەك ئایەتێکت هێناو ئایەتەکانی دیکەت نەهێنا، یان فەرموودەیەکت هێ ناو ئەوانی دیکەت نەهێنا، لێرەدا وادەزانی ئەو ئایەتە دژی ئەوانی دیکە یەو ئەو فەرموودەیە دژی ئەوانی دیکەیە!)

جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوانی پێش ئ ێوەش هەر بەوە لەنێو چوون، (واتە: شارەزایی تەواوو بەرفراوانیان نەبوو لە کتێب و بەرنامەکانی خوادا و هەندێکیان ئەم لا یان دە گرت و هە ندێکی دی کەیان ئەو لاو هەریەکەی بە دۆڵێك دا دەرۆیشت و لەیەك حاڵی نەدەبوون).

وەلە فەرموودەیەکی دیکەدا هەر لەوبارەوە فەرمووبیەتی: (**إِذا ذُكِرَ القَدَرُ فَأَمْسِكوا**)[1]، واتە: کە باسی قەدەر کرا بێدەنگ بن، واتە: قسەی لەسەر مەکەنو بەدوای مەکەون.

هەڵبەتە وەك ئاماژەم پێکرد، لێرەدا پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) مەبەستی پێ خەڵکی بە گشتییە، ئەگەر نا زۆر زانایان زۆری پێیدا قووڵ بوونەتەوەو ئەوە مانای وانییە کە پێچەوانەی فەرموودەی پێغەمبەر جووڵاونەوە! بەڵام بۆ خەڵك بە گشتی پەسەند نیە بە دوای قەزاو قەدەر بکەون هەربۆیەش مەسەلەی قەزاو قەدەر هی ئەوە نیە کە لەسەر مینبەری مزگەوت باس بکرێ، مەگەر ئەو شتانەی کە دەگونجێ بچنە نێو عەقڵی خەڵکەوەو بە گشتی دەتوانن لێیان تێبگەن.

(أبو جعفر الطحاوي) لەوبارەوە دەڵێ: (وأَصْلُ القَدَر سِرُّ الله تعالى في خَلْقه لَمْ يَطَّلِعْ عليه مَلَكٌ مُقرَّبٌ ولا نبيٌّ مُرْسَلٌ، والتَعمُّق والنَّظر في ذلك ذريعة الخُذْلان وسُلَّمُ الحِرْمان ودَرَجَةُ الطُّغْيان، فالحذر الحذر من ذلك نظراً وفكراً ووسوسةً فأن الله تعالى طَوى عِلْمَ القَدَرِ عن أَنامِهِ ونَهاهُمْ عن مَرامَهِ كما قال تعالى في كتابه: ﴿**لا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ**﴾[2]، واتە: ئەسڵی قەدەر نهێنیی خوای بەرزە لە دروستکراوەکانیدا، نە هیچ فریشتەیەکی لە خوا نزیكو نە هیچ پێغەمبەرێکی ڕەوانەکراو[3]، بە تەواویی سەری لێی دەرنەچووە، بۆیە زۆر پێیدا قووڵبوونەوەی (بۆ خەڵك بە

1) صحيح الجامع الصحيح، الألباني، ژمارە (545).
2) (الأنبياء- 23) ، (تهذيب شرح العقيدة الطحاوية) لاپەڕە(160-161).
3) من پێم وایە کەلەوە دا زیادەڕۆیی کردوە، چونکە ئێمە ئاگاداری ئاستی پێغەمبەرانو فریشتە لە خوا نزیکەکان نیـن!

گشتی یاخود بۆ خەڵکی تایبەتیش ئەگەر بیانەوێ ئەو پەرە کەی بزانن) دەبێتە مایەی سەرگەردانیی و تێچوونو بێبەش بوونو یاخی بوون، بۆیە یەکجار وریابە لە قووڵبوونەوە لەو مەسەلەیەدا چ بە سەرنج دان، چ بە بیرکردنەوە چ بە وەسوەسەو خەیاڵ لە سۆنگەی ئەوەوە کە خوای پەروەردگار -تبارك وتعالى- زانیاری تەواوی دەربارەی قەزاو قەدەری پێچاوەتەوە لە دروستکراوەکانی خۆی، وە هەروەها نەهیشی لێ کردوون کە هەوڵ بدەن بگەنە ئەو سەرەکەی (چونکە هەرگیز پێی ناگەن) وەك خوای بەرزو مەزن لە قورئاندا فەرموویەتی: ﴿**لا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ**﴾، واتە: خوا پرسیاری لێ ناکرێ دەربارەی ئەوەی کە دەیکات، بەڵکو ئەوان پرسیاریان لێ دەکرێت.

بەڵێ بۆمان نیە بڵێین: خوا بۆچی ئاوای کرد؟! بۆ نموونە: بۆچی خەڵکی دروست کرد؟! بۆچی شەیطانی دروست کرد؟! و... هتد، ئەو جۆرە پرسیارانە ناگونجێ ئاڕاستەی خوای بەرزو بێوێنە بکرێن، چونکە خوا کاربەجێیەو خۆی هەرچی بیەوێت دەیکات، وە خوا هیچ شتێکی نەکردوە کە لە جێگەی خۆیدا نەبێت، جا ئەوەی کە سەری لێ دەربچێ ئەوە سەری لێ دەرچووە، ئەوەش سەری لێ دەرنەچێ، ئەوە بێگومان تاوانو جەهلو نەفامی خۆیەتی، وە هەندێك لە نهێنییەکانو ڕاستییەکانیش کە ئێمە سەرمان لێیان دەرناچێ هەموو لە شوێنی خۆیاندان، بەڵام لە عەقڵی ئێمەدا جێگایان نابێتەوە، وە ئێمە ناگەینە ئەو پەرەکەیان.

## 4- پایـەكانی ئیمـان بە قـەزاو قەدەری خـوا عزّوجلّ-:

بەرێــزان!

ئیمان بە قەزاو قەدەری خوا چوار پایەی هەنو هەركەسێك ئا گای لە یەكێك لەو چوار پایە نەبێ ئیمان هێنانی بە قەزاو قەدەر نایەتە دی، واتە: بۆ ئەوەی ئینسان بە بڕوادار بە قەزاو قەدەر دابنرێ، دەبێ هەركام لەو چوار پایەو بنەڕەتەی قەدەر لەبەرچاو بگرێ، ئەوانیش ئەمانەن:

**(یەكەم): دانهێنان بە زانیاری بێسەرەتای خوادا عزّوجلّ-:**

بەڵێ خوا عزّوجلّ- هەر لە ئەزەلەوە هەموو شتێكی زانیوە، لە ڕیزی ئەو شتانەدا كە زانیویەتی: ئیمانو چاكەی ئیمانداران‌و كوفرو خراپەی كافرو خراپەكاران، هەمووی زانیوە، وەك فەرموویەتی: ﴿وَكَانَ اللهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا﴾(1) واتە: وە خوا هەر لە سەرەتاوە بە هەموو شتێك زانا بووە. وە فەرموویەتی: ﴿هُوَ اللهُ الَّذِي لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ ..﴾(2)، واتە: ئەوخوایەی كە بێجگە لەوی هیچ پەر ستراو نین، زانای پەنهان‌و ئاشكرایە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ الْأَرْضِ وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ﴾(3)، واتە: ئەو لە خۆتان پێتان زاناترە كاتێك كەلە زەویدا پێی گەیاندن، وە كاتێك كە كۆرپەبوون لە سكی دایكتاندا...

1) (الأحزاب 40).
2) (الحشر 22).
3) (النجم- 32).

ئنجا هەر بە عەقڵیش دیارە کە هەر خاوەن شتێك پێش ئەوەی ئەو شتەی خۆی بەرهەم بێنێ، شارەزایی پێی هەیەو دەزانێ چۆنە، چونکە پێش ئەوەی لە دنیای واقیعدا پەیدای بکات، لە خەیاڵو بەرنامەو نەخشەی خۆیدا دایناوەو دیاری کردوە کە چی دەبێو چۆن دەبێ؟!

خوای پەروەردگاریش ئەو بوون (وجود)ەی کە خوڵقاندوە، پێش ئەوەی کە بیخوڵقێنێ، زانیویەتی کە هەرکام لە دروستکراوەکانی ئەندازەی چۆن دەبێو کۆتاییو داهاتووی چۆن دەبێو بۆ کوێ دەچێو چۆن دەکاتو چی دەکات؟!

وەك فەرموویەتی: ﴿أَلا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ؟!﴾[1]، واتە: ئایا ئەو کەسەی کە هەموو شتێکی دروست کردوە، نایزانێو پێی ئاشنا نیە لە کاتێکدا کە زۆر پەنهان بینو زۆر شارەزایە؟!

(عبدالله)ی کوڕی (عباس) ڕەزایی خوایان لێ بێ، دەگێڕێتەوە، دەڵێ: **(سُئلَ النبيُّ ﷺ عن أولاد المشركين، فقال: أللهُ أعلم بما كانوا عاملين)**[2]، واتە: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا -صەڵاتو سەلامی خوای لەسەربێ- دەربارەی منداڵی هاوبەش پەیداکەر (مشرك)ەکان (ئایا دەچنە بەهەشت؟ چونکە باڵغ نەبوونو گوناهیان نەکردوە، یان دەچنە دۆزەخ؟!) لە وەڵامدا فەرمووی: خوا زاناترە بەوەی کە چی یان دەکرد، ئەگەر هاتباو باڵغ ببونایە.

چونکە خوای زاناو توانا وە نەبێ هەر ئەو شتانە بزانێ کە دروستی کردوون، بەڵکو ئەوانەش دەزانێ کە جارێ دروستی نەکردوونو دروستیان دەکاتو، ئەوانەش دەزانێ کە دروستی نەکردوون، بەڵام ئەگەر دروستی

1) (الملك- 14).

2) رواه البخاري ومسلم عن أبي هريرة رضي الله عنه البخاري برقم: 1384، ومسلم: 2659.

کردبان چۆنی دروست دەکردن، وەکو منالێکی نابالغ کە دە مرێ، خوا دەزانێ کە ئەگەر نەمردبایە چی دەکرد!، بالغ نەبووە، بەلام دەزانێ ئە گەر بالغ بووبایە چی دەکرد، جا بەپێی ئەوەی کە دەزانێ چی دە کرد، بۆی دیاری کردوە، کە بچێتە بەهەشت یان دۆزەخ!!

جا تەماشا بکەن! ئەم مەسەلەیە چەند وردەو چۆن ئینسان سەری لێ دەردەچێ؟! لە ڕاستیدا لە عەقڵی ئینساندا جێی نابێتەوە، بەڵکو هەر لە زانیاری بێسنووری خوادا جێگای دەبێتەوە! کەوا تە پا یەی یە کەم لە پایەکانی ئیمان بە قەزاو قەدەر ئەوەیە کە تۆ بڕوات هەبێ بەوەی کە خوا هەموو شتێکی زانیوە لە سەرەتاوەو هیچ شتێك نەبووە نەیزانیبێت، بە وردو درشتەوەو بە چاكو خراپەوە، بە دیارو نادیارەوە.

**(دووەم): دانهێنان بەوەدا کە خوا - عزّوجلّ- هەموو شتێکی تۆمارکردوەو نووسیوە پێش ئەوەی دروستی بکات:**

وەك لە چەندان ئایەتدا باسی (لوح المحفوظ)و (إ مامٍ مبین)و (ک تاب مبین)ی کردوە، بۆ نموونە فەرموویەتی: ﴿**بَلْ هُوَ قُرْآنٌ مَّجِيدٌ ۞ فِي لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ**﴾[1]، واتە: بەڵکو ئەوە قورئانێکی پایە بەرزە، لە لەوحێکی پارێزراودا، (لوح) واتە: تەختەیەك کە شتی لێ بنووسرێ، کە ئێمە نازانین ئەو تەختە پارێزراو (لوح المحفوظ)ە چۆنەو نازانین چەند گەورە یە، گرنگ ئەوەیە، خوای پەروەردگار دروستکراو مخلوق-ێکی هەیە بە ناوی (لوح المحفوظ)و پێش ئەوەی دروستکراوەکانی درو ست ب کات، زانیاری وردی هەموو ئەو شتانەی کە دروستیان دەکات لەو (لوح)ەدا نووسیوە!

1) ( البروج 21-22 ).

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَكُلَّ شَيْءٍ أحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُبِينٍ﴾[1]، واتە: وە هەموو شتێکمان سەرژمێر کردوە لە (إمام)ێکی ئاشکراو ڕووندا، (إمام) هەم بە واتای پێشەوا دێتو هەم بەمانای شتێك دێت کە لە پێش هەموو شتێکەوەیە، کە بێگومان (لوح المحفوظ) لە پێش هەموو شتێکەوەیەو پێش ئەوەی هیچ شتێك ببێت، ئەو بووەو هەموو زانیارییەکانی تێدا نووسراونو تۆمار کراون، بۆیەش (طبري)، (إمام مبين)ی بە (أم الكتاب)لێکداوەتەوە، (مختصر تفسير الطبري) ص(440).

هەروەها فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِنَّ ذَلِكَ فِي كِتَابٍ إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾[2] واتە: ئایا نازانی کە خوا ئەوەی لە ئاسمانو زەویدا هەیە دەیزانێ، ئەوە هەمووی لە نووسراوێکدا نووسراوە، وە بێگومان ئەوە بۆ خوا ئاسانە! (کەواتە: خوا هەموو شتێکی نووسیوە پێش ئەوەی دروستی بکات).

هەروەها دەفەرموێ: ﴿مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنفُسِكُمْ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾[3]، واتە: هیچ بەڵایەك تووشی هیچ کەس نایەت، لە زەویدا، یان لە نەفسی خۆتاندا، مەگەر لە نووسراوێکدا نووسراوە، پێش ئەوەی بیهێنینە بوون (واتە: پێش ئەوەی ئەو بەڵایەو ئەو کارەساتە دروست بێ خوای بەدیهێنەر نووسیویەتی) بێگومان ئەوەش بۆ خوا ئاسانە.

پێغەمبەری خواش (عليه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: **(كتب الله مقادير الخلائق قبل أن يخلق السموات والأرض بخمسين ألف سنة، قال:**

---

1) ( يس- 12 ).
2) ( الحج- 70 ).
3) ( الحديد- 22 ).

**وعرشه على الماء)**[1]، واتە: خوا ئەندازەی دروستكراوەكانی نووسیوە پێش ئەوەی ئاسمانەكانو زەوی دروست بكات بە پەنجا هەزار (**50000**) ساڵ، وە فەرموویەتی: بارەگا (عرش)یشی لەسەر ئاو بوو.

كەواتە: خوا زۆر پێش ئەوەی ئاسمانەكانو زەوی دروست بكات، ئەندازەگیریی‌و زانیاری وردی دەربارەی هەر هەموو دروستكراوەكانی نووسیوە لە (كتاب)و (إمام مبين)و (لوح المحفوظ)دا كە واپێدەچێ سێ ناو (اسم)بن بۆ یەك ناوبراو (مُسمّى).

## (سێیەم): دانهێنان بەوەدا كە هیچ شتێك بەبێ ویستی خوا نابێ، وە هەرچی بووەو دەبێ بە پێی ویست‌و خواستی خوایە:

بەڵێ بە بێ ویست‌و خواستی خوا، نە هیچ شتێك پەیدا بووە، نە هیچ شتێك پەیدا دەبێ، وەك دەفەرموێ: ﴿**وَمَا تَشَاؤُونَ إِلاَّ أَن يَشَاءَ اللَّهُ**﴾[2]، واتە: ناتوانن شتێكتان بوێ، مەگەر خوا بیەوێ، وە دەفەرموێ: ﴿**فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ**﴾[3] واتە: هەر شتێك (خوا) بیەوێ دەیكات، كەوتە هەرشتێك بووە، خوا ویستوویەتی، وە هەر شتێكیش كە نەبووە، دیارە خوا نەیویستوە. وە خوا فەرموویەتی: ﴿**مَن يَشَإِ اللَّهُ يُضْلِلْهُ وَمَن يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ**﴾[4]، واتە: هەركەسێك خوا بیەوێ، ڕێگای لێ تێك دەدات‌و هەركەسێكیش خوا بیەوێ، دەیخاتە سەر ڕێگای ڕاست.

---

1) مسلم عن عبدالله بن عمربن عاص رضي الله عنهما، برقم: 2653.
2) ( التكوير- 29 ).
3) ( البروج- 16 ).
4) ( الأنعام- 39 ).

**(چوارەم): دانهێنان بەوەدا کە خوای پەروەردگار هەموو شتێکی دروست کردوەو هەر شتێك خوا دروستی نەکات، هەرگیز دروست نابێت.**

بەڵێ بەڕێزان! یەکی دیکە لە چوار پایەو بنەڕەتەکانی ئیمان بە قەزاو قەدەری خوا ئەوەیە کە تەنها خوا بەدیهێنەر ( خالق)ەو غەیری وی بەدیهێنەری هیچ شتێك نیە.

وەك خوای بێ وێنە فەرموویەتی: ﴿قُلِ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ﴾[1]، واتە: بڵێ: خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە، وە فەرموویەتی: ﴿أَفَمَن يَخْلُقُ كَمَن لاَّ يَخْلُقُ أَفَلا تَذَكَّرُونَ﴾[2]، واتە: ئایا ئەو کەسەی کە ( شت) دروست دەکات، وەك ئەوە وایە کە دروست ناکات! ئایا بیر ناکەنەوە؟!

کەواتە: بۆ ئیمان هێنان بە قەدەر پێویستە هەرکام لەو چوار پایەو بنەڕەتە هەبن:

1- دانهێنان بەوەدا کە خوای پەروەردگار هەر لە سەرەتا (أزل)ەوە هەموو شتێکی زانیوە.

2- وە بڕوابوونو دانهێنان کە خوای بەدیهێنەر پێش ئەوەی هەر شتێك دروست بکات، نووسیویەتی.

3- وە بڕوابوون بەوە کە بەبێ ویستوو خواست (إدارة و مشيئة)ی خوا هیچ شتێك نابێ.

4- وە بڕوابوون بەوە کە تەنیا خوا - سبحانه وتعالى- هەموو پەیداکراوێکی وەدی هێناوەو دروست کردوەو غەیری وی دەستیان لە هێنانەدی (خلق)دا نیە، نەکەم نە زۆر!

---

1) ( الرعد- 16 ).
2) ( النمل- 17).

## 5- هەڵوێستی ڕاست و دروست لە بەرانبەر قەدەردا لە نێوان تێپەڕاندن (إفراط) و بەزایەدان (تفريط) دایە:

بەڕێزان!

بە درێژایی مێژووی ئیسلام لە بەرانبەر قەزاو قەدەردا سێ جۆرە هەڵوێست هەبوون:

**(یەکەم):** هەڵوێستی قەدەریی یەکان (القدرية) کە (معتزلة) شیان پێ گوتراوە، بۆیەش پێیان گوتراوە (قەدەریی)، چونکە بڕوایان بە قەدەری خوا نەبووە، نەك لەبەر ئەوەی کە بڕوایان بە قەدەر بووبێ! جا ئەوانە گوتوویانە: (لا قَدَرَ والأمْرُ أُنُفٌ) واتە: هیچ شتێك ئەندازەگیریی نەکراوەو نەنووسراوە، بەڵکو ئێستاکە شتەکە دەست پێدەکات، شایانی باسە ئەوانیش دوو بەش بوون: بەشێکیان پێیان دەگوترێ: (غلاة) واتە: زۆر ڕۆچووەکان، کە ئەمانە هەڵوێستەکەیان بە کوفر دادەنرێت، چونکە نکوولێییان لە سیفەتی زانیاری خوا کردوەو گوتوویانە: خوا کردەوەی ئینسانەکانی نەزانیوەو زانیاری پێیان نیەو هەتا نەیکەن خوا نایزانێ! بۆ وێنە یەکێك قەتڵ و زینا دەکات، ئەوەی دی چاکەو طاعەت دەکات، دەڵێن خوا هیچ کامیانی نەزانیوە بەڵکو دوای ئەوە کە ئەو کە سە قەتڵ و زیناکە دەکات، یان ئەو کەسەی دیکە طاعەت و نوێژو چاکەکە دەکات، ئنجا خوا دەیزانێ و لێی ئاگادار دەبێ!

پاکی و بەرزیی بۆ خوا (سبحانه وتعالى) کە شتێك هەبێ خوا نەیزانێ، لە موڵکی خوادا کارێك بکرێ و خوا لێی ئاگادار نەبێ و نەیزانێ!

بەشێکیشیان لەچاو ئەوانی پێشوو میانەڕەوتر و بە حیساب کەمێك خۆیان هاوسەنگ (معتدل) کردۆتەوە، گوتوویانە: خوا هەموو شتێك دەزانێ، بەڵام ئینسان بۆ خۆی کردەوەکانی خۆی دەخوڵقێنێ و خوا عزّوجلّ- هیچ پەیوەندی پێیانەوە نییەو کردەوەکانی ئینسان خۆی بەدیهێنەریانە چ چاك بن چ خراپ. دیارە ئەمان بە حسابی خۆیان دیفاعیان لە دادگەریی خوا کردوە، وەك دوایی بۆتان ڕوون دەکەمەوە.

**(دووەم)**: لە بەرانبەر قەدەرییەکان (واتە موعتەزیلەکاندا)، جەبرییەکان هەبوون (الجبریة) جا جەبرییەکان گوتوویانە: ئەوە هیچ کە خوای پەروەردگار هەموو شتێکی زانیوەو هەموو شتێکی خوڵقاندوە، بەڵکو ئینسان هەر دەستی نیە لەهێنانەدی کردەوەکانی خۆیدا!، وەگوتوویانە: ئینسان وەك چڵە گیایەك وایە کە جارێك با بەملادا دەیلارێنێتەوەو جارێك بەولادا، وە وەك پەڕە مریشکێك، گەڵایەك، وایە کە بە شنەی شەماڵێك بەم لاولادا دەچێ و خۆی هیچ خواست و ویستێکی نیەو هیچ توانایەکیشی نیە، نەکەم نە زۆر، بەڵکو خوا کردەوەکانی دروست دەکات و هەموو شتێکی پێدەکات و بۆ خۆی هیچ دەستی تێیاندا نیە!

واتە: جەبرییەکان ڕاست پێچەوانەی قەدەریی (موعتەزیلە)یەکان بوون.

**(سێیەم)**: بەڵام ئەهلی سوننەت و جەماعەت بە گشتی هەروەها شیعەی دوازدە ئیمامیش گوتوویانە: نەخێر وانییە بەڵکو هەردووکتان بە هەڵەدا چوون!

وانیە کە خوای کاربەجێ هیچ پەیوەندی بە کردەوەکانی مرۆڤەوە نەبێ و مرۆڤ بۆ خۆی بەدیهێنەری کردەوەکانی خۆی بێت، وەك موعتەزیلە دەڵێن. وە واش نیە کە ئینسان دەستی لە کردەوەکانی خۆیدا نەبێت و وەك پەڕە مریشك یان گەڵایەك و چڵە گیایەك بێت لە بەرانبەر ویستی خوادا وەك

جەبریی یەکان دەڵێن: بەڵکو ئەو دوو ڕایە هەردووکیان هەڵەن، یەکیان تێپەڕاندوە، یەکیشیان کورتی هێناوە، یەکیان زیادەڕۆیی کردوەو یەکیشیان کەمتەرخەمیی کردوە.

جا ئەهلی سوننەت کە زۆرینەی ڕەهای مسولْمانان پێك دێنن و شیعەی دوازدە ئیمامیش دەڵێن: خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە، وە خوا هەموو شتێکی زانیوە، وە بەبێ ویستی خوا هیچ شتێك نابێ، وە خوا هەموو شتێکی تۆمار کردوە، ئەوە هەمووی لە جێی خۆیەتی، بەڵام ئینسانیش لە کردەوەکانی خۆیدا دەستی هەیەو بۆ خۆی وەدەستیان دێنێ، ئینسان بەدیهێنەری کردەوەکانی خۆی نیە، چونکە کردەوەکانی شتی (جعلی)ین و خولقێنراو نین تاکو پێویستی یان بە بەدیهێنەر (خالق) بێ، بەڵکو تەنیا بە وەدەستهێنەر (کاسب) کاریان مەیسەر دەبێ، مرۆڤیش وەدەستهێنەرو ئەنجامدەر (کاسب و فاعل)ی کردەوەکانییەتی، بەڵگەشمان لەوبارەوە ئەوەیە کە خوای پەروەردگار هەم وشەی (کَسْب)، وە هەم وشەی (عَمَلْ) وە هەم وشەی (فعْل)ی بۆ ئینسان بەکارهێناوە، وەك فەرموویەتی: **﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ...﴾**(البقرة- 286)، واتە: خوا جگە لە توانای خۆی لە هیچ کەس داوا ناکات، هەرکەسێك کردەوەی باش وەدەست بێنێ بەهرەمەندەو لە کردەوەی خراپی وەدەستهێنراویشی زەرەرمەندە...

هەروەها فەرموویەتی: **﴿...جَزَاء بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾**(الأحقاف-14)، واتە: ئەوە پاداشتی ئەوەیە کە دەیانکرد، وە فەرموویەتی: **﴿...فَلاَ تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ﴾**(هود- 36)، واتە: جا دڵتەنگ مەبە بەهۆی ئەوەوە کە ئەنجامی دەدەن.

## کورتـــەی قســـان:

جەبریی یەکان کە دەڵێن: ئینسان کردەوەکانی خۆی وەدەست ناهێنێ‌و دەستی تێیاندا نیە، بەهەڵەدا چوون، وە موعتەزیلەو قەدریی یەکانیش کە دەڵێن: ئینسان بۆ خۆی کردەوەکانی دەخولقێنێ‌و خوا حەقی بەسەردا نیە، ئەوانیش هەر بەهەڵەدا چوون.

چونکە خوا -عزّوجلّ- حەقی بەسەر کردەوەکانی مرۆڤدا هەیەو بە ویست‌و زانیاری وی ئەنجام دەدرێن، بەڵام مرۆڤیش بۆ خۆی و بە ویست‌و خواستی تایبەتی خۆی کردەوەکانی وەدەست دێنێ‌و ئەنجامیان دەدات، وە هەرچەندە خوا -تبارك وتعالى- ویست‌و خواستی (إرادة ومشيئة)ی ڕەهاو بێ‌سنووری هەیە، بەڵام مرۆڤیش بڕەخواست‌و ویست (مشيئة وإرادة جزئية)ی هەیە کە بەشی ئەوە دەکات کردەوەکانی خۆی چ چاك چ خراپ پێ ئەنجام بدات‌و هەر لەو سۆنگەیەشەوەیە کە شایستەی پاداشت‌و سزا دەبێ!

لە چەندان ئایەتیشدا خوای کاربەجێ باسی ویست‌و خواستی مرۆڤی کردوە، بۆ نموونە: ﴿وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ﴾ (الكهف- 29)، ﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ الدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ الآخِرَةَ...﴾(آل عمران- 152). بەڵام بێگومان ویست‌و خواست‌و هەڵبژاردنی ئینسان لەژێر ڕکێفی ویست‌و خواست‌و هەڵبژاردنی خوای بەرزو مەزن دایە وەك فەرموویەتی: ﴿وَمَا تَشَاؤُونَ إِلاَّ أَن يَشَاء اللَّهُ﴾[1]، واتە: ناتوانن بتانەوێ تا خوا نەیەوێ، وە فەرموویەتی: ﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا

1) (التكوير- 29).

﴿يَشَاءُ وَيَخْتَارُ مَا كَانَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ سُبْحَانَ اللَّهِ﴾(القصص- 68)، واته: وه هەرچی بیەوێ دروستی دەکات‌و هەڵی دەبژێرێ، بەڵام ئەوان هەڵبژاردنیان بۆ نیە (واتە: ناتوانن پێچەوانەی ویست‌و هەڵبژاردنی خوا بجووڵێنەوە).

دەشتوانین بۆ ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی دەورەدانی ویست‌و خواستی خوا بۆ مرۆڤ بڵێین: ئێمە کە لەژێر سایەی ئاسماندا دەژین‌و دەتوانین بە هەر لایەکدا بمانەوێ بێین‌و بچین، بەڵام ناتوانین هەرگیز لەژێر سایەی ئاسمان دەرب چین‌و لەم سەرزەوییە نەمێنین، خواست‌و ویستی پەروەردگاریش دەوری هەموو شتێکی داوە‌و تۆ دەتوانی بە باری خێردا بجووڵێی‌و دەشتوانی بە باری شەڕیشدا بجووڵێی، بەڵام بە هەر بارێکدا بێت، هەر لەژێر چەتری ویست‌و خواستی خوا دای‌و لێی دەرناچی!

ئێستاش بە پێویستی دەزانم کۆتایی ئەم باسە بە دوو بەسەرهاتی پڕ مانا بێنین کە دەمکوتێکی باشی موعتەزیلەکانیان تێدایە:

**یەکەم**: جارێکیان کابرایەکی قەدەریی‌و کابرایەکی مەجووسیی لەنێو دەریادا لە کەشتییەکدا پێکەوە دەبن، تۆفان‌و باو بۆرانێکی بەهێز هەڵ دەکات‌و شەپۆل تینیان بۆ دێنێ، کابرای قەدەریی (موعتەزیلە) بە کابرای مەجووسیی (ئاگر پەرست) دەڵێ: مسوڵمان بە، کابرای مەجووسیی دەزانێ کە ئەو کابرایە قەدەرییە، لە وەڵامدا پێی دەڵێ: ئەگەر خوا ویستی مسوڵمان دەبم، (چونکە قەدەرییەکان دەڵێن: خوا دەیەوێ مرۆڤ مسوڵمان ببێ، بەڵام ئینسان خۆی نایەوێ، دیارە ئەگەر ئینسانیش نەیویست‌و خوا ویستی‌و سەرەنجام ویستی مرۆڤ سەری گرت، مانای وایە ویست‌و خواستی مرۆڤ بە سەر ویست‌و خواستی خوادا زاڵ بووە!) جا کابرا مەجووسیی گوتی: ئەگەر خوا ویستی

مسولّمان دەبم، قەدەرییەکەش گوتی: خوا دەیەوێت، بەلاّم شەیطان نایەوێت، مەجووسیی یەکە گوتی: کەواتە دیارە تا ئێستا شەیطان نەیویستوەو هەر ویستی شەیطانیش زاڵ بووە بەسەر هی خوادا، جا من لەگەڵ ئەوەیاندام کە بەهێزترەو بە حسابی تۆش تا ئێستا خوا ویستویەتی من مسولّمان ببم، بەلاّم شەیطان نەیویستوەو هەر لەسەر کوفر ماومەتەوە، کەواتە: شەیطان بە تواناترە، منیش لەگەڵ ئەودام!

کەواتە: ئەو قسەیەی قەدەریی (موعتەزیلە)کان، هەر زۆر پووچ‌و بێ‌جێ‌یە! چۆن تۆ بتەوێ شتێك بکەی‌و خواش بیەوێ نەیکەی خواست‌و ویستی تۆ زاڵ دەبێ بەسەر هی خوای بەرزو مەزندا ؟! نەخێر بەڵکو کاتێك تۆ دەتەوێ شتێك بکەی، دیارە خوا ویستوویەتی، بۆیە تۆ دەتەوێ بیکەی، جا کوفر بێت، یان ئیمان وەك خوا فەرمووویەتی: ﴿**وَمَا تَشَاؤُونَ إِلاَّ أَن يَشَاء اللَّهُ**﴾، واتە: کە ویستت چاکەکاریی‌و بەندایەتی بۆ خوا بکەی‌و ئەنجامتدا، دیارە خوا ویستوویەتی، بەلاّم ئەگەر ویستت‌و ئەنجامت نەدا یان هەر لە بنەڕەتەوە نەتویست، دیارە خوا نەیویستوە بۆیە نەتویستوە، یان ویستووتەو ئەنجامت نەداوە! بەلاّم لێرەدا دەبێ وریابین‌و ویست (إرادة)و ڕەزامەندیی (رضاء)ی خوا -سبحانە وتعالی- تێکەڵ نەکەین، وەك پێشتر لەوبارەوە بە تێرو تەسەلی قسەمان کردوە.

**دووەم:** جارێک یان (أعرابی) یەك حوشترێکی لێ ون دەبێ‌و دێ بۆ مەجلیسێك کە لەو مەجلیسەدا (عەمری کوڕی عوبەید) دانیشتوە کە لە سەردەمی خۆیدا سەرۆکی قەدەرییەکان بووە، کابرای (أعرابی) دەڵێ: خەڵکینە! حوشترەکەم لێ بزر بووە، دوو عام بۆ بکەن تا

بیدۆزمەوە، (عەمری کوڕی عوبەیدیش دەڵێ، ئەی خوا یە تۆ نەتویستوە ئەو حوشترە ون ببێت، بەڵام بە کەرەمی خۆت بۆی پەیدا بکەوە، کابراش دەڵێ جا نەیویستوەو ون بووە، ئێستا کێ دەڵێ ئەگەر بیشیەوێ دەیبینمەوە؟! (خوا نەیویستوە ون بێ بەڵام لێم ون بووە، ئێستا ئەگەر بیشیەوێ بیدۆزمەوە کێ دەڵێ دەیدۆزمەوە؟!).

لێرەدا (عەمری کوڕی عوبەید) دەمکوت دەبێ! دیارە کابرای دەشتەکیی بە فیطرەتو عەقڵە سادەکەی خۆی قسەی کردوەو ئەو قسە پووچو بێ‌جێیەی ئەوی هەڵوەشاندۆتەوە!

سبحانك اللّهم وبحمدك أشهد ألاّ اله الاّ أنت أستغفرك وأتوب اليك.



## نێـــــوەڕۆك

# ئەم کتێبە

لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ و فراوانە دەربارەی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی

گومانیش لەوەدا نییە کە ئیمان و عەقیدە لە ئیسلامدا وەک بناغە بۆ دیوار و

ڕەگ و ڕیشە بۆ درەخت وەهەوێن بۆ ماست وەهەناو بۆ ئینسان وایە !

بۆیە هەرکەسێک بیەوێ مسوڵمانێتی و دینداریەکی ڕاست و ڕەسەن

دەبێ لە ئیمان و عەقیدەوە و بنیاتنانی لە عەقڵ و دڵیدا دەست پێ بکات !

وە هەرگەل و میللەتێک بیەوێ ژیان و گوزەرانی خۆی بەپێی شەریعەتی

خوا پاکسازیی و چاکسازیی بکات و ڕێگای نەجاتی پێویستە لە ڕاستکردنەوەو

بژارکردن و چەسپاندنی ئیمان و عەقیدە دەست پێ بکات .

پێشم وایە ئەم کتێبە بە هەر شەش بەرگەکەیەوە هاوکارێکی باش و

جێی متمانە و پشت پێ بەستنە بۆ هەر تاک و کۆمەڵێک بیەوێ

دەست بە گۆڕانکاریی و پاکسازیی و چاکسازییە بکات .

عەلی باپیر





نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com

trizone ARCHITECTURE COVER.DESIGN

/TafseerOffice

7000 دینار